

حکومەتی هەرێمی کوردستان
وەزارەتی رۆشنبیری
بەڕێوەبەرێتی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوە
زنجیرە (٢)

## بنەما تیۆرییەکانی

# جوگرافیای عەسکەریی کوردستانی باشور

خەبات عەبدوڵڵا

حکومەتی هەرێمی کوردستان
وەزارەتی ڕۆشنبیری
بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوە
زنجیرەی (٢)



# بنەما تیۆرییەکانی
# جوگرافیای عەسکەریی کوردستانی باشور

2001

بنەما تیۆرییەکانی جوگرافیای عەسکەری کوردستانی باشور
خەبات عەبدوڵڵا
❖ پیتچنین: کۆمپیوتەری ئاگا
❖ دەرهێنانی هونەری: بارزان عارف
❖ بەرگ: هەڵگورد عەبدولوەهاب
❖ سەرپەرشتیاری چاپ   عطا محمود
❖ تیراژ: (٥٠٠) دانە
❖ چاپ: چاپی یەکەم / چاپخانەی تیشك / سلێمانی ٢٠٠١
❖ ژمارەی سپاردن(٣٢) ی وەزارەتی رۆشنبیری پێ دراوە

خەبات عەبدوڵڵا

# بنەما تیۆرییەکانی
# جوگرافیای عەسکەریی کوردستانی باشور

---

پێشکەشە بە:-

- دایکم
- هاوڕێم (شاسوار محەمەد مستەفا)ی جوانەمەرگ

# ناوەرۆك

## بەشی سێیەم: عێراق و تەوەرە ستراتیجییەكانی بەرگریكردن

## بەشی چوارەم: کوردستانی باشورو تەوەرە ستراتیجییەکانی بەرگریکردن

# پێڕستی نەخشەکان

# پێڕیستی خشتەکان



---

# بەرایی..

بۆ من، هەروەکو بۆ زۆر کەسانی تریش، سەرەتای نەوەدەکان و سەردەمی راپەڕین، سەرەتای گواستنەوەیەکی نەوعی بوو لەنێوان دوو دنیای جیاوازدا؛ دنیای چەند ساڵەی وتنەوەی وتارە شەرمن و ترساوەکانی سەر ئەو لاپەڕە بچوکانەی کەهەر پاش درکاندنیان لای هاوڕێیانی تەریقەت، وەکی کاغەزی چوکلێت چرچ و لۆچ دەکران و بەدزییەوە گڕییان تێ بەردەدرا. پاشان دنیای راپەڕین، ئەو دنیایەی کە وەکو سیماکانی خۆی دەبوا بەپەلە هەرچی نەوتراوە بوترێت، هەرچیش نەنوسراوە بنووسرێت.

نووسین بۆ من تەقاندنەوەی ئەو خەفە بوونە یەکبینەیەی پێش راپەڕین بوو کە خەریك بوو دەیخواردمەوە. هەر بۆیەشە بەهەمان شەرمی پێش راپەڕین، بەڵام بە تووڕەبوونێکی بێ سەودا دەستم دایە نووسین.

ساڵی ١٩٩٣بوو... وردە وردە لەپاڵ نووسینی وتار و لێکۆڵینەوە رۆژنامەوانییەکاندا، دەستم کرد بە نووسینی ئەم لێکۆڵینەوەیە. ئەگەرچی ئەم لێکۆڵینەوەیە زادەی راپەڕینە، بەڵام خەونێکی دێرینی پێش راپەڕینمە. ساڵی ١٩٩٤ لەیەکەم رەشنووسی بوومەوە، هەستم کرد کەلێنی گەورە گەورەی تێدایە جارێکی تر بەسەریدا چوومەوە هاوینی ١٩٩٥ پێش ئەوەی لەدەست شارەکەم هەڵبێم، رەشنووسی دووەمیم بەئەنجام گەیاند.

کە گەیشتمە خۆرئاوا، ماوەیەکی زۆری ویست تا کەمێك ئاسوودەیم چنگ کەوت، ترسی سانسۆری جەندرمەش نەوەك ریسەکەم لێبکەنەوە بەخوری، تا

درەنگانێك نووسینەكەم هەر لەناو ئەو زەرەفە نایلۆنە رەشەدا مایەوە كەپاش ماڵئاوایی كردنم، دایكم لەوناو جلەكانی خۆیدا بۆی پاراستبووم.

ساڵی ١٩٩٨ رەشنووسەكەمم بەهۆی هاورێیەكی دڵسۆزەوە كەوتەوە دەست. لەكاتی هێنانو گواستنەوەیدا چەند لاپەرەیەكی گرنگو ناوی چەند سەرچاوەیەك ون ببوون. كە كەوتمەوە بەسەرداچوونەوەی دیسانەوە هەستم كرد كەلێنی زۆری تێدا ماوە، بریارمدا بەیەكجارەكی واز لەنووسینەوەو چاپكردنی بهێنم. بەلام خەمی رۆژە تووشەكانی بەرچرا نووسینو سك هەلگوشینو دیق كردن بەدەست نەبوونی سەرچاوەو دانیشتنی بێ پەرِوای ناو كتێبخانە گشتییە ساردوو سرِەكەی سلێمانی، هەموو ئەوانە وایانكرد دلم نەیەت لێكۆلینەوەكەم بتاسێنم.

هەرچەندە بیرۆكەی بنەرەتی لێكۆڵینەوەكە تائێستاو بۆ داهاتوویەكی دووریش بیرۆكەیەكی زیندووە، بەلام دلنیام بەشێوەیەكی گشتی لێكۆلینەوەكە لەرووی ئەكادیمییەوە كەلێنی تێداماوە، گەردەستم بكردایەوە بەنووسینی شێوەیەكی تری دەبوو.

خۆزگە خوێنەر بەچاوی ئەو سالانەوە لێی وەردەگرتم كە لێكۆلینەوەكەی تێدا نووسراوە، دەشزانم ئەوە داواكارییەكی تەعجیزییە، بەلام هیچی تریشم پێ نەكرا.

**ئەلمانیا- هانۆڤەر**

**دیسەمبەری ١٩٩٩**

# پێشەکی

## یەکەم: چوارچێوەی تیۆریی بابەتەکە

ئەگەرچی جوگرافیا بەیەکێك لە کۆنترین زانینــەکانی مــرۆڤ دادەنرێــت، بــەڵام دارشتنی پایەکانی لــەچوارچێوەی زانسـتێکی سـەربەخۆدا تـانیوەی دووەمـی سـەدەی پێشوو سەرەتاکانی ئەم سەدەیە بەئەنجام نەگەیشت.

لەو سۆنگەیەی کە توخمە جوگرافییەکان پایەی سەرەکی هــێزی هــەر دەوڵـەتێك پێکدێنن، زانستی جوگرافیا توانی ببێتە ماکی سەرهەڵدانی ئەو تیۆرییانەی کە لەهێزی دەوڵەتو چۆنێتی پاراستنی قەوارە سیاسییەکان دەکۆڵنەوە، بۆیە پەرەسەندنی تیۆری دەوڵـەت، هـێزی دەوڵـەت، هـێزی نەتـەوەییو سـتراتیجی نەتـەوەیی، پێبـەپێی پەرەسەندنی زانستی جوگرافیا، ئەوانیش پەرەیان سەندو پەلوپۆیان هاویشت. هەر لێرەشەوە سروشتە جوگرافییەکانی هەر دەوڵەتو قەوارەیەکی سیاسی بوونە بناغەی هـەر لێکۆڵینەوەیـەکی سـتراتیجیو بـەو پێیـەش تیۆرییـەکانی جوگرافیـای سیاسـیو پاشانیش لەگەرمەی جەنگی جیـهانی یەکـەمدا تیـۆری جیۆپۆلـەتێکو ئینجـا چـەمکی ئاسایشی نەتەوەیی وەکو چەمکێکی سـەراپاگیر کەدیسـانەوە توخمـە جوگرافییـەکان رۆڵی سەرەکی لەدارشتنیدا وازی دەکەن، هاتنەکایە[1]

شان بەشانی پەرەسەندنی جوگرافیاو جوگرافیای سیاسی، جوگرافیـای عەسـکەری وەکو زانستێکی جەنگیو پێوەندار بەهەر لێکۆڵینەوەیەکی ستراتیجییەوە لەکۆتاییەکانی سەدەی پێشـووو سـەرەتای ئـەم سـەدەیەدا ئـەمیش پـەرەی سـەندو بـووە لقێـك لەلقەکانی جوگرافیای تەتبیقی. ئەو پەرەسەندنەش بەشێوەیەك بـوو ئێسـتاکە هیـچ دەوڵـەتێکی دنیـا، هیـچ سـوپایەك، هیـچ دەزگایـەکی سیاسـیو عەسـکەری خـاوەن دەسەڵات نابینرێت کە جوگرافیای عەسـکەری بەشـێکی پایـە سـتراتیجییەکانی پێـك نـەهێنێت. چونکـە هـەوڵدان بـۆ دارشـتنی سـتراتیجێکی نەتـەوەیی، سیاسـەتێکی نەتەوەیی، هەروەها هەڵسەنگاندنی ئامانجو نەخشە ستراتیجیو توانـا نەتەوەییـەکان

لەسەر ئاستە جیاجیاکـــان، بـێ پەنابردنەبـەر جوگرافیـای عەسـکەری بـەڕێوەناچێت. لەخەملاندنی توانای ستراتیجیدا جوگرافیای عەسکەری سوودی زۆری هەیە. بۆیە لەم رووەوە بەشداری لەبابەتی جیۆپۆلەتیکیشدا دەکات[٢]

لـــەبواری ســـتراتیجی نەتـــەوەییدا، کاروبـــارە عەســـکەریو دیبلۆماســـییەکان لەپێوەندییـەکی چڕوپـڕدا یـەکانگیر دەبـــن، لەمیانـــەی هـــەڵچونی بەرژەوەندییـــە نەتەوەییـــەکاندا جیاکردنـــەوە لـــەنێوان پێودانگـــە دیبلۆماســـییەکانو پێودانگـــە عەسکەرییەکان، کارێکی بێسودە. چونکە هەروەکو چـــۆن هـێزی عەسـکەریو هـێزی دیبلۆماسی دوو ئامرازی پێوەندارن بەسیاسـەتی نەتەوەییـەوەو نـاکرێت لەیـەکدی جوێ بکرێنـــەوە، ئاوەهـاش هـەر هـەوڵدانێک بـۆ جیاکردنـەوە لـەنێوان جوگرافیـای عەسکەریو جوگرافیای سیاسی، کارێکی دژوار دەبێت. جوگرافیای عەسکەری لەئاستە باڵاکانی جوگرافیای سیاسی نزیک دەبێتەوە، هەر بۆیەشە بەپلەی یەکەم دیپلۆمـاتو نەخشەدانەرانی سیاسەت لەدانانو شوێن پێ هەڵگرتنی ئامانجە نەتەوەییەکاندا، ئەم زانستە بەکار دەهێنن[٣]

بەشـێوەیەکی گشـتی، جوگرافیـای عەسـکەری زانسـتی پێکـەوە گرێدانـی نێـوان (دەوروبەرو دیـاردە جوگرافییـەکان)ە بـە (چالاکییـە عەسـکەرییەکان) -بەتایبـەتیش لەکاتی جەنگدا-، لەپێناوی بەدەست هێنانی ئامـــانجی پۆزەتیـڤ لەخزمـەتی ئامانجـە ستراتیجییەکانو گەیشتن بەســـەرکەوتندا. بەواتایـەکی تـر؛ جوگرافیـای عەسـکەری پراکتیزەکردنی زانینە جوگرافییەکانە لە بەڕێوەبردنی کاروبارە عەسکەرییەکاندا[٤]

## دووەم: گریمانەی لێکۆڵینەوەکە

بەڵام لێکۆڵینەوە لە جوگرافیای عەسکەری وڵاتێک کـــە هێشـتا دەوڵـەت نییـە، لـە گریمانەیەکی تیۆرییانە، لەمڕۆدا هیچ بەرئـــەنجامێکی پراکتیکـی نـابێت، کوردسـتان-وەکو هەمووی- هێشـــتا دەوڵـەت نییـە، بۆیـە هـەر لێکۆڵینەوەیـەک لـە جوگرافیـای عەسکەری کوردستان رووبەڕووی لێپرسینەوەو لێپێچینەوەی ئەکادیمیمان دەکاتـــەوە.. چۆن لەجوگرافیای عەسکەری وڵاتێـــک دەکۆڵرێتـەوە کـە سـنورەکەی، رووپێوەکـەی، پێکهاتەو ژمارەی دانیشتوانەکەی بەشێوەیەکی زاستی، زانراوو لەبەردەستدا نـەبێت؟ لەسەروو هەمووشیەوە، چۆن لەجوگرافیای عەسکەریی وڵاتێک دەکۆڵرێتەوە کەهێشتا

سوپای نییە؟ لەوانەش دژوارتر، چۆن لـەجوگرافیای عەسـکەریی تـەنیا بەشـیک یـان هەریمیک بێ لەهەریمەکانی تری ولاتیک دەکۆلریتەوە؟

کوردستانی باشور وەکـو هـەریمیکی سـەر بەکوردسـتان- هـەموو کوردسـتان-، بەهەمان شیوەی هەریمەکانی‌تر، بەشیک نییە لەدەولەتیکی نەتەوەیی یەکگرتوو، یان بۆ خۆی دەولـەتیکی سـەربەخۆ نییـە، لـەم سـەرەکەی تریشـەوەو دانیشـتوانەکەی، سامانەکەی. . . هتـد، لـە بەردەسـتدا نییـە. بۆیـە بـۆ لیکۆلینـەوە لـە جوگرافیـای عەسکەریی کوردستانی باشور ئەوەمان کردۆتە گریمانە کە کوردستانی باشور بێ لـە هەریمـەکانی تـری کوردسـتان، دەولـەتیکی سـەربەخۆیە، بـەو پییـەش مـەوقیعی دەولەتەکە، سنورەکەی، روپیوەکەی، جوگرافیاکەیمان بە بـەراورد لەگـەڵ دەولـەتی عیراقدا دەست نیشانکردووە لەو پیودانگەشەوە کە کوردستانی باشور لەسێ لاوە بە پارچەکانی تری خاکی کوردستان دەورە دراوەو، ئەو چوکلە بچوکەی نـەبیت کـە بـە خاکی عەرەبیی سوریاوە دەبیەستیتەوە، ئیتر باقی سـنورەکەی بەعیراقەوەیـە، بۆیـە لەدیاریکردنی گۆرەپانی جموجۆلی عەسکەریی کوردستانی باشورو دیاریکردنی تەوەرە ستراتیجییەکانی بەدەولەتە دراوسیکانیەوە، تەنیا عیراقمان کردۆتە نموونەی دەولەتی نـەیار.. لیرەشـەوە گۆرەپـانی جموجۆلـی عەسـکەری و تـەوەرە سـتراتیجییەکانی کوردستانی باشورمان بەعیراقەوە، بەگریمانە وەکو دوو دەولەتی هاوسێو هاوسنوری یەکدی، دەست نیشانکردووە.

## سییەم: لقە پیکهینەرەکانی لیکۆلینەوەکە

لیکۆلینەوەکە کە بە پیشەکی دەست پیدەکاتو بەکۆبەندو ئـەنجامگیری کۆتـایی دیت، پشت بەسـتوو بـەرییازیکی شـیتەلکارییانە نووسـراوە. بـۆ ئـەم مەبەسـتەش لیکۆلینەوەکە کراوە بەچوار بەشـەوەو هـەر بەشیکیشـی بـۆ چـەند فەسـلیکو هـەر فەسلیکی بۆ چەند لقیک دابەشکراوە.. بەم شیوەیە:

بەشی یەکەم: ئەم بەشە کەلەژیر سەردیری (جوگرافیاو دەولەت)دایە، بریتیە لـە دوو فەسـڵ؛ فەسـلی یەکـەم لـەهیزی دەولـەت دەکۆلیتـەوە لەروانگـــەی زانســتی جوگرافیـاوە. بـۆ ئـەو مەبەسـتەش سـەرەتا دەربـارەی زانسـتی جوگرافیـا، ئینجـــا تیۆرییـەکانی شـیکردنەوەی دەولـەتو هـیزی دەولـەت، پاشـانیش چـەمکی هـــیزو هەلسەنگاندنی هیزی دەولەت، شیکردنەوە کراوە. لەفەسلی دووەمیشـدا لەمیانـەی

بنەما گشتییەکان‌و لقە پێکهێنەرەکانی جوگرافیای عەسکەرییەوە لەسەرەتا تیۆرییەکانی جوگرافیای عەسکەری، کۆڵراوەتەوە.

بەشی دووەم: ئەم بەشە تایبەتە بەجوگرافیای سروشتیی کوردستانی باشور، شەش فەسلی بەم شێوەیە لەخۆگرتووە؛ فەسلی یەکەم کە تایبەتە بەسنوری کوردستانی باشور بەشێوەیەکی هەمەلایەنەو بەگەرانەوە بۆ مێژوو و بنەچەی زاراوەی کوردستان‌و دەستنیشانکردنی ئەو هەریمەی کەئێمە مەبەستمانەو لەم لێکۆڵینەوەیەدا بە کوردستانی باشور ناوزەدمان کردووە، و پێشینە مێژووییەکانی لکاندنی بەعیراقەوەو ئینجا هێلی سنورمان دەستنیشانکردووەو ئەنجامەکانی ئەم فەسلەمان لەدیاریکردنی سنوری کوردستانی باشور کردۆتە بنچینە بۆ سەرجەم فەسڵ‌و بەشەکانی تری لێکۆڵینەوەکە. فەسلی دووەمیش لەپەرەسەندنی جیۆلۆجی‌و شێوەی خاکی کوردستانی باشور دەکۆڵیتەوەو، لە فەسلی سێیەمدا جیۆمۆرفۆلۆجیای کوردستانی باشورمان بۆ هەر دوو هەریمی شاخاوی‌و نیمچە شاخاوی، دابەشکردووەو لەهەریەکە لەدوو هەریمەکەمان کۆڵیوەتەوە. فەسلی چوارەم تایبەتە بە کەشوهەوای کوردستانی باشورو لەمیانەی کارتێکەرە گشتییەکانی کەشرهەواو مەوداکانی گەرماو بارانی کوردستانی باشورەوە لقەکانی فەسلەکەمان دارشتووە. لەفەسلی پێنجەمیشدا لەرووەکی خۆرسک دواوین‌و کوردستانی باشورمان بەپێی هەریمەکانی رووەکە خۆرسکەکان بۆ هەرسێ هەریمی دارستانە شاخاوییەکان‌و هەریمی ئستیبس‌و هەریمی گوێ چۆم‌و رووبارەکان دابەشکردووە. دواجار لەفەسلی شەشەمی بەشی دووەمدا هەر لەمیانەی تاووتوێکردنی جوگرافیای سروشتیی کوردستانی باشوردا، سەرچاوەکانی ئاوی هەریمەکەمان کردۆتە بابەت‌و لە هەرچوار بەشە پێکهێنەرەکەی ئەو سەرچاوەیە، بەفروباران، ئاوی ژێر زەوی، رووبارو چۆمەکان، عەماراوو بەنداوەکان، دواوین.

بەشی سێیەم: ئەم بەشە کەبەناونیشانی لعیراق‌و تەوەرە ستراتیجییەکانی بەرگریکردن‌اە، لەدوو فەسڵ پێکهاتووە؛ فەسلی یەکەمیان تایبەتە بەعیراق‌و تەوەرە ستراتیجییەکانی بەرگریکردن لەسەر بنچینەی مەترسییەکانی دەرەوە. لەم فەسلەدا بەپێی سەرچاوەی کۆلیژە عەسکەرییەکانی عیراق خۆیان، ئەو بەشەی تەوەرە ستراتیجییەکانی عیراقمان بە دەولەتە دراوسێکانیەوە خستۆتەروو کە بەخاکی

کوردستانی باشوردا رەت دەبن‌و دەکەونە نێوان عێراق‌و هەریەکە لەتورکیاو بەشی هەرە زۆری ئێران‌و بەشێکی سوریاوەو، بەوپێیەش کوردستانی باشور دەکەنە گۆڕەپانی جموجوڵی عەسکەریی نێوانیان لەم فەسڵەدا نیازمان هەبووە گرنگی کوردستانی باشور لەئاراستەکردنی ئەو تەوەرانە بەنیسبەت عێراقەوە بخەینەڕوو.

سەرەڕای ئەو تەوەرانەی کە عێراق بۆ پاراستنی خۆی دژ بەمەترسییەکانی دەرەوە دایڕشتون، لەسەر بنچینەی مەترسییەکانی ناوەوەش کە مەترسی کوردە، عێراق لەمیانەی رستێک کارکردەوە کۆمەڵێک تەوەرەی بۆ خۆی داڕشتووە. فەسڵی دووەم بەدوورو درێژی لەمیانەی لێکۆڵینەوە لەمێژووی لکاندنی کوردستانی باشور بەعێراقەوەو واقعی بە کۆلۆنیکردنی‌و رەفتارە کۆلۆنیالیستییەکانی عێراق لە کوردستاندا، جۆری ئەو تەوەرە ناوخۆییانەو ئەنجامی کارکردەکانی خراونەتەڕوو.

بەشی چوارەم: ئەم بەشەش دوا بەشی لێکۆڵینەوەکەیەو وەکو تەواوکەری هەموو بەشەکانی ترو هەوێنی هەر لێکۆڵینەوەیەکی ستراتیجی تایبەت بەکوردستانی باشور لەمرۆدا، دەربارەی تەوەرە ستراتیجییەکانی بەرگریکردنی کوردستانی باشورە دژ بەعێراق.

سەرەتا لەفەسڵی یەکەمداو وەکو رێگا خۆشکردن بۆ داڕشتنی تەوەرەکانی جموجوڵی عەسکەریی نێوان کوردستانی باشورو عێراق، لە فاکتەرەکانی جموجوڵ‌و رێگاوبانەکانی کوردستانی باشور دواوین. بۆ ئەو مەبەستەش لەهۆکارە کارتێکەرەکانی رێگاوبان‌و رێگاوبانەکانی کوردستانی باشورمان کۆڵیوەتەوەو بڕو رادەی تۆڕی رێگاوبانەکانی کوردستان‌و عێراقمان شیکردۆتەوەو هەر لەوێشدا هێندێک سپاردەمان سەبارەت بەئایندەی تۆڕی رێگاوبان لە کوردستانی باشوردا خستۆتەڕوو.

لەفەسڵی دووەمدا لە تەوەرە ستراتیجییەکانی بەرگریکردنی کوردستانی باشور وەکو هەموو هەرێمەکە دواوین. بۆ ئەو مەبەستەش لەپێشدا گۆڕەپانی جموجوڵی عەسکەریی نێوان هەردوولامان دەستنیشانکردووە، ئینجا گۆڕەپانەکەمان کردۆتە سێ هەرێمی عەسکەریی ڕووبەڕووبوونەوە کە هەریەک لەو هەرێمانە لەڕووی جوگرافیاوە چەند خەسڵەتێکی تایبەتی خۆی هەیەو هەر هەرێمکیشیان چەند تەوەرەیەک‌و چەند ئامانجێکی ستراتیجی جیا لەهەرێمەکانی تری تێدەکەوێت. پاشان دواجار تەوەرەکانی

جموجۆڵی عەسکەریی نێوان کوردستانی باشورو عێراقمان بۆ هەرسێ هەرێمەکە بەشێوەیەکی هەمەلایەنە دارشتووە.

فەسڵی سێیەمیش کە دوا فەسڵی بەشەکەو هەموو لێکۆڵینەوەکەشە، تەرخانکراوە بۆ هەڵسەنگاندنێکی جوگرافیی عەسکەرییانەی هەرێمی رزگارکراوی کوردستان. سەرەتا دەربارەی سنورو پێکهاتنی هەرێمەکە، ئینجا تەوەرەکانی جموجۆڵی عەسکەریی هەرێمەکەو عێراق، پاشان مەوقیعو پێکهاتەی سلێمانی لەرووی توخمە جیۆسیاسییەکانەوە، دواجاریش لەسەرچاوەکانی هێزی هەرێمی رزگارکراوی کوردستان کۆڵراوەتەوە شایانی وتنە، بۆ هەر یەکێک لەبەشەکانی لێکۆڵینەوەکە جگە لەبەشی یەکەمو، بۆ هەر یەکێک لەفەسڵەکان جگە لە فەسڵی یەکەمی بەشی سێیەم، نەخشەی پێویست خراونەتەرِوو سەرەرِای چەندین خشتە ئینجا لە کۆتایی لێکۆڵینەوەکەدا دووپاشکۆ؛ یەکەمیان روپێوی کوردستانی باشور بەبەراورد لەگەڵ روپێوی ئەو وڵاتانەی جیهان کەلە خۆی بچوکترن، ریزبەند کراون.

## چوارەم: کۆسپەکان . . . کەلێنەکان

ئاشکراو روونە کە ئەنجامدانی کاری لەمجۆرە لەهەلومەرجێکی ئابوریو سیاسی سەختی وەکو ئەوەی وڵاتەکەی ئێمەو، بۆ کەسێک کە لەبنەرِەتەوە وەکو ئارەزوومەند نەک وەکو قوتابی زانکۆ، بەپلەی یەکەم بۆ خزمەتکردنی گەلی رەنجدەر نەک بۆ بەدەستهێنانی بروانامەو تەرقیەی زانستی، بێگومان گەلێک کۆسپ دێنە رێیو هەر بەوپێیەش گەلێک کەلێنو کەمەکورِی دەکەونە کارەکەیەوە. راستییەکەی کارێکی لەمجۆرە پێش هەر کەسێک لە ئەستۆی ئەو ئەفسەرو دەرەجەدارە کوردانەی ناو سوپادا بووە، کە بەدرێژایی مێژووی دامەزراندنی دەوڵەتو سوپای داگیرکەری عێراق، خزمەتی سوپای ناوبراویان کردووەو وەکی تریش هیچ بەرهەمێکی نووسراویان بۆ میللەتەکەیان بەئەنجام نەگەیاندووە.

دەکرێت گرنگترین ئەو کۆسپو کەلێنانەی کەوتنە ئەم لێکۆڵینەوەیەوە بەم شێوەیە خاڵبەندیان بکەین:

١-نەبوونی زانیاری وردو زانستی سەبارەت بە توانا مرۆییو ئابورییەکانی کوردستانی باشورو کەموکورِی لە هێندێکی تریانداو، پاشان نەبوونی ئامارو ئەژماری

پێویست لەسەر ڕێگەوبانەکانی کوردستانی باشورو نەبوونی پێماڵ (مسح)ێکی سەرتاسەریی تۆڕی ڕێگەوبانەکانی کوردستانی باشور.

٢-نەبوونی ئەتڵەسێکی نەتەوەیی کەلێیەوە رادەو بڕی توانا جوگرافییەکانی لی وەدەست بخرێتو، نەخشە جیاجیاکانی لێوە وێنە بکێشرێن. هەر بۆیەشە بەناچاری لەکێشانی نەخشەکاندا پەنابرایە بەر ئەو ئەتڵەسە عێراقیانەی کە کوردستانی باشوریان تێکەڵ لەگەڵ هەرێمەکانی عێراقو، وەکو بەشێکی جیانەکراوە لەخاکی عێراق چەسپاندووە.

٣-دیسانەوە نەبوونی سەرچاوەی ئەکادیمیو زانستی سەبارەت بەجوگرافیای کوردستان بەشێوەیەکی گشتیو، جوگرافیای کوردستانی باشور بەشێوەیەکی تایبەتی، ناچاری کردین پەنا ببەینە بەر ئەو سەرچاوە عێراقیو عەرەبانەی کە لە جوگرافیای عێراقیان کۆڵیوەتەوەو، لەوێوەڕا هەوڵ بدەین توخمەکانی جوگرافیای کوردستانی باشور هەڵبهێنجێنین. هەرئەم هۆیەش بوو وایکرد، کە زۆربەی هەرەزۆری زانیارییەکانی بەشی دووەم کە تایبەتە بە جوگرافیای سروشتیی کوردستانی باشور بچنە خانەی (ئامادەکردن)ەوەو گوزارە لەڕاوبۆچوونی ئەو سەرچاوانە بکەن.

٤-لەکێشانی نەخشەکاندا، ئەگەرچی هەوڵی زۆردراوە پێوانەکانیان دەستنیشانو جێگربکرێن، بەلام بەهۆی نەبوونی کەرەستەی پێشکەوتووی چاپو، بەهۆی فۆتۆکۆپیی کردنی چەند بارەیانەوە، پێوانەکان کەم تازۆر لەو ریتمە باوەی کە (١سم) دەکاتە یەکەی پێوانە، توشی چوونەوەیەکو کشان هاتن.

٥-ئەگەرچی جوگرافیای عەسکەری بەهۆی گرنگیدانی بێ ئەندازەی بەسیستمی ڕێگەوبان، هێندێ جاران بە جوگرافیای ڕێگەوبانو گواستنەوەی وەسف دەکرێت، بەلام جوگرافیای عەسکەری لەمیانەی کۆڵینکارییەکەی خۆیدا لایەنە ئابوریو سیاسیو تواناو پێکهاتە مرۆییو کۆمەڵایەتییەکان پشت گوێ ناخاتو، لەهەڵسەنگاندنی هەر هەرێمێکدا لێکۆڵینەوەی وردو هەمەلایەنە ساز دەدات. لەهەمان سۆنگەی کۆسپەکانی خاڵەکانی پێشووەوە، لێکۆڵینەوەکەی ئێمە جگە لەباسکردنی توخمە سروشتییەکانی جوگرافیای کوردستانی باشورو تۆڕەکانی ڕێگەوبان، ئیتر نەکرا ئەو لایەنانە بووە شێوە سەراپاییەکەی بگرێتەخۆو پێماڵی توانا نەتەوەییەکانی هەرێمەکە بکات. لەوسەرەکەی تریشەوەو هەروەکو دواجار لەئامانجەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیەشدا

دەیخەینەڕوو، ئێمە ئەوەندەی مەبەستمان وەسفکردنی گۆڕەپانی جموجۆڵی عەسکەریی کوردستانی باشورو عێراق بووە لەڕووی خاکەوە، ئەوەندە مەبەستمان نییە ستراتیجی نەتەوەیی بۆ پارچەیەک لەپارچەکانی کوردستان، بەدابڕین لەپارچەکانی تر دابڕێژین.

٦-لەکۆتاییدا یەکێک لە کۆسپە سەرەکیو گەورەکانی تری ئەم لێکۆڵینەوەیە کەمی سەرچاوەی جوگرافیای عەسکەریی بوو بەشێوەیەکی گشتیو دەگمەنی سەرچاوەی تازەبوو بەشێوەیەکی تایبەتی.

بەشی هەرەزۆری ئەو سەرچاوانە- کە پاشتر دەیانخەینەڕوو- ساڵانێکی زوو بەچاپ گەیاندراوون، کە دیارە پێبەپێی بەرەو پێشەوەچوونی تۆڕەکانی ڕێگەوبانو توانا عەسکەرییەکانی سوپای سەردەمو تەکنەلۆجیای هاوچەرخ، هێندێ لەو چەمکانە کۆن بوونەو پێویستییان بەپێداچوونەوە هەیە.. ئەمە لەلایەکو، لەلایەکیترەوە ئەو سەرچاوانە کەلە بنەڕەتدا ئەفسەرە عێراقییەکان نووسیویانە، لەدیدێکی پان-عەرەبییانەوە نووسراونو کوردستانی باشور وەکو بەشێک لەگۆڕەپانی جموجۆڵی عەسکەریی عێراق حسابی بۆکراوە.

شایانی وتنیشە تا ڕۆژی ئەمڕۆ هەموو سەرچاوە عێراقییەکانی جوگرافیای عەسکەرییو لەنێو ئەوانەشدا ئەو سەرچاوانەش کە کۆلێژە عەسکەرییەکانی عێراق کردوویاننەتە بنەمای خوێندن، لەڕووی ئەکادیمییەوە کەموکوڕی زۆریان هەیەو ناکرێت وەکو سەرچاوەیەکی ئەکادیمیو زانستی کە بەپێی مەرجە ئەکادیمییەکان نووسرابن، حسابیان بۆ بکرێت.

## پێنجەم: سەرچاوەکانی لێکۆڵینەوەکە

ئەو سەرچاوانەی کە بۆ نووسینی ئەم لێکۆڵینەوەیە سودیان لێوەرگیراوە، گەلێکن. سەرچاوەکان جۆراوجۆرن؛ جوگرافی، مێژوویی، سیاسی، ئابوری.... هتد. بەڵام ئەوانەی ڕاستەوخۆ پێوەندییان بە باسەکەوە هەیەو لەچەند شوێندا دووبارە بوونەتەوە، ئەم سەرچاوانەی لای خوارەوەن:

١-الجغرافیة السیاسیة- أسس و تطبیقات، تألیف الدکتور محمد أزهر سعید السماک: کەلەحوزەیرانی ١٩٨٨ لەلایەن وەزارەتی خوێندنی باڵای عێراقەوە وەکو ماددەیەکی مەنهەجیی بۆ خوێندنی جوگرافیا پەسەندکراوە. دەکرێت بە گەورەترین

سەرچاوەی جوگرافیای سیاسی لەعێراقدا دابنرێت کە بەشێوەیەکی هەمەلایەنە باسی لە بنەما تیۆرییەکانی جوگرافیا بەشێوەیەکی گشتیو جوگرافیای سیاسی بەشێوەیەکی تایبەت کردووە.

٢-العراق الشمالی، تألیف الدکتور شاکر خصباک: کە لەساڵی ١٩٧٣ لەبەغدا چاپکراوە یەکێکە لەسەرچاوە بەبڕشتەکانی لێکۆڵینەوەی جوگرافیای سروشتیی کوردستانی باشور، دەشێت بۆ دانانی مەنهەجی جوگرافیا لەقوتابخانەکانی کوردستاندا سوودی گەورەی لی وەربگیرێت.

٣- محاضرات فی جغرافیة العراق الطبیعیة والاقتصادیة والبشریة، تالیف الدکتور جاسم محمد الخلف: ئەگەرچی سەرچاوەیەکی کۆنەو بۆ یەکەمجار لەساڵی ١٩٦١دا چاپو بلاوکراوەتەوە، بەلام ژمارەیەکی زۆر نەخشەی دەربارەی بەشە جیاجیاکانی جوگرافیای کوردستانی باشورو عێراق تێدایە کە تائەمڕۆش گرنگی خۆیان ون نەکردووە.

٤- ئەمنی ستراتیجی عێراقو سێ کوچکەی بەعسییان: تەرحیل، تەعریب، تەبعیس. نووسینی: چیا؛ سەرچاوەیەکی جدی لێکۆڵینەوەی ستراتیجییە، تێیدا بەشێوەی تاڕادەیەکی زۆر ئاکادیمی لەمیانەی چەندین نەخشەو خشتەدا لەلایەنە سیاسی عەسکەرییەکانی ئاسایشی ستراتیجی عێراق لەدیدی بەعسەوە کۆڵراوەتەوە.

٥- جغرافیة العراق العسکریة، تالیف العقید الرکن سلمان الدرکزلی، کەلەساڵی ١٩٥٦ لەبەغدا دەرچووەو پاشا ن بووەتە بنەما بۆ سەرچاوە عێراقییەکانی پاش خۆی تێیدا لەتەوەرە ستراتیجییەکانی عێراق لەگەڵ هەریەک لەدەوڵەتانی دراوسێ کۆڵراوەتەوە.

٦- جغرافیة العسکریة، تالیف: المقدم الرکن محمد حسن شلاش، ساڵی ١٩٦٩ لەبەغدا چاپکراوە،لەبەشێکی زۆریدا دووبارەبوونەوەی کتێبەکەی سەلمان دەرەکەزلییە.

٧- الجغرافیة العسکریة، تالیف (بلا): کەلەتەموزی ١٩٥٧ لەلایەن کۆلیژی عەسکەریی عێراقەوە لەبەغداوە دەرچووە.لەهەموو سەرچاوە عێراقییەکانی پێشو پاش خۆی فراوانترە، بەشێکی تایبەتە بەجوگرافیای عەسکەریی فەلەستین.

٨-الجغرافية العسكرية، تاليف (بلا): لەئابی ١٩٨٤ لەلایەن (دائره الشؤون الاداریە)ی كۆلیژی عەسكەری لەبەغدا دەرچووەو بەشێكە لەهەمان كتێبی پێشوو.

٩- الجغرافیة العسكرية، تاليف لويس.س. پيتليرو جی. ايزل پيرس، ترجمە: الدكتور عبدالرزاق حسن: كە بە زمانی ئینگلیزی لەنیویۆرك چاپكراوەو پاشان لەساڵی ١٩٧٥دا لە بەغدا بەعەرەبی چاپكراوەتەوە. ئەم كتێبە بەدوورودرێژی لەبنەما گشتییەكانی جوگرافیای عەسكەری دەدوێت.

## شەشەم: گرنگیو ئامانجەكانی لێكۆڵینەوەكە

دەتوانین گرنگترین ئامانجەكانی ئەم لێكۆڵینەوەیە لەچوار خاڵدا بخەینەڕوو، بەم شێوەیە:

١- كورد لەبواری هەوڵدان بۆ لێكۆڵینەوەی زانستیو ئەكادیمی، بەهەمان شێوەی بوارەكانی تری ژیان، گەلێكی كلۆڵە. بۆیە هەر هەنگاوێك لەم بوارەدا بۆ ئەنجام گەیاندنی لێكۆڵینەوەی ئاكادیمی بەشێوەیەكی گشتیو لەنێوان ئەوانەشدا لێكۆڵینەوە ستراتیجییەكان، گرنگییەكی گەورەی دەبێت. لێكۆڵینەوەكەی ئێمەش هەوڵی داوە كەم تازۆر بەو ئاقارەدا هەنگاوبنێتو گەرچی هەموو ئامانجەكانی خۆشی نەپێكاوە، ئەوا یەكەمین لێكۆڵینەوەیە كە لەبواری عەسكەریدا بەگشتیو، دەربارەی جوگرافیای عەسكەری بەزمانی كوردی نووسرابێت.

٢-هەرچەندە بەپێی ئەو گریمانەیەی كەكراوەتە بنەمای لێكۆڵینەوەكەو پێ بەپێی ئەو كوردستانی باشور جیا لەهەرێمەكانی تری كوردستان، وەكو هەرێمێكی سەربەخۆ حسابی بۆ كراوەو ، گۆڕەپانی جموجۆڵی عەسكەریو تەوەرە ستراتیجییەكانی بەدەوڵەتی عێراقەوە دەستنیشانكراوە، بەڵام گرنگی ئەم لێكۆڵینەوەیە لەوەدایە كە گۆڕەپانی نێوان هەردوولا، كوردستانی باشورو عێراق، هەمان گۆڕەپانی جموجۆڵی عەسكەری دەبێت لەنێوان دەوڵەتی ئایندەی كوردستان- هەموو كوردستان-و عێراقدا.

لەڕووی مێژووییەوە، سنوری ئایندەی هەر دەوڵەتێكی كوردی بەعێراقەوە هەمان ئەو سنورە دەبێت كەبەپێی گریمانەی ئەم لێكۆڵینەوەیەو لەچوارچێوەی دیاریكردنی سنوری كوردستانی باشور بەعێراقەوە، دەستنیشانكراوە. گۆڕەپانی جموجۆڵی عەسكەریو تەوەرە ستراتیجییەكانی نێوان دەوڵەتی ئایندەی كوردستانو عێراق،

لەبەشی هەرەزۆریدا هەمان گۆڕپان و تەوەرەکان هەمان تەوەرەکانی نێوان کوردستانی باشورو عێراقن. بۆیە ناسینی توخمەکانی گۆڕەپانەکە لەباری یەکەمداو وەکو ئەوەی بەپێی گریمانەی لێکۆڵینەوەکە کاری بۆ کراوە، بەشێوەیەکی گشتی بۆ داهاتووی کوردستان هەمان کارایی دەبێت و، لێرەشەوە یەکێک لەئامانجەکانی تری لێکۆڵینەوەکە ئەوەیە کە لەدارشتنی تەوەرە ستراتیجییەکانی دەوڵەتی ئایندەی کوردستان بەعێراقەوە، بەشێکی زۆری ئەنجامەکانی لێکۆڵینەوەکەی ئێستا دەکرێنەوە بە بنەما.

٣-لێکۆڵینەوە لەجوگرافیای عەسکەریی هەر دەوڵەت و هەرێمێک، زانینی توخمە سروشتییەکان و جوگرافیای سروشتیی دەوڵەت یان هەرێمەکەی گەرەکە. دارشتنی سەرەتا تیۆرییەکانی جوگرافیای سروشتی کوردستانی باشور وەکو ئەوەی لەم لێکۆڵینەوەیەدا کراوە، یەکێکیترە لەئامانجەکانی لێکۆڵینەوەکە. لەو پێناوەشدا چەندین ژمارەو خشتەو نەخشە، بەمەبەستی ناسینی توخمە سروشتییەکانی کوردستانی باشور بۆ یەکەمین جار خراونەتەروو، کە دەکرێ ئەو بەشە؛ واتە جوگرافیای سروشتیی کوردستانی باشور، جیا لەبەشەکانی تر بەسەرەتایەک دابنرێت بۆ خوێندن و لێکۆڵینەوەی جوگرافیای کوردستانی باشور.

٤- لەسۆنگەی تەوەرە ستراتیجییەکانەوەو دوا ئامانجی لێکۆڵینەوەکە، ئاشکرا کردنی خاڵە لاوازو بەهێزەکانی ئاسایشی کوردستانی باشورە (وەکو هەموو رووبەرەکە) لەپێوەدانگە عەسکەری و ستراتیجییەکانەوە، لەکاتەکانی شەڕو ئاشتیدا بەبەراورد لەگەڵ دەوڵەتی عێراقدا. بۆ ئەم مەبەستەش یەکەمجار رووبەری کوردستانی باشور وەکو ئەوەی کە هەیەو لەم لێکۆڵینەوەیەدا چوارچێوەی بۆ دارێژراوە، کراوەتە بنەمای ئەو بەراوردەو هەر لەوێوە لەسەرچاوەکانی هێزی هەرێمەکە، کۆڵراوەتەوە پاشان بەشێوەیەکی کورت بەشە رزگارکراوەکەی کوردستانی باشور کراوەتە نمونەی ئەو بەراوردە.

**کوردستان- سلێمانی**

**هاوینی١٩٩٥**

# پەراوێزەکان

[1] فريمان، ت.و، الجغرافيا في مائة عام، ترجمة: د. عبدالعزيز طريح شريف، دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد. هەروەها: السماك، الدكتور محمد ازهر سعيد، الجغرافية السياسية- اسس وتطبيقات، وزارة التعليم العالي والبحث العلمي، مديرية دار الكتب للطباعة والنشر- جامعة الموصل،١٩٨٨

[2] پيلتير، لويس. س و پيرس، جي. ايزل، الجغرافية العسكرية، ترجمة: الدكتور عبدالرزاق عباس حسين، بغداد،١٩٧٥

جامعة الموصل، ١٩٨٨

[3] پيلتير، لويس. س و پيرس، جى. ايزل، هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[4] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

## فەسلی یەکەم

# هێزی دەوڵەت لەڕوانگەی جوگرافیاوە

### (١-١-١): دەربارەی زانستی جوگرافیا

جوگرافیا یەکێکە لە کۆنترین لقەکانی مەعریفە کە هەر لەدێر زەمانەوە خەڵك بە حوکمی هەوڵدانی یەکبینەیان بۆ زانیاری زۆرترو دۆزینەوەی جێگەی تر، جیا لەشوێنی باوی ژیانیان، سەرەتاکانی ئەم زانستەیان، لەلا گەڵاڵە بووە. مێژوونووسان پێیان وایە لانی کەم لە سەردەمی هێرۆدۆتەوە، پێشکنەرانو داگیرکەران تێبینییەکانی خۆیان بەمەبەستی خزمەتکردنی حکومەتەکانیانو خوێنەران بەشێوەیەکی گشتی، تۆمارکردووە[١]

(جوگرافیا Geography وشەیەکی یۆنانی لاتینییە، ئەم وشەیە لە دوو بڕگە پێکهاتووە؛Geo بەمانای زەویو graphia وەسف دەگەیەنێت، واتە وەسفی زەوی. لێکۆڵینەوە جوگرافییەکان گرنگی بە لێکۆڵینەوەی دیاردە گەردوونیو فەلەکییە جیاجیاکان، لەنێو ئەوانەشدا زەویو کۆمەڵەی خۆرو هێڵەکانی درێژیو بازنەکانی پانیو شوێنی ئەستێرەکانو هی تر، دەدەن.

کتێبی جوگرافیای بەتلیمۆس (٩٠-١٦٨ز)و، کتێبی جوگرافیای ئەسترابۆ (٦٠پ.ز، ٢١ز) ئەوە دەسەلمێنن کە یۆنانییەکان کەلەپورێکی جوگرافیی گرنگیان جێهێشتووە.[٢]).

جوگرافیای نوێ بە کاریگەریی سێ هۆکار سەری هەڵدا، ئەوانیش: دۆزینەوە جوگرافییەکانو، بڵاوبوونەوەی فەلسەفەی زانستیو، سەرهەڵدانی تیۆری پەرەسەندنی داروین بوو.

سەرەڕای دۆزینەوە ناوخۆکانی هەردوو کیشوەری ئاسیاو ئەفریقا، دۆزینەوەی هەردوو ئەمریکاو کیشوەری ئوستralیا، ئاسۆکانی لێکۆڵینەوەی جوگرافیایان پەرەپێدا. بڵاوبوونەوەی فەلسەفەی زانستیش وایکرد کە جوگرافیا لە جوغزی زانیاریو راستیە وەسفییەکان دەربچێتو ببێتە زانستێك کە پێڕەوی شیکارکردنی زانستیانە بکات. سەرهەڵدانی تیۆری پەرەسەندنی داروینیش لەبواری بایۆلۆجیدا، خاڵی دەسپێکی سەرهەڵدانی جوگرافیای زانستی بوو. کتێبی (رەچەڵەکی جۆرەکان)ی لەبواری زانستیدا، بەرپاکرد. داروین هێمای بۆ کارلێکردنی نێوان بوونەوەرە زیندووەکان- لەنێویشیاندا مرۆڤو ژینگەی نیشتەجێبوونی ئەو بوونەوەرانە، کردبوو[٣]

ئەم صەد ساڵەی دوایی، پەرەسەندێکی بێوێنەی زانستی جوگرافیا بوو. ئەویش بەهۆی پێماڵکردنی هەموو جیهان لەرێی بازرگانیو داگیرکاریو دۆزینەوەی جێگەی ترو پێشکەوتنو داهێنانی پاپۆڕو هێڵەکانی ئاسنو، پاشانیش فڕۆکە.

بۆیە بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێین کە جوگرافیای نوێ لەنیوەی سەدەی نۆزدەو سەرەتای سەدەی بیستدا، سەری هەڵدا.

جوگرافیای نوێ تەنیا لەبواری وەسفکردنی زەویو دیاردەکانی تردا نەوەستایەوە، بەڵکو چەندین لقو چەندین پۆلی جیاجیای لێبۆوە. بەڵام سەرەڕای گشت ئەو چەمکە جیاجیایانەی جوگرافیای نوێ، هەموویان لەوەدا یەکدەگرنەوە کە گۆی زەوی مەیدانی لێکۆڵینەوەی، هەر یەکێکیانە.کەوابێت (جوگرافیا زانستی پێوەندییەکانی شوێنە تا ئەو جێگەی لەخزمەتی مرۆڤدایە[٤]). بەوپێیە جوگرافیا مانای لێکۆڵینەوەی زەوییە لەو سۆنگەیەی کە بۆ مرۆڤە. واتە تێڕوانینی جوگرافیا تێڕوانینی شوێنە بەهەموو پێوەندییە سروشتیو مرۆییەکانەوە. بەواتایەکیتر، جوگرافیا دیاریکردنی وێنەی چاوەڕانکراوو ئایندەی کارلێکی سروشتو مرۆڤە لەمیانەی ئەو وێنەیەی ئێستایەوە.

جوگرافیا لەدوو لقی سەرەکی پێکدێت؛ ئەوانیش جوگرافیای سروشتیو جوگرافیای مرۆییە.

هەرچی جوگرافیای سروشتییە گرنگی بەلێکۆڵینەوەی دیاردە سروشتییە جیاجیاکان دەداتو، لقەکانی تری وەکو جوگرافیای مۆرفۆلۆجیو کەشوهەواو

بـــایۆلۆجیو دەریـــاو زەریاکـــانو جوگرافیـــای خـــاكو رووەكو کانـــەکانی لێدەبێتەوەو ئەمانیش هەریەکەیان دەبن بەچەند لقێکی ترەوە بەڵام جوگرافیای مرۆیی ئەو لێکۆڵینەوانە لە خۆدەگرێت کە گرنگی بەدیاردە مرۆییەکان دەداتو چـەند لقێکـی وەکـو جوگرافیـــای پیشەســـازیو کشـــتوکاڵیو گواســـتنەوەو شارســـتانیو جوگرافیـــای سیاســـیو کۆمەڵایـــەتیو هـــی تـــری لێدەبێتـــەوەو، هەریەکێك لەم لقانەش بۆ چەند لقێکی تر دابەش دەبن.

جوگرافیـا چـەند خەسـڵەتێکی تایبـەتی هەیـە کـە لەزانســـتەکانی تـــری جیادەکاتەوە، ئەو خەسڵەتانەش بریتین لە:-

١-کەسـایەتی جـوت لایەنـەی زانسـتی جوگرافیـا.. بـەو پێیـەی گرنگـی بەلێکۆڵینـەوەی سـەرجەم دیـاردە سروشـتییەکان پێکـەوە گـرێ دەداتو، لـەو سەرەکەی تریشەوە زانسـتە مرۆییـەکان. ئـەم خەسـڵەتەش جوگرافیـا لـەباقی زانستەکانی تر جیادەکانەوە.

٢-لێکۆڵینـەوەی هـەرێمگیریی.... هـەرێم روپێوێکـە لـەخاك، رووبەرەکـەی هەرچەندێك بێت بەپێی پێودانگێکی دیاریکراو روکەشە سروشتییەکەی بەرەو وێکچون دەچێت. جوگرافیا هەوڵ دەدات جیهان بۆ چەند هـەرێمێکی جیـاواز دابەش بکات کە دەشێت لەسەر ئاستی کیشوەرەکان یا دەوڵەتـەکان یـا ئـەو هەرێمانە بێت کەدەتوانرێت بەسنوری سروشتی مرۆیی دەستنیشان بکرێت. واتە جوگرافیا لە کۆڵینکارییەکەیدا پێماڵی سەراپای هەموو دیاردە سروشتیو مرۆییەکانی سەرزەمینی (هـەرێم) دەکات. بـەم خەسـڵەتەش دیسانەوە لـەباقی زانستەکانی تر جیادەکرێتەوە.

٣-نەخشە... ئەو زمانەیە کە جوگرافینـاس لێـی تێدەگـات، ئـەو کەرەستەو هۆکارەیە کە لە لێکۆڵینەوەی جوگرافییدا بەکاردەهێنرێتو لێیـەوە دەتوانرێت هـەموو دیـاردە سروشـتیو مرۆییـەکان بەمەبەسـتی لێکۆڵینـــەوە بخرێنـــەڕوو. نەخشـە وێنـەی ئـەو بەڵگەنامـە بنچینەییەیـە کـەجوگرافیناس نیازیـەتی لێی بکۆڵێتەوە.°

## (١-١-٢): تیۆرە جوگرافییەکانی شیکردنەوەی دەوڵەتو هێزی دەوڵەت

گەشەسـەندنی تیۆری دەوڵـەتو دەسـتکەوتەکانی لێکۆڵینـەوەی زانسـتی لـە بوارەکـانی فەلســـەفەو جوگرافیـــاداو، پاشـــان فراوانبوونـــی پێگـــەی ئـــابوریو

بازرگـانی لـەنێوان گـەلاندا، بەتایبـەتیش دوای شۆڕشـی پیشەسـازیو پەلهاویشتنی عەسکەرییانەی دەوڵەتـە پیشەسـازییەکان بـۆ گـەڕان بـەدوای جێگەی تازەدا، هـەموو ئەوانـە بوونـە هـۆی سـەرهەڵدانو پـەرەپێدانی تیـۆرە جیاجیاکانی تایبەت بە پاراستنی ئاسایشی قەوارە سیاسییەکانو بیرکردنەوە لـەچۆنێتی رووبەڕبوونـەوەی مەترسـییە چاوەڕوانکراوەکـانی دەرەوەی ئـەو قەوارانە.

لـەو سـۆنگەیەی کـە توخمـە جوگرافییـەکان پایـەی سـەرەکی هـێزی هـەر دەوڵەتێك پێکدێنن، زانستی جوگرافیا بووە منداڵدانی سروشتیی سەرهەڵدانی ئەو لقەی کە لەدەوڵەت دەکۆڵێتەوەو، پاشان بەجوگرافیای سیاسی ناوزەدکرا جوگرافیـای سیاسـی لقێکـە لـە لقـەکانی جوگرافیـای مرۆیـی، ئـەم لقـە وەکـو سەرجەم لقەکانی تـری سـەربەهەمان پـۆل: جوگرافیـای ئـابوری، جوگرافیـای کۆمەڵایەتی.... دینامیکیەتێکی گەورەی هەیە.

سێ هۆکاری سەرەکی بوونـە هـۆی سەرهەڵدانی جوگرافیـای سیاسـی، کـە بریتین لە:-

١/گەشتو دۆزینەوە جوگرافییەکان.
٢/پەرەسەندنی ناسیونالیزم.
٣/پەرەسەندنی دانیشتوان

سـەفەرنامەو سیاحەتنامەی گـەلێك لـە گـەڕیدەکان ئـەوە ئاشـکرا دەکـەن کـە جگە لەمەبەستی کۆکردنەوەی زانیاری دەربارەی ناوچە جیاجیاکان، لەپشتی زۆربەی کۆچو گەشتی گەڕیدەکانەوە حەزێکی ئاشکرا هەبووە بۆ قوڵکردنەوەی ئەو زانیاریانەو هەوڵدان بۆ پەرەپێدانیان.

دوابـەدوای سـەدەی شـازدەو پـێ بـەپێی سـەرهەڵدانی سیسـتمی سەرمایەدارىو پێکهێنانی قەوارەو دەوڵەتی نەتـەوەیی وەکـو دیاردەیـەکی ئـەو قۆناغەو هەوڵدان بۆ کۆبوونـەرەی رۆڵەکانی یـەك گـەلو یـەك نەتـەوە لـەدەوری یـەکترو، پاشـانیش دەرکـەوتنی شـێوەیەك لەشـێوەکانی سـنوردانانو سنورکێشانی ئەو قەوارانە، هـەموو ئەوانـە جوگرافیایـان بـەرەو سیاسـی بـوون، برد.

زۆربوونـی ژمـارەی دانیشـتوانیش هۆیـەکی تـر بـوو لـەو هۆیانـەی کـە بـووە هۆی سەرهەڵدانی ئەم لقەی جوگرافیا. لەکاتێکدا ژمارەی دانیشتوانی جیهان لە

ساڵی (١٦٥٠ز)دا دەوروبەری تەنیا پێنج سەد ملیۆن کەس دەبوو، کەچی ئەم ژمارەیە لەم چوارسەدەیەی دواییدا هەشتا ئەوەندە زیادی کردوو، لە ساڵی (١٩٨٥ز)دا لەچوار ملیار کەس تێپەڕیکرد. ئەم زۆربوونەوەی ژمارەی دانیشتوانی جیهان و دابەشکردنی ناعادیلانەی خێروبێرەکانی سەر گۆی زەوی گەلێك شەڕو ململانێی هێنایە کایە کە سنوری وڵاتانی دووچاری گۆڕانی یەکبینە کردەوە[٧]

هەرچەندە لەسەدەی پانزەوە سەرەتاکانی جوگرافیای سیاسی بەدیارکەوتن، بەڵام تا نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدە، بنەماکانی ئەم زانستە بەشێوەیەکی ڕێك وپێك دانەڕێژرا. بەرەو پێشەوەچوونی زانستەکانی تری وەکو مێژوو، سیاسەت، کۆمەڵناسی، پێوەندی نێودەوڵەتی، ئابووریناسی، و زانستیە عەسکەرییەکان بوونە پێشینەیەکی تۆکمە بۆ داڕشتنی پایە تیۆرییەکانی جوگرافیای سیاسی.

گەر بەشێوەیەکی گشتی (هەرێم) یەکەی لێکۆڵینەوەی کۆڵینکارییە جوگرافییەکان بێت، ئەوا لە جوگرافیای سیاسیدا (دەوڵەت) کە یەکەیەکی زیندووی ناجێگیرە، بنەمای کۆڵینکارییەکەیەتی.

هەر یەکەیەکی سیاسی لەسێ توخم پێکدێت؛ ئەوانیش زەوی و، دانیشتوان و، دەسەڵات (حکومەت)ە. جوگرافیای سیاسی لە تانوپۆکانی دوان لەهەر یەکەیەکی سیاسی دەکۆڵێتەوە؛ ئەوانیش زەوی و دانیشتوانە.

ئەرکی جوگرافیای سیاسی لێکۆڵینەوەی هەڵسوکەوتی هاونیشتمانییەکانە بەرامبەر بەر بەرژەوەندییەکانی دەوڵەت. ئیتر لێرەشەوەیە کە یەکەی سیاسی بە پێچەوانەی لقەکانی تری جوگرافیاوە، لە جوگرافیای سیاسیدا خۆی بەسەر هەرێمی سروشتیدا دەسەپێنێت. لەو پێودانگەشەوە کە هەر دەوڵەتێك بەجیا دیاردەیەکی جوگرافییە، جوگرافیناسی سیاسی لەڕێی شیکردنەوەی جیۆ-سیاسیانەی توخمە سروشتی و مرۆییەکان، زانیاری گەڵاڵە دەکات و دەیخاتە بەردەست داڕێژەرانی سیاسەتی دەوڵەتەوە.

گرنگی پراکتیزەکردنی جوگرافیای سیاسی بۆ دەوڵەت لەم خاڵانەدا خۆدەنوێنێت:-

١/ئاشکراکردنی واقعی پێکهاتەی ژینگەیی سروشتیو مرۆیی، هەروەها یەکەی سیاسی، لەمیانەی گرتنەبەری مەنهەجی شیتەڵکارییانەی جوگرافیای سیاسی.
٢/دەست نیشانکردنی بەربەستە بەرپرسەکانی دیاریکردنی تانوپۆکانی نەخشەی سیاسیانەی دەوڵەت لەبواری پێوەندییە ناوخۆییو دەرەکییەکاندا.
٣/بەشداریکردن لەپلانی دیاریکردنی تانۆپۆ ئایندەییەکانی تەنگوچەڵەمە هەمە جۆرەکان، ئەویش بە بەشداریکردنی جوگرافیای سیاسی لە دیاریکردنی ستراتیجی گشتیی یەکە سیاسییەکە (واتە دەوڵەت).
٤/دواجار جوگرافیای سیاسی دەتوانێت بەشداری کاریگەری لەپاڵپشتی کردنی ئاسایشی نیشتمانیو ئاسایشی نەتەوەییو ئاشتی جیهانیدا بکات[٨]
لەگەرمەی جەنگی جیهانی یەکەمدا وەکو پێداویستیەکی بێ چەندوچۆنی ئەو جەنگەو، بۆ دارشتنو پتەوکردنی پایەکانی ئاسایشی دەوڵەتو قەوارەی سیاسی دەوڵەتانو بەرەچاوکردنی توخمە جوگرافییەکانی هەر دەوڵەتێک لەگێرانی رۆڵی سەرەکیو گەورەی پاراستنی ئاسایشی ئەو دەوڵەتەدا، لقێکی تری جوگرافیا بەناوی (جیۆپۆلەتیکا)وە سەری هەڵدا، کەدیسانەوە زۆربەی پایە تیۆرییەکانی لە جوگرافیای سیاسیەوە بناوان دەگرن.
زاراوەی جیۆپۆلەتیک بۆ یەکەمین جار لەسەر زاری مێژوونووسو سیاسەتناسی بەریتانی رۆدۆلف کیلین (١٨٦٤-١٩٢٢ز) لەساڵی (١٩١٦ز)دا هاتە کایە، پاشان بنەماکانی ئەم زانستە لەلایەن جەنەراڵی ئەڵمانی کارل هاوسهۆڤەرەوە، دارێژراو پەرەی پێدرا.
جەنگ جیۆپۆلەتیکی دروستکرد، بۆیە تەنانەت هێندێ جار جیۆپۆلەتیک بەجەنگ بەراورد دەکرێت.
جیۆپۆلەتیک تایبەتە بە لێکۆڵینەوەی دەوڵەت لەتێروانینی سیاسەتەوە، بەڵام وەکو چەمکێکی جێگیرو نەگۆر تەماشای دەوڵەت ناکات. بەڵکو وەکو زیندەوەرێکی زیندوو لێی دەروانێت. جیۆپۆلەتیک لەگۆشە نیگایەکی نەتەوەییو زاتییەوە، پێوەندییە ئاڵوگۆڕەکانی نێوان شوێنو هەریەکە لەدیمەنی سروشتیی (زەوی)و، دیمەنیمرۆیی (دانیشتوان)و دیمەنی شارستانیی (تواناو تەکنەلۆجیا)، دەکۆڵێتەوە. گەوهەری جیۆپۆلەتێك لێکۆڵینەوەی پێوەندی سیاسەتی نێودەوڵەتییە لەسایەی هەلومەرجو پێکهاتە جوگرافییەکاندا،

لەڕاستیشدا جوگرافیاو توخمە جوگرافییەکان کرۆکی تیۆری جیۆپۆلەتیکن، بۆیە تەنانەت هێندێك لەزانا جیۆپۆلەتیکییەکان پێیان وایە کە سروشتی جوگرافیایی هەر دەوڵەتێك یەکەم سەرچاوەی هێزە نەتەوەییەکەی پێکدەهێنێت. هێندێکی تریش دەڵێن بارودۆخە جوگرافییەکان سیاسەتەکانی دەوڵەت دیاری دەکەن.

دەتوانین بەم شێوەیە پێناسەی جیۆپۆلەتیك بکەین؛ جیۆپۆلەتیك ئەو تیۆرییەیە کە لەهێزی دەوڵەت پێ بەپێی زەوی دەکۆڵێتەوە، یا تیۆری گۆڕانکارییە سیاسییەکانە بەپێی پێوەندییان بە زەوییەوە.

ڕۆدۆلف کیلین ئاوا پێناسەی جیۆپۆلەتیك دەکات؛ زانستێکە لەپێوەندی نێوان ڕووداوە سیاسییەکان و زەوی دەکۆڵێتەوە. بەڵام بە بۆ چوونی نیکۆلاس سپایکمانی ئەمریکی جیۆپۆلەتیك نەخشەدانانە بۆ سیاسەتی ئاسایشی نەتەوەیی دەوڵەت لەچوارچێوەی فاکتەرە جوگرافییەکاندا.

جیۆپۆلەتیك لە گۆشەنیگایەکی تایبەتەوە لە تانۆپۆکانی ستراتیج دەکۆڵێتەوە، ئەو پێی وایە ستراتیج فەلسەفەی هێزە. بۆیە زەرورەت یاسا ناناسێت. هەر لەبەر ئەوەشە جیۆپۆلەتیك گرنگی گەورە بەداواکانی دەوڵەت دەدات لەڕووی ڕووبەرەوەو ڕووبەری دەوڵەت بۆ پێنج توخمی سەرەکی دابەش دەکات کەبێ دابینکردنی ئەو پێنج توخمە دەوڵەت ناتوانێت هەست بەدڵنیایی بکات، ئەوانیش توانای خۆبژێوی، زیندەبوار، بیرۆکەی هەرێمگیریی، ململانێی نێوان هێزەکانی ئاوو وشکایی،و سنوری سیاسییە.

ئەگەرچی جیۆپۆلەتیك لە جوگرافیای سیاسییەوە سەری هەڵدا، بەڵام جیاوازی گەورەشیان لەنێواندایە.. جیۆپۆلەتیك بە پێچەوانەی جوگرافیای سیاسییەوە، ئەوەندەی گرنگی بە بارودۆخ لەپاشەڕۆژدا دەدات، هێندە گوێ بە ئەمڕۆ نادات. جیۆپۆلەتیك وێنەی دەوڵەت بەوشێوەیە دەکێشێت کە پێویستە ببێت، لەکاتێکدا جوگرافیای سیاسی لەقەوارەی ئێستای دەوڵەت وەکو ئەوەی هەیە، دەکۆڵێتەوە. لەسەرێکی ترەوە جیۆپۆلەتیك ئەوە دەخاتەڕوو کە لەڕووی سیاسییەوە و بۆ بەرژەوەندی دەوڵەت پێویستە ئەنجام بدرێت. بەڵام جوگرافیای سیاسی گرنگی بە لێکۆڵینەوەی جوگرافیای دەوڵەتان و یەکە سیاسییەکان دەدات پێ بەپێی ڕاستیە جوگرافییەکان. هاوسهۆفەر دەڵێت:

جوگرافیای سیاسی لەڕووی رووبەرەوە لەدەوڵەت دەکۆڵێتەوە. بەڵام جیۆپۆلەتیک لەڕووی دەوڵەتەوە لەڕووبەر دەکۆڵێتەوە[9]

جیاوازییەکانی نێوان جوگرافیای سیاسیو جیۆپۆلەتیک هەرچەندێك بن، ناوەڕۆکی هەردوو تیۆرییەکە ئەو راستیە ئاشکرا دەکەن کە زانینو هەڵهێنجانی راستیە جوگرافییەکانی هەر دەوڵەتێك، بنەمای شیکردنەوەی هێزی ئەو دەوڵەتە پێکدەهێنێت. لەمەشدا زانستی جوگرافیا بەهەموو لقەکانیەوە رۆڵی بڕیاردەر دەگێڕن.

## (١-١-٣): چەمکی هێزو هەڵسەنگاندنی هێزی دەوڵەت

## یەکەم: چەمکی هێز

هێز[10] بەردی بناغەی سیاسەتی نێودەوڵەتیی ئێستایە.. هێزی نەتەوەییش بەیەکێکە لەدیاردەکانی پێوەندی نێودەوڵەتیو زادەی سیاسەتی نەتەوەییە بەشێوەیەکەی گشتی هێزی نەتەوەیی مانای توانای کارکردنەسەر هەڵسوکەوتی دەوڵەتانی ترە تا بەرژەوەندییە باڵاکانی دەوڵەتی خاوەن هێز بەدەست بهێنرێت.

توخمەکانی هێزی نەتەوەیی جۆراوجۆرو پێکەوە گرێدراوون، توخمە سروشتییەکان کە توخمە جوگرافییەکان دەگرێتەوە، گرنگترین ئەڵقەکانی هێزی دەوڵەتیان پێدەپێورێت. ئەمە سەرەڕای هێزی ئابوریو سیاسیو عەسکەریو سایکۆلۆجیو هی تر. بەشێوە سەراپاییەکەی هێز گوزارە لە کارلێکی نێوان شوێنو نەخشەکێشانی مرۆڤ لەسایەی ئەو تەکنەلۆجیاو شارەزاییە بەردەستەدا دەکات کەلێیەوە دەکرێت ئامانجی ستراتیجی جیهانیو ستراتیجی مرۆیی بەدەست بهێنرێت. هەرلێرەشەوە زۆربەی جاران چەمکی هێز لەبەرامبەر توانای دەوڵەتدا دادەنرێت.

بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی وردو هەمەلایەن لەچەمکی هێز تێبگەین، پێویستە لەهەریەك لەتوخمە پێکهێنەرەکانی هێز، شێوەکانی هێز، خەسڵەتەکانی هێزو جۆرەکانی هێز لە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیدا، بدوێین.

١-توخمە پێکهێنەرەکانی هێز: چەمکی هێز لەپێنج توخمی سەرەکی پێکدێت کەبریتین لە: هێزی جوگرافی، هێزی ئابوری، هێزی مرۆیی، هێزی عەسکەری، هێزی سایکۆلۆجی.

هەر پێنج توخمەکەی هێزیش لەدوو توخمی سەرەکیدا کۆدەکرێنەوە، ئەوانیش هێزی جوگرافیو هێزی جیۆلۆجین.

٢-شێوەکانی هێز: شێوەکانی هێز جۆراوجۆرو جیاوازن، گرنگترینیان ئەمانەن:

أ-هێزی ئابوری، کەمانای رادەیەکی بەرز لەتوانای خۆبژێوی دەگەیەنێت. بەواتایەکی تر توانای درێژەدان بە توخمەکانی ئابوری نەتەوەیی لەهەردوو کاتەکانی شەڕو ئاشتیدا. ئەم هێزە بەگرنگترین شێوەکانی هێزی هەر نەتەوەو دەوڵەتێك دادەنرێت.

ب-هێزی عەسکەری، کەچڕکردنەوەی هەموو توخمە مرۆییو بنەما تەکنەلۆجیو ئابورییەکانو، خستنەگەڕیان لەخزمەتی دامودەزگای عەسکەری ولآتدا، دەگەیەنێت.

پ-هێزی مەعنەوی، بەمانای کارکردنە سەر رای گشتییە لەناوخۆو دەرەوەی ولآتدا، بەشێوەیەك کەهێزی بەرامبەر لاوازبکاتو کەلێنو ناکۆکییە ناوخۆییەکانی دەوڵەتی بەرامبەر گەورەتر بکات.

ج-هێزی فیعلی، ئەم هێزەش گوزارە لە هەبوونی دەستەجێی سەرچاوە جیاجیاکانی درێژەدان بەژیانی ئاسایی هەر دەوڵەتێك دەکات.

چ-هێزی پێشبینیکراو (یا هێزی مت بوو)، ئەو توانایانەی دەوڵەتن کەپاش پەرەپێدان، چنگ دەخرێن.

٣-خەسڵەتەکانی هێز چەند خەسڵەتێکی جیاکەرەوەی هەیە، ئەوانیش:

أ-هێز قەوارەیەکی مەعنەوییە، وەکو رۆح وایە جەستە دەبزوێنێتو درێژە بەبوونی دەدات، بێ ئەوەی خۆی وەکو قەوارەیەکی مادی ببینرێت.

ب-هێز سیمایەکی ناوازەی هەیە... پێویستییەکە هیچ رادەیەکی دیاریکراو بۆ تێربوون لێی نییە.

پ-هێز چەمکێکی رێژەییە، هێزی دەوڵەت بە بەراوورد لەگەڵ هێزی باقی دەوڵەتانی تر، دەپێورێت.

ج-مەرج نییە هێز پلە بەپلەو ئاسایی پەرەبستێنێت، کاری لەناکاو دیاردەیەکە لەدیاردەکانی هێزو هەوڵدان بۆ دەستخستنی.

چ-هێز چەمکێکی بزێوی دینامیکی گەشەسەندووە.

ح–دابەشبوونی هێز لەجەستەی دەوڵەتدا سیفەتێکی نابەرابەری هەیە، تالەدڵی دەوڵەت کەناوەندەکەیەتی دووربکەوینەوە، کارایی هێز لەبەشەکانی تری جەستەی دەوڵەتدا بەرەو کەمبوونەوە دەچێت.

٤–جۆرەکانی هێز لەکۆمەڵگەی نێودەوڵەتیدا: لەکۆمەڵگەی نێودەوڵەتیدا چوار جۆری هێز هەن، کەبریتین لە:–

ا–هێزی تاکلایەنە، یاهێزی خۆیی: ئەم جۆرە هێز دووجۆر لە دەوڵەتان دەگرێتەوە، یا ئەوەتا دەوڵەت پشت ئەستور بەهێزی خۆی مامەڵە دەکات، یا بەهۆی دابڕانی لەکۆمەڵگەی نێودەوڵەتی جا بەهەر هۆیەك بێت، بەناچاری دەوڵەت پشت بەهێزی خۆی دەبەستێت.

ب–هێزی هاوپەیمانی یائەوەی بە (هێزی بەکۆمەڵ) ناودەبرێت: ئەمیش ئەو هێزە دەگرێتەوە کە لەئەنجامی پەیماننامەو رێکەوتننامە کە دەوڵەتە جیاجیاکان بەمەبەستی جۆراوجۆر لەنێواخۆیاندا دەبەستن، دێتەکایە.

پ–هێزی ئاسایشی بەکۆمەڵ: ئەم هێزە خۆی لەهەوڵە نێودەوڵەتییەکان بۆ چارەسەرکردنی تەنگوچەڵەمە جیاجیاکاندا دەنوێنێت.

ج–هێزی جیهانی: مەبەست لەم هێزە، هێزی ئەو حکومەتە جیهانییەیە کەهێشتا دانەمەزراوە.

## دووەم: هەڵسەنگاندنی هێزی دەوڵەت

(یاهێزی نەتەوەیی) هێزی نەتەوەیی[11] ژمارەیەکی زۆر لەو توخمە گرنگانە دەگرێتەوە کە ناکرێت لەرێی هاوکێشەیەکی ماتماتیکیانەوە گوزارەی لێبکرێت، لەوانە: ئارەزووی بەرپاکردنی جەنگ، رادەی هاوپشتی کۆمەڵایەتی لەنێوان دانیشتوانداو هەستکردنیان بە بەرپرسێتی ساسییو، توانای خۆڕاگرتنیان لەبەردەم نەبوونی قاتوقڕیداو.... هتد. بۆ شیکارکردنی هێزی نەتەوەیی هەر نەتەوەیەك، بوونی دەوڵەتێك کە سنورێکی سیاسی دیاریکراوی هەبێت، مەرجێکی بێچەندو چۆنە. چونکە لێکۆڵینەوە لەهێزی نەتەوەیی نەتەوەیەك کە تانۆپۆکانی ئاشکرا نەبێت، لەڕووی زانستییەوە هەر لێکۆڵینەوەیەکی لەوجۆرە کورت دەهێنێت. هەربۆیە کەباس لەهێزی نەتەوەیی دەکرێت، بەرامبەر بەوەی باس لەهێزی دەوڵەتێك دەکرێت کەبوونێکی مادی هەیە. بۆ هەڵسەنگاندنی هێزی هەر دەوڵەتێکیش لەباری سەرنجی توخمە جوگرافییەکانەوە زانینو

ئاشکراکردنی بنەما ستراتیجییەکان، پایەکانی هەر هەڵسەنگاندنێکی لەوجۆرەتان بۆ دادەڕێژن لاوازیو بەهێزی ئەو بنەمایانە لاوازیو بەهێزی هەر دەوڵەتێکمان بۆ دەستنیشان دەکەن.

بنەما جیۆستراتیجییەکانی هەر دەوڵەتێك لەسێ پایەی بنەڕەتی پێکدێن لە هەرسێکیان پێکەوە لەپێوەندییەکی ئۆرگانیکیو دیالەکتیکیانەدا هێزی دەوڵەت هەڵدەسەنگێنن، ئەوانیش بریتین لە:-

یەك-توخمە جیۆپۆلەتیکییەکان.
دوو-سامانە مرۆییەکان
سێ-سامانە سروشتییەکان.

## یەك-توخمە جیۆپۆلەتیکییەکان

هەروەکو پێشتر باسی لێوەکرا، جیۆپۆلەتیك ئەو تیۆرییەیە کە بەپێی زەوی لەهێزی دەوڵەت دەکۆڵێتەوە. بۆیە هەموو ئەو رەگەزانەی پێکهاتەی دەوڵەت کە پێوەندییان بە سروشتی جوگرافیایی دەوڵەتەکەوە هەیە، سەرجەم توخمە جیۆپۆلەتیکییەکان پێکدێنن.

توخمە جیۆپۆلەتیکییەکانی هەر دەوڵەتێکیش بۆ پێنج توخمی سەرەکی دابەش دەکرێت بەم شێوەیە:-

١-شوێن: شوێنی هەر وڵاتێك (شوێنی جوگرافی)، بەردی بناغەی هەر شیکردنەوەیەکی جیۆپۆلەتیکییە.. ئەگەرچی شوێن وەکو سەرجەم توخمە سروشتییەکانی تر خەسڵەتێکی جێگیرو نەگۆڕی هەیە، بەڵام بەها سیاسیو ستراتیجییەکەی لەگۆڕانی بەردەوامدایە.

بۆ زانینی سیفەتەکانی شوێن هەر دەوڵەتێك، پێویستە لەم رووانەوە لەشوێن بکۆڵرێتەوە:-

أ-شوێنی فەلەکی: مەبەست لەشوێنی فەلەکی دەستنیشانکردنی شوێنە پێبەپێی بازنەکانی پانیو هێڵەکانی درێژییەوە شوێنی هەر دەوڵەتێك بەپێی ئەو بازنەو هێڵانە ئەم گرنگییانەی هەیە:-

*بازنەکانی پانی گۆی زەوی، دەربڕی هەلوومەرجەکانی کەشوهەوان، بەوپێیە تا ئەو بازنانە زۆرتربن مانای وایە دەولەت کەشوهەوای هەمەجۆری هەیەو بەوپێیەش چالاکیو بەرهەمە کشتوکالیو ئاژەلییەکان، زۆرو زەبەندو هەمەچەشن دەبن.

*بەلام زۆربوونی هێلەکانی درێژی کەدەربڕی کاتەکانی خۆرهەلاتنو خۆرئاوابوونە، مانای پانوپۆڕی دەولەتو لەڕووی کشتوکالیشەوە بوونی یەك جۆر بەرهەمی کشتوکالی دەگەیەنێت.

بۆیە تا بازنەکانی پانی دەولەت زۆرتربن، هێزی دەولەتیش زۆرتر دەبێت دیارە ئەمە دەولەتە جەمسەرییەکان ناگرێتەوە.

ب-شوێن بەنسبەت ئاوو وشکاییەوە: ئەمەش دوو جۆر شوێن دەگرێتەوە:-

*شوێنی دەریایی: بەشێوەیەکی گشتی ولاتانی سەر دەریا سودی گەورە لەبازرگانیکردنو پێوەندیکردن بەولاتانی ترو رەنیوهێنانی سامانەکانی ژێردەریا وەردەگرنو دەشێت روبارە ئاوییەکان وەکو سنورێکی دابڕو جیاکەرەوەی سروشتیش دەولەت سوودی لێوەربگرێت.

شوێنی دەریاییش پێبەپێی ئەم خالانە، کەم تازۆر کارایی بەسەر دەولەتی سەردەریاوە جێدێلێت:-

-رێژەی سنورە دەریاییەکە بەنیسبەت تێکرای دەولەتەوە.

-شێوەی کەنارە دەریاییەکەو پێکهاتە مۆرفۆلۆجییەکەی.

-گرنگییە نێودەولەتیو هەرێمیو جیهانییەکانی دەریاکە.

*شوێنی کیشوەریی (یائەو دەولەتانەی کەپێیان دەوترێت دەولەتە داخراوەکان): ئەم دەولەتانە لەڕێی دەولەتانی ترەوە نەبێت، ناتوانن بەدەریا بگەن، بەو پێیەش بۆ بەرگریکردن لەخۆیان، ناچارن هێزی زەمینیو ئاسمانی گەورە پێکەوەبنێن.

پ-شوێنی ستراتیجی: شوێنی ستراتیجی خالی دەولەتەو بەپێی هەلومەرج لە گۆڕاندایە. شوێنە ستراتیجییەکان پێبەپێی بوونی نۆکەندو دوورگەو ترانزێتەوە، گرنگی جیاجیان هەیە. ئەگەرچی بوونی شوێنی ستراتیجی نیشانەی هێزی دەولەتە، بەلام لەهێندێك کاتدا دەبێتە مایەی چاوتێبڕینی زلهێزەکانو هەلگیرسانی کێشەو ململانێو جەنگ.

ج-شوێنی پایتەخت: پایتەخت دڵی دەوڵەتە، بۆیە دەوڵەتان هەوڵدەدەن تابکرێت لەناوچە سنورییەکان دووری بخەنەوەو بیبەنە قوڵایی جەستەی دەوڵەتەوە. چونکە مەترسی خستتە سەر پایەخت و گرتنی لەکاتی هەڵگیرسانی جەنگدا، مایەی تێکچوونی سەرجەم بارودۆخی وڵاتە ئەگەر نەبێتە هۆی دارمانی یەکجارەکی دەوڵەت.

٢-رووبەر/ رووبەری هەر دەوڵەتێك یەکێك لەتوخمە گرنگەکانی هێزی ئەو دەوڵەتەمان پیشان دەدات.

هەر دەوڵەتێك خاوەن رووبەرێکی تایبەت بەخۆیەتی کە رێکخستنە سیاسییەکەی لەسەر بیناکردووە.

بەرامبەر بەچەمکی (رووبەر) لەجوگرافیادا لە جیۆپۆلەتیکدا چەمکی (بوار Space) بەکاردێت. (بوار) چەقی تیۆرییەکەی (راتزل)ە... ئەو دەڵێت: هەر دەوڵەتێك بۆ بەرگریکردن لەو بوارەی کە داگیریکردووە وەکو پێویست لەگەڵ دنیای دەرەوەدا لەململانێدایە بۆیە هەر دەوڵەتێك کەخاوەنی رێکخستنێکی تۆکمە بێت، هەوڵی فراوانکردنی رووبەری بوارەکەی دەدات.

لەهەمان سۆنگەوە لەکاتێکدا (رووبەر) تانۆپۆکانی لای جوگرافیناس دیاریکراوە، کەچی (بوار) لای جیۆپۆلەتیکییەکان، سنوری بۆ نییە.

بەشێوەیەکی گشتی رووبەری فراوان ئەم کارابیانەی بۆ سەر هێزی دەوڵەت هەیە:-

أ-ناکرێت لەدەرەوەی رووبەرێکی گەورەدا، هیچ دەوڵەتێکی مەزن هەبێت. بەڵام ئەمە مانای وانییە کە هەر دەوڵەتێکی رووبەر فراوان لەڕووی هێزەوە دەوڵەتێکی مەزن بێت. چونکە دەشێت بەشێکی گەورەی خاکی دەوڵەت، بیابان یا وشکەڕۆ بێت و بەکەڵکی ژیان نەیەت، بەوپێیەش چڕی دانیشتوان و ژمارەکەیان کەم بن.

ب-روبەری فراوان بواری هەڵبژاردنی شوێنی لەبار بۆ پایتەختی دەوڵەت دەدات.

پ-رووبەری فراوان لەڕووی عەسکەرییەوە قوڵایی ستراتیجی دەبەخشێتە دەوڵەت.

ج-رووبەری فراوان بواری دابەشکردنی باشترو لەبارتر بۆ دامەزراوە عەسکەریو پیشەسازیو ئابوورییەکانی دەوڵەت، دەڕەخسێنێت.

چ-دواجار رووبەری فراوان بواری کشتوکاڵو چالاکی ئابوری هەمەجۆر دەدات.

٣-شێوە/ شێوە دەوڵەت کارایی گەورەی لەسەر ستراتیجی عەسکەریو پلانی ئابوری دەوڵەت، هەیە تا شێوەی دەوڵەت کۆکو ئەندازەیی بێت هێزو یەککگرتوویی زۆرتر دەبێت. بەشێوەیەکی گشتی دەوڵەتانی دنیا بۆ چەند شێوەیەکی سەرەکی دابەش دەکرێن، کە بریتین لە:-

ا-شێوەی رێکوپێك: بەباشترین شێوەکانو بەهێز ترینیان دادەنرێت چونکە لەسەرێکەوە چەندین خاڵی بەرگریکردن دەستەبەر دەکاتو، لەسەرێکی دیکەشەوە پەکی هێرشکردن دەخات. ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە دەرفەتی باشتر بۆ دابەشکردنی دامەزراوە ئابوریو عەسکەرییەکان لەسەر رووی خاکی وڵاتەکە، دەدات.

ب-شێوەی لاکێشەیی: لەڕووی ستراتیجی عەسکەرییەوە، ئەم شێوەیە فاکتەرەکانی جموجوڵو پێوەندیکردنی وڵات لەناوچەیەکدا قەتیس دەکات.

ئەمەش وڵات دووچاری دابڕانو کەرت کەرت بوون دەکات بەتایبەتیش لەکاتی جەنگدا. بۆیە دەوڵەت ناچار دەبێت هێزو جبەخانەی زۆرو زەبەند بەدرێژایی سنورەکانی بڵاوبکاتەوە.

پ-شێوەی پارچە پارچە: بەهۆی سەختی جموجوڵو هاتوچۆ لەم شێوەیەی دەوڵەتدا لەکاتی جەنگو لەکاتی ئاشتیشدا، بەڕێوەبردنی دەوڵەت بەسەر بەشە جیاجیاکانی وڵاتدا، پەرتەوازەو لاواز دەهێڵێتەوە.

ج-شێوەی پەرشوبڵاو: ئەم شێوەیەش دەوڵەتانی کۆلۆنیالیستی دەگرێتەوە کە کۆلۆنییەکانیان بەم لاو ئەولای جیهاندا پەرشوبڵاوبوونەتەوە.

-ئەم شێوەیەی دەوڵەت زۆرتر پێش جەنگی دووەمی جیهان لەئارادابوو.

٤-سنور/ هەر دەوڵەتێك سنورێکی دیاریکراوی هەیە کە لەدەوڵەتانی تری جیادەکاتەوە سنور دەستکردی مرۆڤ خۆیەتیو ناچێتە خانەی دیاردە سروشتیو جوگرافییەکانەوە. لەکێشانو دەستنیشانکردنی سنوردا، هێندێك جار توخمە سروشتی مرۆییەکانو هێندێك جاری تر توخمە سروشتی جوگرافییەکان بڕیاردەری شێوەی سنورن. بەڵام زۆربەی جار هێز لەپشتی هەر سنورکێشانێکەوە بووە.

پێ بەپێی شێوەکانی سنور، هێزی دەوڵەتیش کەم تازۆر کاری تێدەکرێت بەم شێوانە:-

أ-ئەو سنورانەی کە لەمپەری سروشتی وەکو دەریا، چیا... هێڵەکەیان پێکناهێنێت، سنورێکی کراوە دەبن و مەترسی پەلاماردانیان دەبێت.

ب-ئەو سنورانەش کە بەدەوڵەتانی زلهێز دەورە دراون دووبارە رووبەڕووی مەترسی یەکبینەی داگیرکردن و سنورشکاندن دەبنەوە.

پ-ئەو سنورانەی کە لەبنەڕەتدا کێشەو ململانێی لەسەرەو بۆ هیچ کام لە دەوڵەتانی هاوسێ هێڵی سنور یەکلایی نەبۆتەوە، یا یەکلایی بۆتەوەو یەکێك یازیاتر لەدەوڵەتێك پێ قایل نییە، سنورێکی لاوازەو مەترسی پەلاماردانی لەئارادا دەبێت.

٥-تۆبۆگرافیاو فیزیۆگرافیا/ توخمە تۆبۆگرافی و فیزیۆگرافییەکان کە خۆیان لەمۆرفۆلۆجیاو کەشوهەواو سەرچاوە سروشتییەکاندا دەبیننەوە، پێکەوە کەسێتی جیۆسیاسی دەوڵەت دەستنیشان دەکەن. تێکرای ئەم توخمانە کەخەسڵەتێکی چەسپاویان هەیە، هەریەکەیان بە جۆرێك کار لەهێزی دەوڵەت دەکەن.

أ-مۆرفۆلۆجیا: مۆرفۆلۆجیا، چیاکان و بانەکان و دەشت و دۆڵەکان دەگرێتەوە کەسەرجەم پێکەوە رۆڵێکی گرنگ لەدیاریکردنی هێزی دەوڵەتدا وازی دەکەن. مۆرفۆلۆجیاو کەشوهەوا پێکەوە کەسێتی ئابوری دەوڵەت پێکدێنن.

ناوچە شاخاوییەکان دیارترین دیاردەکانی رووی خاکن. ئەگەرچی لەڕووی ئابورییەوە ناکرێت لەگەڵ دەشتەکان بەراورد بکرێن، بەڵام چیاکان سەرچاوەی دەستخستنی ئاون و، بەناوچەی گەشتوگوزار دەژمێررێن. لەڕووی عەسکەرییەوە گرنگی چیاکان پێوەند بە مەوقعی چیاکان لە هەر وڵاتێکداو جۆری دابەشبونیان بوونی چیا لەناوچە سنورییەکاندا، بە بەربەستێکی تووندوتۆڵی دەوڵەت دەبێت بەرامبەر دەرەوەو لەسایەیدا دەشێت دەوڵەت گەشەی گەورە بکات. بەڵام لەهەمان کاتیشدا بەربەستی فراوانبوونی دەوڵەتە بۆ ناوچەکانی دەوربەری کەچی بوونی چیا لەجەستەی دەوڵەتدا هاتوچۆی نێوان بەشەکانی وڵات دژواردەکات و، زۆرجاران کەسایەتی جوگرافی و شارستانی جیاواز لەخودی هەمان دەوڵەتدا دەخوڵقێنێت.

لەهەردوو باری هێرش و بەرگریدا، چیاکان خەسڵەتێکی جیاکەرەوەیان هەیە.. چیاکان شوێنی بەرگریکردن و دروستکردنی قوڵلەو قەڵاو سەنگەری قایمن. بەپێچەوانەی چیاکانەوە، ئەگەرچی دەشتەکان لەڕووی ستراتیجی بەرگریکردنەوە ناگەنە ئەوان، بەڵام لەڕووی ئابورییەوە چاکترین رووەکانی رووی خاکن. دەشتەکان شوێنی چڕبوونەوەی دانیشتوان و بیناکردنی شارە گەورەکانن، چونکە ڕێگەوبان لەدەشتەکاندا چڕوپڕن و پەل بۆ هەموو لایەك دەکێشن ئەگەر بەربەستەکانی وەکو رووبارو زۆنگ و چیاکان نەبێت، ئەوا دەشتەکان لەڕووی بەرگرییەوە لاوازن و داگیرکردنیان ئاسانە. چونکە لەکاتێکدا دەشتەکان مەیدانی بەکارهێنانی تانك و زرێپۆش و سوپای گەورەن، چیاکان شوێنی پیادەو جەنگی پارتیزانین.

ب-کەشوهەوا: کەشوهەوا پێوەندییەکی گەورەی بەلەشساخی مرۆڤ و چالاکی و خۆراك و ناوچەکانی نیشتەجێبوونیەوە، هەیە. سەرەڕای ئەوەی کەشوهەوا پێوەندی بەدابەشبوونی ئەو سامان و کانزایانەشەوە هەیە کە دەکەونە ژێر زەوی.

کەشوهەوا پێبەپێی ناوچە جیاجیاکانی جیهان دەگۆڕێت، ناوچە مامناوەندی وشك و، ناوچەی مامناوەندی سارد، لە لەبارترین ناوچەکانی کەشوهەوا دادەنرێن چونکە لەکاتێکدا ناوچەکانی کەمەرەی گۆی زەوی و ناوچە جەمسەرییەکان، بەهۆی گەرماو سەرمای لەرادەبەدەری ساڵانەیانەوە، ژیانێکی ئاژەڵییانەیان فراژووکردووە کە تێیدا ئەرکی گەورەی هەر بوونەوەرێك بەرگریکرن و توانای مانەوەیەتی کەچی لەناوچە مامناوەندییەکانی زەوی بۆ نمونە ئەوروپا کەشوهەوا ڕێگری بەردەم پەیداکردنی خۆراك و چالاکی رۆژانەی مرۆڤ نییە.

بەشێوەیەکی گشتی، نەخشەی سیاسی جیهان ئەوە پیشاندەدات کە دەوڵەتە مەزنەکان ئەو دەوڵەتانەن کە کەوتوونەتە نێوان بازنەکانی پانی (٣٠°-٦٠°)ی باکور واتە ئەو بوارەی کە کەشوهەوای مامناوەندییە.

پ-رووەك: سەرچاوە رووەکییەکان لە هەر وڵاتێکدا بەردی بناغەی بینای ئابوری پێکدێنن. چونکە ئەو سەرچاوانە پێوەندییان بە بەشێکی گەورەی چالاکییە ئابورییە جیاجیاکانی هەر دەوڵەتێکەوە هەیە.

بەپێی هەرێمەکانی دابەشبوون، سەرچاوە رووەکییەکان دووجۆری سەرەکین، ئەوانیش هەرێمی دارستانەکان و هەرێمی ئێستێبسە.

لەکۆنەوە دارستانەکان شوێنی بەرگریکردنی مرۆڤ و پاراستنی بوون و سەرچاوەیەکی بەربڕشتی ئابوری بووە. لەڕووی عەسکەرییەوە دارستان رۆڵی گەورەی لە بەرگریکردن و شالاوی پارتیزانانەدا بینیووە. ئێستێبیش کە بەناوچەی گژوگیا کورتەکانی ناوچە مامناوەندییەکان ناودەبرێت ناوچەی شوانکارەیی بووە. گەلانی نیشتەجێی ئەم هەرێمانە، بەهۆی رۆژە وشکەکانی ساڵەوە پەلاماری دەوروبەری خۆیان داوەو، بەگەلانی دڕو هێرشکەر ناسراوون.

بۆ هەردوو جۆر لەبارترین ژینگە رووەکییەکان، ژینگەی کەشوهەوا مامناوەندییە شێدارەکانە کەتێدا شان بەشانی دارستانەکان لەوەڕگاش شین دەبن.

ج-روبار: ئاو یەکێکە لەتوخمە هەرە گرنگەکانی هێزی دەوڵەت. گرنگی ئاو بەپێی سەرچاوەکانی لەگۆڕاندایە. ئاوی سەرزەوی کە چۆم و رووبارو دەریاچەو دەریادەگرێنەوە، بە پلەی یەکەم دێت بەتایبەتی گەر سەرچاوەکانی بکەوێتە ناو خاکی دەوڵەتەکەوە.

ئەو روووبارانەی کە بە تاکە وڵاتێکدا رەت دەبن، بەڕووبارە نیشتمانییەکان ناودەبرێن و، ئەوانەش کە بەزۆرتر لەوڵاتێکدا دەڕۆن، بەڕووبارە نێو دەوڵەتییەکان ناسراون.

لەڕووی عەسکەرییەوە گرنگی رووبارەکان لەوەدایە کەوەکو خاڵی جیاکەرەوەی سنور، یاوەکو بەربەست و شوێنی بەرگریکردن بەکاردێن. ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە لەبورای کەشتیرانیشدا پێوەندیکردن بەیەکە جیاجیاکانی دەوڵەتەوە ئاسان دەکات.

## دوو- سامانە مرۆییەکان

مەبەست لەسامانی مرۆیی، دانیشتوانە.

هەروەکو پێشان باسکرا، هەریەکە سیای، هەر دەوڵەتێك بوونی نییە. دانیشتوان بەپێچەوانەی توخمە جیۆپۆلەتیکییەکانو سامانە سروشتییەکانی دەوڵەتەوە توخمێکی گۆڕاوە. هەر لێکۆڵینەوەیەك لەدانیشتوان وەکو توخمێکی هێزی دەوڵەت، دەبێت ئەم لایەنانە دانیشتوان بگرێتەوە:-

١-قەوارەی رادەی گەشەسەندنی دانیشتوان: زۆری ژمارەی دانیشتوان بوونی سوپایەکی گەورە فراژوو دەکات، لەبەرئەوەش کە تائێستا رەگەزی سەرەکی هەر سوپاو کەرەستەی هەر جەنگێك مرۆڤ خۆیەتی، بۆیە زۆری ژمارەی دانیشتوان هێزی سوپاو توانای بەرپاکردنو بەردەوامبوونی جەنگ، مسۆگەر دەکات. بەپێچەوانەشەوە، دەوڵەتانی کەم دانیشتوان هەمیشە لەژێر بەزەیی دەوڵەتانی دانیشتوان زۆردان. سەرەڕای ئەوەش زۆری ژمارەی دانیشتوان، دەستی کاری زۆرتر لەبوارەکانی ئابوری دەوڵەتدا فەراهەم دەکەنو بارێکی چاکتر لەکاروبارە کارگێڕییەکانی دەوڵەتدا دەرەخسێنێتو، هەروەها دڵنیایی لای رۆڵەکانی نەتەوە بۆ پشت بەستن بەهێزو توانای خۆیان بەرجەستەدەکات.

٢-دابەشبوونی دانیشتوان: کەپێوەندی بەچڕی دانیشتوانی هەرێمە جیاجیاکانی دەوڵەتەوە هەیە پێبەپێی ناوچە کشتوکاڵیو پیشەسازیو مەڵبەندەکانی چڕی دانیشتوان. تاچڕی دانیشتوانی هەرێمە جیاجیاکان وەکو یەك، یانزیك لەیەك بێت، پێکهاتەی دانیشتوان بەهێزترو تۆکمەتر دەبێت.

٣-پێکهاتەی دیمۆگرافی دانیشتوان: لەهەمان سۆنگەی خاڵی پێشووەوە، دابەشبوونی دانیشتوانو رێژەی تەمەنو ژمارەی نێرو مێش کارایی گەورەیان بۆ سەر پێکهاتەی دانیشتوان هەیە.

٤-پێکهاتەی شارستانیی دانیشتوان: ئەمیش پێوەندی بەو پێشترە مێژوویيو شارستانییەوە هەیە، کەرۆڵەکانی دەوڵەتی پێگۆشکراوە، لەبیناکردنی کۆمەڵگەدا کار بە بنەماکانی دەکەن. لەبەرئەوەی دانیشتوان تەنیا

لەڕووی چەندایەتییەوە هەڵناسەنگێندرێت، بەڵکو لەڕووی چۆنایەتیو پێکهاتەی ئەتنیکیشەوە لێکدەدرێتەوە، بۆیە رادەی بەرزی ئاستی هۆشیاریو زانستیو سیاسی رۆڵەکانی هەر دەوڵەتێك، هێزێکی زۆرتر لەڕادەی نزمی ئەو ئاستانەی رۆڵەکانی دەوڵەتێکی تر، بەرجەستە دەکات. هەروەکو هاوچەشنیی نەتەوەییو رەگەزییو مەزهەبی، هێزی گەورەتر دەبەخشنە دەوڵەت.

سەرەڕای هەموو ئەو فاکتەرە پۆزەتیڤانەی کەزۆری ژمارەی دانیشتوان دەیخوڵقێنن، بەڵام بۆ وڵاتانی کەم دەرامەتو هەژار، زۆریی ژمارەی دانیشتوان مایەی نەهامەتیو خوڵقاندنی تەنگوچەڵەمەی ئابوریو بژێویو دواجاریش دروستکردنی مەترسییە بۆ سەر پاشەڕۆژی سیاسی دەوڵەتو سەربەخۆبوونی.

## سێ-سامانە سروشتییەکان

بێ بوونی سامانی سروشتی هەمەجۆرو زۆروزەبەند، ناکرێت باس لەهێزی دەوڵەت بکرێت، چونکە سامانی سروشتی هەر دەوڵەتێكو هێزی دەوڵەتەکە پێوەندییەکی راستەوخۆیان هەیەو لەڕووی چەندایەتیو چۆنایەتی سامانەکەوە هێزی دەوڵەتیش دەچەسپێت.

سامانە سروشتییەکان بنکەی ئابوری هەر دەوڵەتێكو ئامرازی هێزی سیاسیو هێزی نەتەوەیین. چونکە کەمو زۆریی سامانی سروشتییەکان کاراییان بۆ سەر سوپاو هێزی عەسکەریی دەوڵەت هەیە. لەهەمان سۆنگەوە ئەو دەوڵەتانەی سامانی سروشتییان کەمە یاوەکو پێویست نییە، بنکەی ئابورییان لاوازو بنکە سیاسییەکەیان لەمەترسیدا دەبێت.

هەبوونی سامانی سروشتی هەمەجۆرو زۆرزەبەند، مانای هەبوونی بەرهەمو بەربوومی هەمەجۆرو بەو پێیەش مانای دابینکردنی پێداویستییە بژێوییەکانی دانیشتوان. کەمی سامانی سروشتی یا نەبوونی جۆرێك لەو سامانانەی راستەوخۆ پێوەندی بەدارایيو بژێوی دانیشتوانەوە هەیە، لەکاتی ئاشتیدا دەوڵەت چاو لەدەستی دەرەوەو، لەکاتیو بەتایبەتیش سەپاندنی ئابڵوقەدا، دەوڵەت شپرزەو لاواز دەکات. بۆیە هەبوونی سامانە سروشتیەکان، تۆکمەیی بنکەی ئابوریو لەویشەوە سەربەخۆیی سیاسی دەوڵەت، مسۆگەرو دەستەبەر دەکات.

سامانە سروشتییەکان جۆراجۆرن‌و لەڕووی گرنگییەوە جیاوازن، دەکرێت بەگشتی بۆ سێ بەش پۆلێن بکرێن، ئەوانیش:-

١-سامانە سروشتییەکانی سەرزەوی: کەپێوەندی بەشێوەو پێکهاتەی خاک‌و جۆری کەشوهەواو ئامادەیی ئەو خاکە بۆ کشتوکاڵ‌و رادەی بەپیتی‌و جۆری ئەو بەروبومانەوە هەیە کە پێویستییەکانی دەوڵەت لەبژێوی دانیشتوان دابین دەکات.

٢-سامانە سروشتییەکانی ژێرزەوی: ئەمیش ئەو کانزاو کانانە دەگرێتەوە کە دەشێت لەژێر خاکی وڵاتەکەدا هەبن. بەڵام زۆروزەبەندی سامانی ژێرزەوی پێوەندی بەچۆنێتی دەرهێنان‌و پاشانیش جۆری سامانەکەوە هەیە. بۆ نمونە بوونی نەوت، یا مادە بەنرخەکانی وەکو یۆرانیۆم‌و زێڕو ئاسن‌و مس، کاراییەکی گەورەیان بۆ سەر هێزی ئابوری دەوڵەت هەیە. بەپێچەوانەوە نەبوونی سەرچاوەیەکی گرنگی وەکو نەوت، دەوڵەت لەسەرچاوەیەکی گرنگی وزە بێبەش دەکات. بەڵام دیارە بوونی سامانی سروشتی بێ‌هەبوونی دەستی کاری پێویست‌و پسپۆڕو کادری هونەریی‌و تەکنەلۆجیای پێویست بۆ دەرهێنان‌و خستنەگەڕی ئەو سامانانە، دیسانەوە کار لەهێزی دەوڵەت دەکات‌و، بەپاشکۆو لاواز دەیهێڵێتەوە.

٣-سەرچاوەکانی ئاو: ئاو یەکێکە لەسامانە سروشتییە هەرە پێویستەکانی هەر دەوڵەتێك. بەڵام بوونی ئاو بەتەنیا مانای هێزی دەوڵەت ناگەیەنێت. بەڵکو بوونی سەرچاوەکانی ئاو لەناوخۆی خاکی دەوڵەتدا مەرجی سەرەکی هێزی دەوڵەتە لەو رووەوە.

ئەگەرچی بوونی سامانە سروشتییەکان یەکێك لەسێ پایە گرنگەکەی هێزی دەوڵەت پێکدەهێنێت، بەڵام بوونی ئەو سامانانە بەتایبەتیش بوونی نەوت‌و کانزا بەنرخەکان، زۆربەی جاران دەبنە مایەی چاوتێبڕینی دەوڵەتانی زلهێزو فراوانخوازو هەوڵدان بۆ داگیرکردن یا لەڕووی ئابورییەوە بەپاشکۆکردنی وڵاتانی خاوەن سامان.

## فەسلی دووەم

# سەرەتا تیۆرییەکانی جوگرافیای عەسکەری

### (١-٢-١): بنەما گشتییەکان[١٢]

١-جوگرافیای عەسکەری لقیکە لەلقەکانی جوگرافیای تەتبیقی، لەرووی شیوازو پیکهاتەوە لەجوگرافیای ئابوری دەچیت و لەزۆر رووەوە پیوەی پەیوەستە، هەرلەم سۆنگەوە دەشیت وەکو دامەزراوە ئابورییەکان بروانریتە دامەزراوە عەسکەرییەکان، بەو پییەش هەمان ئەو کۆسپە جوگرافییانەی لەبابەتی جۆرەکانی مادەو گواستنەوەو بیناکردن و بەکارهینانندا بۆ جوگرافیای ئابوری دینە پیش، بۆ جوگرافیای عەسکەریش بەهەمان شیوەن. جوگرافیای عەسکەری گرنگی بە پراکتیزەکردنی مەعریفەی جوگرافی دەدات لەبەرێوەبردنی کاروبارە عەسکەرییەکاندا. لەهەمان پێودانگەوە جەخت دەکاتەسەر هەندەسەی هەڵوێستە عەسکەرییەکان و کارایییەکانی مەوقع و دابەشبوونی ژینگە جیاجیاکان و دانیشتوان و هێزەکان و ئەو دیاردانەی تر کەپێوەندییان بەچالاکی عەسکەرییەوە هەیە، هەربۆیە دواجار رۆڵی گەورە لەوەرگرتنی بڕیاردا دەبینێت.

بەپلەی یەکەم جوگرافیای عەسکەری پێوەندی بەمەسەلەکانی ستراتیج و دیاریکردنی مەبەست یا ئامانجەکان و هەڵسەنگاندنی تواناکانی سەپاندنی هێزی چەکەوە هەیە. بەڵام لەمەسەلە تەعبەوییەکاندا جوگرافیای عەسکەری گرنگی بەکارایییەکانی ژینگە دەدات لەپێکهێنانی پرنسیپە عەسکەرییەکاندا.

٢-جوگرافیای عەسکەری گرنگی بەچوارچێوەی ژینگەیی دەدات... چوارچێوەی ژینگەیی هەموو فاکتەرو هێزە پێکەوە کارلێکردووانەن کە

لەشوێنکدا دەجوڵێن و دەتوانن کار لەتواناو کارایی هەر جۆرە چالاکیەك بکەن کە لەو شوێنەدا روودەدات. بڕی ئەم پێکهاتووە کارلێکردووانە لەڕووی چەندایەتی و چۆنایەتییەوە لە شوێنکەوە بۆ شوێنێکی تر دەگۆڕێن. هەر بۆیە جۆری پێکهاتەو چوارچێوەی ژینگەی ناوچە جیاجیاکان لەسەر ئاستی نەتەوەیی یان نێودەوڵەتی کار لەهێزی نەتەوە یان دەوڵەت دەکات. ئەم کارلێکردنەش لەڕێی ئەو خەسڵەتانەوە سەرهەڵدەدات کە بەهۆی نایەکسانی لەدابەشبوونی سەرچاوەکان و دانیشتوان و پەرەسەندنی ئابوری و سامانەکانی کارلێکەرانەوە دەبێت کە کار لەبەرهەمی کشتوکاڵی دەکەن، یان بەهۆی ئەو مەوقعە جوگرافییەی کە دەشێت دەوڵەتێك جیا لەدەوڵەتێکی تر پێوەی بنازێت.

لەبەرهەموو ئەوانە توانای دەوڵەت بۆ پشتیوانی کردنی ئامانجەکانی و بەرگریکردن لێیان، بەهەلومەرجە ژینگەییەکانەوە بەستراوەتەوە. لەهەمان پێودانگیشەوە بڕی تێچونی هەر جموجۆڵێکی عەسکەری و ئەنجامەکانیشی تاڕادەیەکی زۆر دیسانەوە پشت بە کارتێکەرەکانی ژینگە دەبەستێت.

بەکورتی تایبەتمەندییە ژینگەییەکان کار لەهێزی نەتەوەیی و رادەی بەکەڵکی یان بێکەڵکی دەزگا عەسکەرییەکان و پلەی کارایی هێزی عەسکەری و دواجار توانای دەوڵەت بۆ بەدەستهێنانی ئامانجە نەتەوەییەکانی، دەکەن.

٣-جوگرافیای عەسکەری بەهرەی پێشبینکردن بەرجەستە دەکات.. لەهەمان سۆنگەی خاڵی پێشووەوە، پێوەندییە جوگرافییەکان و هەلومەرجە ژینگەییەکانی دەوڵەتان و گۆڕەپانی جموجۆڵە عەسکەرییەکان، کارییان بۆ سەر سەپاندنی هێزی چەك لەلایەن دەوڵەتێکەوە بۆسەر دەوڵەتێکی تر هەیە. بۆیە هەر پلان دانانێکی عەسکەریی پشت ئەستوور بەجوگرافیای عەسکەری دەبێت لەسەرێکەوە گرنگی بەشوێنە جیاجیاکان و هەرێمە جیاوازەکان لەڕووی تایبەتمەندی و جیاوازییە سروشتی و کۆمەڵایەتییەکان و کارایی ئەو کارکردانە لەسەر بەڕێوەچوونی چالاکییە عەسکەرییەکان بدات و لەو سەرەکەی تریشەوە چارەسەری ئەو تەنگژە عەسکەرییانە بکات کە لە ناجۆری و جیاوازی ئەو ناوچانەوە سەرهەڵدەدەن.

ئەگەرچی جوگرافیای عەسکەری ناتوانێت بەتەنیاو بێ پەنا بردنەبەر لقەکانی تری جوگرافیا پاڵپشتی سیاسەتێکی تایبەت یان جەنگێك بکات بەڵام زۆرێك لەو زانیارییانە دەخاتەڕوو کە ئەنجامدانی هەریەکێك لەو چالاکییانە

دەشیت تیی بچیت‌و، ئەو ئامانجانەی دەشیت بەدەست بهینرین‌و پاشانیش ئەو خۆسازدانەی پیویستە لەئارادان بن. بەوپییە جوگرافیای عەسکەری لەسەریکەوە کۆت‌و بەند بۆ هەر کاریکی عەسکەری دادەنیت‌و، لەو سەرەکەی تریشەوە دەبیتە هەوینی ئەو هونەری‌و ململانییەی کەپیی دەوتریت جەنگ. چونکە بیروبۆچوونەکانی جوگرافیای عەسکەری پیوەندییان بەلایەنەکانی عەقیدەو پلان دانان‌و ئیستخبارات‌و ئیسنادەوە هەیە.

٤-خەسلەتەکانی ژینگەی کۆمەلایەتی‌و سیاسی لەپیوەندییەکی تیکچرژاودا کارایی گەورە لەسەر پیوەندییە مەدەنی عەسکەرییەکان جیّ دەهیلن.

ئارەزووە نەتەوەییەکان ئامانجە نەتەوەییەکان فراژوو دەکەن‌و ئاقاری ستراتیجی نەتەوەیی دیاردەکەن، تایبەتمەندییەکانی گۆرەپانی جموجۆلە عەسکەرییەکانیش کاراییان لەسەر ریکخستن‌و جبەو مەشقی هیزە چەکدارەکان‌و کاروبارە ئیدارییەکان هەیە. هەرلەهەمان پیودانگەوە گۆرەپانی شەر کار لەجۆری خۆسازدان دەکات، پاشانیش ئالوگۆرە بەردەوامەکانی تەکنەلۆجیا گۆران لەهەلسەنگاندنی عەسکەریی هەلومەرجە جوگرافییەکاندا دیننە ئاراوە.

تیکرای ئەم کارتیکەرە ئالۆزو هەمەرەنگانەی سەر چالاکییە عەسکەرییەکان کاریگەرییەکانی ژینگە لەسەر توانای پشتگیری‌کردنی سیاسەتی نەتەوەیی پیشان دەدات‌و هەر بەوپییەش جوگرافیای عەسکەری رۆلیکی بەرچاو لەخەملاندنی توانای ستراتیجییدا وازی دەکات، بەمەش جوگرافیای عەسکەری بەشداری لەبابەتی جیۆپۆلەتیکدا دەکات.

٥-لەسەر ئاستی ستراتیجی نەتەوەیی‌و بەشیوەیەکی جوزئی هەر هەلسەنگاندنیکی هیزی نەتەوەیی پشت بەبەکارهینانی جوگرافیای عەسکەری دەبەستیت. لەرووی ئامانجە گشتییەکانەوە جوگرافیای عەسکەری لە هیندیّ ئاستی بالای جوگرافیای سیاسی نزیك دەبیتەوە. ئەم پیوەندییەش دەبیتە مادەی ستراتیجی نەتەوەیی‌و، جۆری ئەو کارلیکە دینامیکییەی نیوان هیزە نەتەوەییەکان ئاشکرادەکات کە بە جیۆپۆلەتیکەوە پیوەندارن.

٦-لەمیانەی هەلچونی بەرژەوەندی نەتەوەییدا، جیاکردنەوە لەنیوان کارە دیبلۆماسی‌و عەسکەرییەکاندا، کاریکی بیهودەیە. دەبیت دیبلۆماسیەت پشتیوانی کردنی کاریگەرانەی سیاسەت‌و ئامانجە نەتەوەییەکان مسۆگەر

بكات. هێزی دیبلۆماسی‌و عەسكەری دووكەرەستەی پێكەوە گرێدراوون بەسیاسەتی نەتەوەییەوە، بەشێوەیەك كەناكرێت لێكدی جیابكرێنەوە. چونكە هەرەشەكردنی چەكدارانە دوا كاركردە كە پشتیوانی كاری دیبلۆماسی دەكات. ئەو دیبلۆماسیەتەی كە بەهێزێكی فیعلی پاڵپشت نەكرێت، ناوەرۆكێكی بەتاڵی هەیە. بۆیە توانای عەسكەری سەپاندنی هێزی چەك لەشوێنی لەبارو گونجاودا بناغـەی پشـتیوانی كردنـی هـەر دیبلۆماسـیەتێكی سـەركەوتووە. بەپێچەوانەشەوە، دەكرێت كاری دیبلۆماسی تارادەیەكی زۆر پشتیوانی هێزی عەسكەری بێت.

ئـەركی جوگرافیـای عەسـكەری لـەم پێوەندییـەدا بەشـداریكردنە لـە هەڵسەنگاندنی نەخشەو ئامانجە ستراتیجی‌و تواناكانی دەوڵەت لەسەر ئاستە جیاجیاكـانو، بـەدواداچوونی لێبراوانـە لەخزمـەتی بەرژەوەندییـە نەتەوەییەكاندا.

٧-جوگرافیـای عەسـكەری لـەریی سێ‌جۆر لێكۆڵینـەوەوە تیۆریزەكـراوە، ئـەوانیش: لێكۆڵینـەوە سیسـتماتیكییەكانو، لێكۆڵینـەوە بابەتییـەكانو، لێكۆڵینەوە هەرێمییەكانە.

جـۆری یەكـەمی لێكۆڵینـەوەكان ئامـاژە بـۆ پراكتـیزەكردنی زانسـتە سیسـتماتیكییەكان دەكـات لـەكاروبارە عەسـكەرییەكاندا. زانسـتە سیستماتیكییەكانیش سەرجەم زانستە سروشتییەكانو زانستە مرۆییەكانە كە پەیوەندییان بە جوگرافیـاوە هەیـە، مۆرفۆلۆجیـا، ئـەتنۆگرافیا، رووەكناسـی، زانستی سیاسەت... دەگرێتەوە.

جۆری دووەم لەلێكۆڵینەوەكان، ئەو لێكۆڵینـەوە بابەتییانـەن كـە پێوەنـدی نێوان كەشوهەوا بەسەربازەوە، توانای خاك بۆ هاتوچۆ، ئەولایەنە جوگرافـی‌و ژینگەییانە دەگرێتە خۆ كەهێزی نەتـەوەییان لەسـەر بنیـات دەنرێـت. لەهـەمان كـاتدا دەسـت بـۆ هـەموو بوارەكـانی خـۆ سـازدانو كاروبـارە ئیدارییـەكانو هەمووشێوەكانی جەنگ دەكوتێت.

بـەكورتی ئـەم جـۆرەی لێكۆڵینـەوە جوگرافیـای عەسـكەری، هـەموو ئـەو جیاوازییانە رەچاو دەكات كەژینگە دەیخولقێنێتو هەڵسەنگاندنی تایبـەتییان بـۆ ئـەنجام دەدات. بۆیـە لـەم رووەوە جوگرافیـای عەسـكەری رۆڵـی پێكـەوە گرێدانی جوگرافیا سیستماكی‌و زانستە عەسكەرییەكان وازی دەكات.

جۆری سێیەمیش کە لێکۆڵینەوە هەرێمییەکانە، وەکو یەکخەری هەموو لایەنە جوگرافیا جیاجیاکانی هەرێمێکی عەسکەری تایبەت، یان یەکێك لەگۆڕەپانەکانی جموجۆڵی عەسکەری کاردەکات. بۆ ئەم بەبەستەش پێویستە لەیەکێك لە هەرێمە تایبەتەکان. لەهەلومەرجێکی تایبەتدا، جوگرافیای عەسکەری تیۆرییەکانی خۆی پراکتیزە بکات.

بەشێوەیەکی گشتی، ئەو خاڵانەی لەمەوپێش باسکران گرنگترین ئەو سەرەتا تیۆرییانەن کە دەکرێت لێیەوە لە جوگرافیای عەسکەری بکۆڵرێتەوە. ئێستا دەتوانین ئەو بوارانەی کە جوگرافیای عەسکەری کاریان تێدەکاتو کاریان پێدەکات، بەکورتی لەم بوارانەدا کۆبەندییان بکەین:-

١-چوارچێوەی ژینگەیی (سروشتی)و پێوەندی گەورەی بەجموجۆڵی عەسکەرییەوە.

٢-شیکردنەوەی جیۆپۆلەتیکانەی توانا ستراتیجییەکان، بەتایبەتیش لەبواری ستراتیجی عەسکەریدا.

٣-پرۆسەکانی ستراتیجی عەسکەریو پلان دانان بۆیان پێبەپێی دەستخستنی ئەو زانیارییانەی لەسەرەوە باسکران.

٤-خۆسازدان، بەتایبەتی ئەوەی پێوەندی بەلایەنی سروشتی گۆڕەپانی جموجۆڵی عەسکەرییەوە هەیە کە کەشوهەواو تۆبۆگرافیاو بارودۆخی رووبەرە ئاوییەکانو ئینجا پێکهاتەی شارستانیو بونیاتیو کۆمەڵایەتی دەگرێتەوە.

٥-سازدانی سەرچاوەو تواناکانو خزمەتگوزارییەکانی گواستنەوەو گەیاندنو کاروبارە نوژداریو سەرجەم پێداویستییەکانی تر.

٦-خۆشکردنی کەشی ناوخۆ لەخزمەتی حکومەتو بەرگری مەدەنیو هاوپشتی میللیدا.

٧-خستنەگەڕی بەهرە تەکنەلۆجیا بەردەستەکان لەبورەکانی جموجۆڵو چەکسازیو کۆنترۆڵو بەهرەی پیاراگەیشتنیان لەکاتی پێویستدا

٨-گرێدانی تایبەتمەندییەکانی ژینگەی جوگرافی لەگەڵ تایبەتمەندییە عەسکەرییەکاندا.

٩-بەکارهێنانی میتۆدە جیۆپۆلەتیکییەکانو بەشێك یان هەموو ئەو تیۆرییانەی سەر بەجیۆپۆلەتیك، کە لەبواری جەخت کردنە سەر سیاسەتی بیناکردنی هێزی زاتیدا، گونجاوو لەبارن[١٢]

## (١-٢-٢): لقە پێکهێنەرەکانی جوگرافیای عەسکەری

زانستی جوگرافیا لەکاتی سەرهەڵدانیدا زانستێکی وەسفی بوو، بەڵام پێ بەپێی پەرەسەندنی بوارەکانی تری زانست، جوگرافیاش پەرەی‌سەندوو لە زانستێکی وەسفییەوە بووبە زانستێکی شیتەڵکاری پێشبینەکەر. ئەم پەرەسەندنە لەپاشاندا جوگرافیای عەسکەریشی گرتەوەو، لەبری ئەوەی ئەم لقەی جوگرافیا گرنگی سەرەکی هەربە مۆرفۆلۆجیاو کەشوهەوا بدات، گرنگی بەلێکۆڵینەوەی باری کۆمەڵایەتی‌و ئابوری‌و سیاسیش‌دا.

بەوپێیەو هەروەکو پێشان لەبەشی یەکەمی ئەم فەسڵەدا باسمانکرد، جوگرافیای عەسکەری بەپلەی یەکەم پێوەندی بەمەسەلەکانی ستراتیج‌و دیاریکردنی مەبەست یا ئامانجەکان‌و هەڵسەنگاندنی تواناکانی سەپاندنی هێزی چەکەوە هەیە، بەڵام جوگرافیای عەسکەری بۆ لەمەسەلەکانی ستراتیج پەلی بۆ هەردوو لایەنی خۆسازدان‌و کاروبارە ئیداری‌و مەدەنیەکانیش کوتا، لەمەسەلەکانی خۆسازداندا جوگرافیای عەسکەری گرنگی بەکاراییەکانی ژینگە دەدات لەپێکهێنانی پرەنسیپە عەسکەرییەکاندا. بەڵام سەبارەت بەکاروبارە ئیداری‌و مەدەنیەکان، جوگرافیای عەسکەری ئەوەی ئاشکراکرد کەبەردەوامبوونی ئاسوودەیی ئابوری‌و سیاسی لەنێوان دانیشتواندا، کارایی گەورەی بۆ سەر هەر هەڵوێستێکی عەسکەری هەیە. بۆیە پێویستە کەهێزە چەکدارەکان گرنگی بەکاروبارە ئیداری‌و مەدەنیەکان بدەن.

بەشێوەیەکی گشتی، جوگرافیای عەسکەری لەسێ لقی سەرەکی پێکدێت، کە بریتین لە:-

یەکەم: جوگرافیای ستراتیجی.

دووەم: جوگرافیای تەعبەوی.

سێیەم: جوگرافیای ئیداری[١٤]

بۆ زۆرتر ئاشنابوون بەهەریەکێك لەو سێ لقە، هەوڵدەدەین لەهەریەکەیان بەجیا بکۆڵینەوە.

## یەکەم/ جوگرافیای ستراتیجی

پێش ئەوەی بچینە سەر باسکردنی تانۆپۆکانی جوگرافیا ستراتیجی، پێویستە لەچەمکی ستراتیجی لەڕووی سەرهەڵدانی مێژوویی و گۆڕانکارییەکانی ئەو چەمکەو پێناسە جیاجیاکانی بکۆڵینەوە.

وشەی ستراتیجی لەبنەڕەتدا لەوشەی ستراتیجوس Strategos کەمانای گشتی General و لەیۆنانیدا مانای (سەرکردە) دەگەیەنێت، هاتووە. بۆیە هێندێک بە (زانستی سەرکردایەتی)و، هێندێکیتر بە (هونەری سەرکردایەتی)یان چوواندووە.

لەسەدەی نۆزدە بەدواوە، سەرکردە عەسکەرییەکان گرنگییەکی زێدەتریان بەستراتیج دا، لەسەر دەستی جەنەراڵی ئەڵمانی (کلاوتزە فیتز)دا ستراتیج بەتایبەتیش ستراتیجی عەسکەری، مانای زانستیی خۆی وەرگرت. کلاوتزە فیتز ئاوەها پێناسەی ستراتیجی کردووە: ستراتیج هونەری سازدانی شەڕە، یا نەخشەی گشتی شاڵاوێکی سەرتاسەری عەسکەرییە. هەرلەهەمان سۆنگەوە کلاوزە فیتز جێبەجێکردن و ڕێوشوێنی بەڕێوەبردنی شاڵاوەکەشی بە (تاکتیک) ناوبرد[١٥]

پێبەپێی پەرەسەندنی شێوازەکانی جەنگ، چەمکی ستراتیجی پەرەی‌سەندو بواری زۆرتری گرتەوە. لەساڵی (١٩٠٢ز)دا نامیلکەی (مەشقی هاوبەش)ی بەریتانی ئاوەها پێناسەی ستراتیج دەکات: ستراتیج هونەری پلان دان و سەرپەرشتیکردنی شاڵاوە. بەڵام (لیدڵ هارت) پێی وایە ستراتیج هونەری بەکارهێنانی هێزە عەسکەرییەکانە بۆ بەدەست هێنانی ئەو ئامانجانەی کەسەرکردایەتی سیاسی داینــاون. (ئەندرێی پۆفەر)یش دەڵێت: ستراتیج هونەری بەکارهێنانی هێزە تا گەورەترین بەشدرای لە بەدەست هێنانی ئەو ئامانجانەدا بکات کە سیاسەت داینــاوە. (ڤۆن مۆلیتکە) هەموو ئامانجەکانی تاکتیك وەك ئاتاجی ستراتیج لێکدەداتــەوەو دەڵێت: ستراتیج لەمیانەی

سەرکردایەتیکردنی سوپاو چڕکردنەوەی هێز لەگۆڕەپانی شەڕدا، دەرفەتی دەست وەشاندن بۆ تاکتیك دەرەخسێنێت، بەڵام لەبەرامبەردا ستراتیج بەرئەنجامەکانی هەموو پێکداهەڵبژانێك (تاکتیك)ێك، لەئەستۆدەگرێت (ماوتسی تۆنگ) بەشێوەیەکی سەراپاگیرو هەمەلایەنە پێناسەی ستراتیج دەکات و دەڵێت: ستراتیج لێکۆڵینەوەی سەرلەبەری یاساکانی جەنگە[١٦]

لەدوای جەنگی دووەمی جیهانیەوە، تانۆپۆکانی ستراتیج هەموو بوارە سیاسیو ئابووریو کۆمەڵایەتیەکانی گرتەوە. ئیتر هەر لەو کاتەشەوە ستراتیج نەك هەربووە یەکێك لەکەرەستەکانی سیاسەت، بەڵکو بووە پاشکۆشی. بۆئەوەی باشتر لەتانۆپۆکانی ستراتیج تێبگەین، دەشێت ستراتیج بۆ ئەم چەند خاڵە کۆبەند بکەین:-

١-دوای دیاریکردنی ئامانجی سیاسی، ستراتیج چارەسەری ئەو مەسەلانە دەکات کەئامانجە سەرەکیەکەی پێ بەدەست دەهێنرێت. بەم پێیە ستراتیج پردی نێوان ئامانج و بەدەست هێنانی ئامانجە لەرێی پراکتیك و جێهێشتنی مەسەلە لاوەکییەکان بۆ خۆسازدان (تەعبیئە). کەوابێت گۆڕەپانی ستراتیج گۆڕەپانی جەنگە بەتانۆپۆ جیاجیاکانیەوە.

٢-لەومەسەلە جیاجیانەی کەدەبنە هۆی بەدەست هێنانی ئامانج و لەنێو ئەوانەشدا رستێك لەوکێشانەی کە ستراتیج چارەسەریان دەکات:-

أ-تیۆری بەکاربردنی شەڕ بۆ بەدەست هێنانی ئامانج.

ب-تیۆری پرۆسێس و خۆسازدانی هێزی چەکدار.

پ-تیۆری بیناکردنی هێزی چەکدار.

ت-پلان دانان و سەرپەرشتیکردنی شاڵاو.

ج-کارکردە عەسکەریی و مەعنەوییەکان و خۆسازدانی سیاسییانە.

چ-سەرکردایەتی هێزە چەکدارەکان.

ح-تاقیکردنەوەی ئامانجە یەکلاکەرەوەکان.

خ-گرتنەبەری کارکردە دژەکان بەرامبەر ستراتیجی دوژمن.

د-جەختکردنە سەر ئەوەی بە سەرلەبەریی جەنگ ناودەبرێت.

٣-ستراتیجێکی نەگۆڕ نییە بەکەڵکی هەموو کات و شوێنێك بێت.

٤-ئەرکی ستراتیج بەدەستهێنانی ئامانجی سیاسییە[17]

شان بەشانی ستراتیج، یەکێك لەو توخمە گرنگانەی‌تر کە جوگرافیای ستراتیجی دەیکاتە بنەمای کارکردنی، ستراتیجی نەتەوەییە. گەر ستراتیجی نەتەوەیی. هونەرو زانستی گەشەپێدان‌و خستنە خزمەتی هێزە سیاسی‌و ئابوری‌و سایکۆلۆجییەکانی دەوڵەت بێت لەکاتەکانی ئاشتیداو شان بەشانی هێزە چەکدارەکان بۆ بەدەست هێنانی ئامانجە نەتەوەییەکان، ئەوا جیاوازی نێوان ستراتیج‌و ستراتیجی نەتەوەیی وەکو جیاکردنەوە وایە لەنێوان سیاسەت‌و پلانی کاری سیاسییانە، یالەنێوان حکومەت‌و دەسەڵاتی جێ‌بەجێکردندا. چونکە دامەزراوە عەسکەرییەکان لەبنەڕەتدا پاشکۆو لەخزمەتی مەدەنیدان.

ئەو ڕێوشوێنانەی کە بەهۆیەوە ئامانجەکانی ستراتیجی نەتەوەیی بەدەست دێت، چوارشێوازن کە بریتین لە:-

١-چارەسەکردنی بەئاشتیانەی کێشەکان (بەرێگەی دیبلۆماسی).

٢-فشاردانانی ناڕاستەوخۆ.

٣-رەفتاری دوژمنکارانە.

٤-جەنگ[18]

هەموو ئەم ڕێوشوێنانەی کە دەوڵەتێکیش لەبەردەستی دایە دواجار پشت بەو لێکۆڵینەوانە دەبەستن کە جوگرافیا لە میانەی زانیاری وردو سەراپاگیر دەربارەی شارو کارگەو کۆمەڵەو تایەفە ئایینییەکان‌و حیزبە سیاسییەکان‌و، ئینجا کارایی ژینگە لەدانانی پلانی عەسکەریدا، گەڵاڵەی دەکات.

جوگرافیای ستراتیجی گرنگی دەدات بەهێزی دەوڵەت بۆ خستنەگەڕی ئەو هێزەو توانای سەپاندنی لەبۆنەو شوێنی دیاریکراودا. هەربۆیە جوگرافیای ستراتیجی پەیوەندی گەورەی بەچەمکی ئاسایشی نەتەوەییەوە هەیەو پێوەی پێوەستە. چونکە بنەماکانی ئاسایشی نەتەوەیی هەر دەوڵەتێك کە لەسەر توخمەکانی ئاسایشی ناوخۆ، ئابوری نیشتمانی‌و، توانای عەسکەری وەستاوە. لەپێوەندییەکی چڕوپڕدا بە جوگرافیای ستراتیجییەوە بەستراونەتەوەو بەدەستهێنانی ئەو توخمە سەرەکییانە، مانای بەدەستهێنانی بەرژەوەندییە نیشتمانییە باڵاکان دەگەیەنێت.




لەبواری عەسکەریدا، جوگرافیای ستراتیجی جوگرافیای پلانە جەنگییەکانو پلانی شاڵاوو جموجۆڵە عەسکەرییەکانە. لەبەر ئەوەی بەشێوەیەکی گشتی جوگرافیای عەسکەری گرنگی بەگەشەپێدانی پلانە ناوبراوەکان دەداتو پێوەندی گەورەی بەهەندەسەی جموجۆڵە عەسکەرییەکانو ژینگەی گۆڕەپانی جموجۆڵو سەرچاوەو ئامرازەکانو ئیسنادەوە هەیە، لەبەرئەوە لەبواری عەسکەریدا جوگرافیای ستراتیجی بە جوگرافیای پلانە عەسکەرییەکان دادەنرێت.

بەم پێیە جوگرافیای ستراتیجی لێکۆڵینەوەیەکی پێشهاتە ئامێزە کە گرنگی بە پێشبینی کردنی کارایی ئەو قورساییە دەدات کەچالاکییە وەهمییەکان لەسایەی هەلومەرجێکی گریمانەویدا، دەکەوێتە سەریان.

جوگرافیای ستراتیجی شەش کایەی سەرەکی دەکاتە بنەمای کۆڵینکارییەکانی خۆی، ئەوانیش:-

١-بەهرەی پێڕاگەیشتن: کەئازادانە هەڵبژاردنی ڕێگاوبانو جموجۆڵو بەربەستەکانو ڕێگاکانی پێڕاگەیشتن، دەگرێتەوە.

٢-بەهرەی جموجۆڵ: سەرجەم توانای جموجۆڵ دەگرێتەوە، خێرایی پێشڕەویکردنو ئازادانە هەڵبژاردنی سیستەمەکانی گواستنەوەو کارایی وەرزە جیاجیاکانو... هتد. بەهرەی جموجۆڵ کە نەرمو نیانی جموجۆڵ دەگرێتەوە، جگە لەپشت بەستنی بەئاراستەی جموجۆڵەکان، ڕێکخستنی جموجۆڵو ئەوەی کەنیاز وایە بگوێزرێتەوە، دەگرێتەوە.

٣-بەهرەى بینین: سەرەڕاى ئەو كۆسپانەى كە شێوەكانى رووى خاك‌و كەشوهەواو ئەو كۆسپانەى كە دەستكردى مرۆڤ خۆیین، بەهرەى بینین، تواناى بینین لەسەر هەردوو ئاستى ئاسۆیی‌و شاولی‌و تواناى هەست پێكردن، دەگرێتەوە.

٤-بەهرەى پێوەندیكردن: ئەمەیش مانای تواناى گەیاندنى زانیارى دەگرێتەوە. بەوپێیەى كۆسپەكانى كەشوهەواو زریان‌و شێوەكانى رووى خاك كارایى خۆیان بەسەر سیستەمەكانى گەیاندنەوە جێ‌دەهێڵن، بۆیە بەهرەى پێوەندیكردن رادەى بەكەڵكى یان بێ‌كەڵكى سیستمى پێوەندیكردن‌و بەردەوامبوونیشى دەگەیەنێت.

٥-بەهرەى هەبوون‌و بەدەستەوە هاتن: ئەم بەهرەیە بەرجەستەبوونى هێزى مرۆیی‌و چۆنێتى خۆ چەكداركردن‌و گواستنەوەو دامەزراندنى پێشوەختەو لایەنەكانى‌ترى ئیسنادى مادى، دەگرێتەوە.

٦-بەهرەى رووبەڕووبوونەوەى مەترسى: ئەم بەهرەیەش هەموو ئەو كاركردنە لەخۆدەگرێت، كەدەشێت بۆ پاراستنى سەروسامانى دانیشتوان‌و تاكەكانى كۆمەڵ‌و دامەزراوە مەدەنی‌و عەسكەرییەكان‌و رێگاكانى هاتوچۆ بگرێتە بەر. پاشانیش پاراستنى دانیشتوان لەشێوە جیاجیاكانى وێرانكاریی‌و پڕوپاگەندەو كارەساتە چاوەڕوان نەكراوەكان[٢٠].

لەڕوانگەى جوگرافیاى ستراتیجییەوە، هەر ناوچەیەك گۆڕەپانێكى جموجۆڵى عەسكەرى تایبەتییە، بۆیە بۆ هەڵسەنگاندنى ستراتیجییانەى هەر ناوچەیەك وەكو یەكێكى‌تر لەبوارەكانى كاركردنى جوگرافیاى ستراتیجى ئەم سێ‌لایەنە دەكرێنە بنەما:-

١-ئامانجەكان: بەوپێیەى كەئامانجە ستراتیجییەكان لەدەورى یەك تەوەرە كۆدەبنەوە، چڕكردنەوەى هەموو ئامانجەكان‌و دەستنیشانكردنیان لەو تەوەرەیەدا، لەبەشێكى زۆریدا مانای بێبەشكردنى دوژمنە لەسەربەستى كاركردن‌و جموجۆڵ.

٢-ئاڕاستە سازەكان: ئاڕاستە سازەكانى جوگرافیاى ستراتیجى روو لەو شوێنانەن، كە جموجۆڵیان تێدا چڕبۆتەوە.

٣-كۆسپەكان: بەهۆى كۆسپەكانەوە زۆر ناوچە پشت گوێ دەخرێن.. كۆسپەكان لەشوێنێكەوە بۆ شوێنێكى تر دەگۆڕین. بۆیە هیچ كۆسپێك رەهاو

تاسەر نییە. بارودۆخەکانی کەشوهەواو جۆرەکانی جیۆرمۆفۆلۆجیاو هێزی دوژمن لەپاراستنی یەکێك لەناوچەکاندا، نمونەی کۆسپە جیاجیاکانن.

زانینی رووی خاکی هەر گۆڕەپانێکی جموجوڵ و وەسفکردنی، بەشێکی گرنگی دەستنیشانکردنی کۆسپەکان بەرجەستەدەکات. وەسفکردنی رووی خاکی هەر گۆڕەپانێکی جموجۆڵیش چوار لایەن لەخۆدەگرێت، رووەك، جیۆمۆرفۆلۆجیا، پێکهاتەکانی رووی خاك، ئەو دیاردانەی لەئەنجامی کاری مرۆڤەوە دروست بوون. جگە لەم بەشانە وەسفکردنی رووی خاکی گۆڕەپانی جموجۆڵ هێندێك دیاردەی تری وەك دیاردەی هیدرۆلۆجییەکان و دیاردەی گواستنەوەو هێزە مرۆییەکان و سۆسیۆلۆجیاو سیاسەت و ئابوری و سایکۆلۆجیاش، لە خۆدەگرێت.

دواجار پێویستە ئەوە بزانرێت، کەجوگرافیای ستراتیجی لەهەر سێ جۆری جوگرافیای جەنگی وشکایی، جەنگی دەریایی، جەنگی ئاسمانی، دەکۆڵێتەوە[21]

## دووەم/ جوگرافیای تەعبەوی

خۆسازدان (یان ئەوەی بەعەرەبی پێ‌دەوترێت تەعبیئە)، لە کورترین پێناسەیدا هونەری رێکخستنی هێزی شەڕکەرە. خۆسازدان مانای بەشداری پێکردنی تیمە شەڕکەرەکانە لەجەنگێکدا، بەوجۆرەی کەسەرکردایەتیکردن و مناوەرە پێکردنی لەڕووی رێکخستنەوە، ئاستێکی بالا لەتواناو سەرکەوتنی عەسکەری بەدەست بهێنێت. لەهەمان کاتدا خۆسازدان پێوەندی بەپراکتیزەکردنی بنەماکانی پرۆسێسە عەسکەرییەکانی وەکو جموجوڵ لەکاتی رووبەڕووبوونەوەی دوژمنداو بلاوەپێکردن و بەکارهێنانی جۆرە جیاجیاکانی چەکەوە، هەیە. بۆیە هەر پێناسەیەکی خۆسازدان، پێویستە ئاماژە بۆ پێکداهەڵپژانی فیعلی بکات.

خۆسازدان سیستمەکانی مناوەرە دەگرێتەوە. کە گرنگترینیان ئەم شەشە پۆلەن:-

١-پاراستن.

٢-هێرش بردن.

٣-جموجۆڵ، کە بلاوەپێکردن و مناوەرەو مەفرەزەی گەڕۆك دەگرێتەوە.

٤-هەڵکوتانە سەر، کەدانانی بۆسەش دەگرێتەوە.
٥-گواستنەوە.
٦-پتەوکردن و پشتیوانی کردنی هەڵوێستی عەسکەری[٢٢]

پێویستە جیاوازی بکرێت لەنێوان خۆسازدان و جوگرافیای تەعبەویدا، جوگرافیای تەعبەوی، جوگرافیای گۆڕەپانی جەنگە کە فاکتەرە جوگرافییەکانی خودی جەنگەکە دەگرێتەوە، هەندەسەی ڕێکخستنی تیمە شەڕکەرەکان و ڕێژەی جموجۆڵ و ئاقاری جموجۆڵەکان و چۆنیەتی ئیسنادو گواستنەوەو پێوەندیکردن و شیکردنەوەی ژینگەی سروشتی کۆمەڵایەتی گۆڕەپانی جەنگ، لەخۆدەگرێت.

جوگرافیای تەعبەوی پێوەندی بەهەزارو یەك چالاکی جیاجیاوە هەیە، کە بەڕێوەبردنی گشتی جموجۆڵەکانی جەنگ، هەر لەمناوەرەو بڵاوەپێکردن و سەربازگەو ژێرزەمین و چۆنیەتی خۆحەشاردانەوە، تا ئەو دامەزراوانەی دەکەونە سەر رووی زەوی و دابەشبوونی کاریتەو کۆسپە جیاجیاکان و ئاستەکانی بینین و هێزی تەقەکردن و.... هتد، دەگرێتەوە. بەدەستهێنانی ئامانجی کۆتایی جوگرافیای تەعبەویش پشت بەپێوەندی نێوان ژینگەو ئەو ئەرکەی کە نیاز وایە بەدەست بهێنرێت، دەبەستێت. بۆیە گەوهەری جوگرافیای تەعبەوی خۆی لەهەڵسەنگاندنی ئەو فاکتەرانەی شوێن و ژینگەدا دەبینێتەوە، کە کاراییان بۆ سەر جموجۆڵ و بەکارهێنانی چەك، هەیە.

دەتوانین بواری کۆڵینکارییەکانی جوگرافیای تەعبەوی، بۆ سێ کایەی سەرەکی دابەش بکەین، ئەوانیش[٢٣]:-

١-توخمە تەعبەوییەکانی رووی خاك

لایەنەکانی جوگرافیای تەعبەوی، پێوەندی گەورەیان بەجیاوازی ناوچە جیاجیاکانەوە هەیە... دەکرێت ئەو ناوچانە لەرووی جوگرافییەوە بۆ دوو پۆلی سەرەکی دابەش بکرێن، یەکەمیان ئەو ناوچانەیە کە کۆت و بەند بۆ جموجۆڵ دادەنێن، دووەمیشیان ئەو ناوچانەن کە یارمەتی سەربەستانەی جموجۆڵ دەدەن.ناوچەکانی یەکەم بەناوچەکانی پێشڕەویکردنی خاوو بەرەی چەسپاو ناسراوون، بەڵام ئەوانەی دووەمیان بەناوچەکانی جەنگی بزۆك.

سروشتی خاك لەپرۆسێسە تەعبەوییەکانی جەنگە گەورەکاندا، کاریگەریی و رەنگدانەوەیەکی راستەوخۆی هەیە. چونکە لەکاتێکدا رووبارو

دەریاچەو دارستان و چیاکان پەکی جموجوڵ دەخەن، دەشتەکان رووبەرێکی فراوان بۆ جموجوڵ دەڕەخسێنن. بەشێوەیەکی گشتی جیۆمۆرفۆلۆجیا کارایی خۆی بەسەر ئەو کارانەی لەجۆری هێرشبردنن، جێدەهێڵێت. بۆ هێرش و بەرگریش، خاکی رووتەن و رووتەخت جیاوازییان هەیە لەگەڵ خاکی بەکەندو کۆسپ. لەکاتێکیشدا جێگەی بەرزەکان وەکو خاڵی بەرگریکردن و چاودێریکردنی دوژمن بەکار دەهێنرێن، شیوو دۆڵ و دارستانەکان بۆ خۆحەشاردان و پەکخستنی پێشڕەویکردنی ماشێنی جەنگی سوودیان لێ وەردەگیرێت. پاشان خاکی رووتەخت بواری هێرشبەر بۆ دزەکردن و خۆ حەشاردان ناهێڵێتەوەو، لەهەمان کاتیشدا توانایەکی گەورەتر دەبەخشێتە بەرگریکەر بۆ مناوەرەو بەرگریکردنی بزۆك. کەندو کۆسپە سروشتییەکانیش لەکاتی بەرگری و پاشەکشێکردندا وەکو بەربەستێك بۆ پاراستنی قۆڵە جیاجیاکان، سودی گەورەیان لێوەردەگیرێت. ئەمە سەرەڕای کەپووەکی خۆڕسکیش لەبەربەست دانان و شاردنەوەی ماشێن و تیمە شەڕکەرەکان و پەکخستنی جموجوڵدا رۆڵی گەورەیان هەیە.

٢-توخمە تەعبەوییەکانی کەشوهەوا

بارودۆخی کەشوهەوا کارایییەکی راستەوخۆو ناڕاستەوخۆی لەسەر جموجۆڵە عەسکەرییەکانی هەیە. هەر توخمێکیش لە توخمە جیاجیاکانی کەشوهەوا، کارایی تایبەتی خۆی هەیە. چونکە بەرزی و گەرداوو زریانەکان، هەریەکە بەجیا کار لە جموجۆڵی عەسکەری لەهەردوو باری بەرگریکردن و هێرشبردندا، دەکەن. بەرزی و نزمی پلەکانی گەرما، کاراییان لەسەر چالاکییەکانی مرۆڤ و ئاستی بینین و بەتوانایی خزمەتگوزارییەکان هەیە. لەکاتێکدا بەرزی پلەکانی گەرما چالاکییەکانی مرۆڤ سست دەکات، بەهەمان شێوە نزمبوونەوەی زۆری پلەکانی گەرماش کەدەبنە مایەی باران و بەفرو زوقم، کار لە جموجۆڵ دەکەن.

هەروەها تووندە با کارایی زۆری بۆ سەر ئاقاری هاویشتنی گوللە تۆپ و رۆکێت و بلاوبوونەوەی گازە ژەهراوییەکان و تۆزو گەردە ئەتۆمییەکان و کەوتنەوەی پەڕەشوت هەیە. گەرداوو زریانیش ئاستی بینین کەم دەکەنەوەو بەلەم و پاپۆڕو فرۆکە رووبەڕووی مەترسی تێشکان و، هێندێک جار دامەزراوەکانی سەرزەمینیش دووچاری وێرانکاریی دەکەن.

٣-توخمە تەعبەوییەکانی خەسلەتە شارستانییەکان

خانوبەرەو بینا جیاجیاکان و گریکانی هاتوچۆو مەلبەندەکانی بەرهەمهینان و خزمەتگوزارییەکان، ئەولایەنانەن کە گرنگی پیدانیان لەرووی پاراستن، یان هیرشکردنە سەریان، دەکەویتە ئەستۆی جوگرافیای تەعبەوییەوە.

بەشیوەیەکی گشتی سەرجەم شارو شارۆچکەکان وەکو ئامانجیکی عەسکەریی حسابیان بۆ دەکریت ئەگەر هاتوو مەلبەندیکی گرنگی دانیشتوان، یان مەلبەندیکی پیشەسازی، یاخود مەلبەندیکی گرنگی سیاسی بوون. گریکانی هاتوچۆو گواستنەوەش کە هەموو ئەو شوینانە دەگریتەوە کە ریگەی وشکاییەکان و هیلەکانی ئاسن و بەندەرو فرگەو ریگە ئاوییەکان و هەموو ئەو جیگەیانەی کە بۆرییەکانی ئاوو نەوت و گازیانی پیدا دەروات ئامانجیکی گرنگی تری عەسکەریی پیکدەهینن، کە هیرشکردنە سەریان یان هەولدان بۆ پاراستنیان، ئەرکی جوگرافیای تەعبەوییە. کارگەکانی بەرهەمهینان و دامەزراوە ئابورییەکان و خزمەتگوزارییە جیاجیاکانی تری هەر ولاتیکیش، حالی حازر وەکو دەستکەوت و ئامانجی گرنگی هەر جەنگیك حسابیان بۆ دەکریت.

## سییەم/ جوگرافیای ئیداری

جوگرافیای ئیداری[٢٤] لە زۆر رووەوە لە جوگرافیای ئابوری دەچیت، تائەو رادەیەی کە بەئەلتەرناتیڤی عەسکەریی جوگرافیای ئابوری وەسف دەکریت جوگرافیای ئیداری پراکتیزەکردنی عەسکەرییانەی بەشەکانی ئابوریی و زانستە پزیشکییەکان و هەندەسەو ئیدارەیە. بەشیوەیەکی گشتی جوگرافیای ئیداری چوارچیوەی ئەو بیروبۆچوونانەیە کە بنەما جوگرافییەکانی هیزی نەتەوەیی دەکیشیت.

جیا لەتوخمە جیۆستراتیجییەکان، بەپلەی یەکەم هیزی نەتەوەیی پشت بە دانیشتوان دەبەستیت. دانیشتوان سەرچاوەی سەرەکی هەر دەولەتیکە. لەرووی ئابورییەوە، بەشی کارای دانیشتوان رۆلی راستەوخۆیان هەیە. لیوەشاوەیی و لیهاتوویی دانیشتوانیش لەرووی هیزی کارەوەو رادەی بەرزیی و

نزمی ورەیان، گرنگترین ئەو پایەنەن کە دانیشتوانی هەر ولأتیکی لە رووی عەسکەرییەوە، پێ هەلدەسەنگیندریت.

جوگرافیای ئیداری حسابکردنو هەلسەنگاندنی توانای مەیسەربوونی ئابوری نەتەوەیی دەگریتەوە. ئەمەش هەر بەتەنها دابەشبوونی سەرچاوە ئابورییەکانو سامانە سروشتییەکان ناگریتەوە، بەلکو رادەی پیاراگەیشتنو گۆرینی ئەو سەرچاوانەش بۆ کەرەستەی بەکەلك بەنیسبەت هیزی نەتەوەییەوە، دەگریتەوە. چونکە ئەگەرچی بوونی سامانە سروشتییەکانو ماددە خاوەکان بنچینەی هیزی نەتەوەیین، بەلأم مەرج نییە بوونی ماددەی خاو، بەرهەمهینان بگەیەنیت. هەروەکو هەبوونی ئەو ماددانەش مەرج نییە لە چوارچیوەی سنوری نەتەوەیی دەولەتدا بیت. بەلکو توانای دەستخستن جا لەریی پرۆتۆکۆلەوە بیت، یان لەریی کرینەوە، شیوەیەکی تری هەبوونی ئەو کەرەستەو ماددانە دەگریتەوە.

جوگرافیای ئیداری، بەهەمان شیوەی جوگرافیای ئابوری لەبوارەکانی پیشەسازی، عەمبارکردن، گواستنەوە، خزمەتگوزارییە پزیشکییەکانو چەندین خزمەتگوزاری کۆمەلأیەتی تر، دەکۆلیتەوە.

ئەمە بەکورتی، گرنگترین لقەکانی جوگرافیای عەسکەری بوون، کە هەریەکەیان بەجیاو، هەموویان پیکەوە دەبنە هەوینی هەر پلان دانانیکی عەسکەریو خەملأندنی هیزی نەتەوەیی بەمەبەستی بریاردانی سیاسیو دۆزینەوەو دەستنیشانکردنی خالە لاوازو بەهیزەکانی دەولەتو پالپشتی کردنی بریارە ستراتیجییەکان، لەسەر ئاستی نەتەوەیی.

## سەرچاوەو پەراویزەکانی بەشی یەکەم:

[1] ت، و، فريمان، الجغرافية في مأئة عام، ترجمة الدكتور عبدالعزيز طريح شريف، بغداد، مطبعة أفاق عربية. ل٧

[1] محمد أزهر سعيد السماك (الدكتور)، الجغرافية السياسية- أسس و تطبيقات، جامعة الموصل، مديرية دارالكتب للطباعة والنشر، ١٩٨٨ ل٢١.

[٤]- هەمان سەرچاوە، ل ٢٤

[٥]- هەمان سەرچاوە، ل ٢٥

[٦]-هەمان سەرچاوە

[٧]- هەمان سەرچاوە.

[٨]- عبدالعزيز طريح شريف (الدكتور)، الأسس والمشكلات في الجغرافية السياسية، الجزء الأول، أسكندرية ١٩٦٣

[٩]- رسل وپيرس الجيوپۆليتكا، ترجمة يوسف مجلي و لويس اسكندر، القاهرة، دارالكرنك

[١٠]-محمد أزهر سعيد السماك (الدكتور)، هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[١١]- لەشرۆڤەکردنی زانیارییەکانی ئەم باسە سوود لەم دوو سەرچاوەیە وەرگیراوە: محمد أزهر سعيد السماك (الدكتور) هەمان سەرچاوەی پێشوو، هەروەها- ت، و، فريمان، هەمان سەرچاوەی پێشوو.

بۆ تاوتوێ کردنی (بنەما گشتییەکان)، ئەم سەرچاوەیە کراوەتە بنەما: س. پيليتر لويس و جی. أيزل پيرس، الجغرافية العسكرية، ترجمة الدكتور عبدالرزاق عباس حسين، بغداد، دار الحرية للطباعة، ١٩٧٥

[١٢]- عبدالمنعم عبدالوهاب (الدكتور)، "الجغرافيه العسكريه والمفهوم الجيوپۆليتكی"، مجلة الجمعية الجغرافية العراقية، (العدد العشرون، تموز ١٩٨٧). ل٥٨.

[١٤]-س. پيليتر لويس و جی. أيزل پيرس، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٨

محمد أزهر سعيد السماك (الدكتور)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٣٧٨

[16]- منير شـفيق، علـم الحـرب، بـيروت، المؤسسـة العربيـة للدراسـات والنشـر، ١٩٧٢ ل٣٨

[17]- محمد أزهر سعيد السماك (الدكتور)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٣٧٨.

[18]- س. پيليتر لويس وجی أيزل پيرس، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٣٠

[19]- ضرغام عبدالله الدباغ (الدكتـور)، قضايـا الأمـن القومـي والقرار السياسـی، بغداد، مطبعة الأنتصار، ١٩٦٨

[20]- س. پيليتر لويس وجی، أيزل پيرس، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٤.

[21]- هەمان سەرچاوە، ل٤٨.

[22]- هەمان سەرچاوە، ل ٥٩.

[23]- هەمان سەرچاوە، ل ٦٢

[24]- هەمان سەرچاوە، ل ٥٨–٧٠

فەسڵی یەکەم

# سنوری کوردستانی باشور

## (٢-١-١): گەڕانەوەیەکی مێژوویی

گەر واز لەسەردەمی پێش مێژوو بهێنین، ئەوا ژیانی مێژوویی لەناوچە شاخاوییەکانی سەروی وڵاتی نێوان دوو رووباردا، گەلێك پێش پەیدابوونی ئەو هۆزو تیرانە سەریهەڵدا کە لەپاشاندا کوردیان لێکەوتەوە. کۆڵینکارییە مێژوویی‌و ئاسەوارییەکان وادەردەخەن کە هەشت هەزار ساڵ یالانی کەم شەش هەزار ساڵ پێش زایین، مرۆڤ وەکو بوونێکی مێژوویی لەم زەوییانەدا ژیاوە کەئێستا بەکوردستان ناودەبرێت.

لەعێراق‌و هێندێك وڵاتانی خۆرهەڵاتی نزیکدا، چەرخی بەردینی نوێ لە دەوروبەری ٥٦٠٠ یان ٥٠٠٠ ساڵی پێش زایینـدا، کۆتایی‌هات. پێشەنگی شارستانێتی‌و چەرخی مێژوویی لەدەوروبەری ٣٥٠٠ ساڵی پێش زاینیدا، دەستی پێکردووە.

هەرلەو سەردەمانەدا کۆچ‌و رەوێکی فراوان بەرەو ناوچەکانی خۆرهەڵات بەتایبەتیش عێراق‌و کوردستانی ئێستا دەستی پێکرد، کەپاشتر جێ‌پەنجەی

بەسەر کۆچ و رەوی سامییەکان بەرەو باکوری وڵاتی نێوان دوو رووبارەوە جێهێشت.

ئەکەدییەکان یەکەم گروپی گەورەی سامییەکانن کە لە دوادواییەکانی هەزارەی چوارەمی پێش زایین لەدورگەی عەرەبەوە بەرەو ناوچەکانی باشورو ناوەڕاستی عێراق، هەڵکشاون. ئاشورییەکانیش بەرەو باکور هەڵکشانو، لەکۆتایی هەزارەی سێیەمی پێش زاییندا ئامۆرییەکان سەرەتا دەستە دەستەو پاشان بەلێشاو لەشامەوە خۆیان کرد بەعێراقدا[٢]

ئەوە قسەی پێناوێت کە کورد لەتۆرەمەی بەشێك لەهۆزەکانی زاگرۆسە. گەر میدیا ئیمپراتۆریەتێکی تەواو کوردیش نەبوو بێت ئەوا ئەو ماددانەی کە مێژووەکەیان لەساڵی (٦١٢پ.ز)وە دەست پێدەکات، بەشی گەورەیان باپیرەی کورد دەردەچن.

زەینەفۆن (٤٣٠-٣٥٤پ.ز) لەساڵی (٤٠١پ.ز)دا بەشداری کشانەوەی ئەو دەهەزار سەربازە یۆنانییەی کرد کە کوردستانیان پێماڵ کردبوو، زەینەفۆن لەمێژووەکەی خۆیدا (ئانابـاس) باس لە ئازایەتیو جەربەزەیی ئەو کاردۆخییانە دەکات کە لەدەوروبەری شارۆچکەی زاخۆی ئێستادا پەلاماری سوپای یۆنانیان داوەو، بۆماوەی حەوت رۆژ پروزەیان لەو سوپایە بریوە[٣]

پۆلیبیۆس (٢١٠یان ٢٠٠- ١٢٠ پ.ز)، کوردەکان بە Cirtiی ناودەبات و، سترابۆن (٦٤یان ٦٣ پ.ز- ٢٠ز)، لەدانراوە جوگرافییەکەیدا بە Kyrtioiو تیتۆس لیڤیوس (٥٩پ.ز- ١٧ز). بە Cirtei ناویان دەبات[٤] ئینسکلۆپیدیای ئیسلام پێی وایە کوردەکان راستەوخۆ دەچنەوە سەر کوردۆخاڵدەوییەکان[٥] لەوێدا هاتووە: جۆرە لێکچوونێك لەنێوان کوردۆو خاڵدیدا -کەناوی هۆزێکە- هەیە. ئەم هۆزە لەکۆتایی سەدەی نۆیەمی پێش زاییندا لە ئەرمەنستانەوە سەریان هەڵداو پاشان لەناوچەی دەریاچەی واندا ئیمپراتۆریەتێکی بەدەسەڵاتیان دامەزراندو تاسەرەتای سەدەی شەشەمی پێش زایین، بەردەوام بوو. ئینسکلۆپیدیا پێی لەسەر ئەوە دادەگرێت کە سەرزەمینی کۆنی کوردۆکان، ئەمرۆکە مەڵبەندی بنەڕەتی کوردانە[٦]

هیچ قۆناغێکی مێژوویی کۆنی کورد، هێندەی قۆناغی پاش زایینو بەتایبەتیش سەرەتای هێرشو پەلاماری عەرەبەکانو مێژووی پێنج سەد ساڵی یەکەمی کۆچی، ئاشکراو روون نییە.

پاش ئەوەی عەرەبەکان حکومەتی ساسانییەکانیان رووخاند، تاهاتنی مەغۆلەکان چەند بنەماڵەیەك لەکوردستاندا حوکمیان کەوتە دەست، لەهەمووان گرنگتر شەدادییەکان بوون کەساڵی (٩٥١ن) لەباکوری کوردستاندا پادشایەتییان کردو، دوای ئەوانیش مەروانییەکان هاتن‌و لەنێوان ساڵەکانی (٩٩٠-١٠٦٩ن) فەرمانڕەوایەتی دیاربەکرو چەند شارێکی ئەرمەنستانیان بەدەستەوە بوو[٧]

هێرشی تورکە سەلجوقییەکان (١٠٥١ن)و، مەغۆلەکان (١٢٣١ن)و، ئینجا تەیمورلەنگ لەساڵی (١٤٠٢ن)دا، کوردستان بەتایبەتی‌و هەموو ئاسیای نزیکیان تووشی وێرانکاریی‌و داگیرکردنی فراوان کردەوە[٨] دوای ئەو سێ شاڵاوە ئیتر واپێدەچێت تا سەردەمی فەرمانڕەوایەتی سەفەوی‌و عوسمانییەکان‌و گەرم بوونی ناکۆکی نێوان ئەو دوو ئیمپراتۆریەتە، کورد خۆی نەگرتبێتەوە. دوای شەڕی چالدێران لەساڵی (١٥١٤ن)دا، بۆیەکەمین جار بەشێوەیەکی ئاشکرا کوردستان دابەشکرا. لەو مێژووە بەدواوە ئیتر کوردستان بۆ چوارسەد ساڵ بووە مەیدانی ململانێی نێوان ئەو دوو ئیمپراتۆریەتە. شەڕو شۆڕە خوێناوییەکانی تورکەکان‌و ئەفغانەکانی دەسەڵاتداری ئەسفەهان لەساڵی (١٧٢٦ن)داو، پاشان حوکمڕانێتی کوردە زەندییەکان بەسەر بەشێکی گەورەی ئێرانداو، هاتنی قاجارەکان، بارودۆخی نێوان ئەو دوو ئیمپراتۆریەتەی بەرەو ئەوەبرد، بەریتانیاو رووسیا بێنە نێوانەوەو لەساڵی (١٨٤٧ن)دا لەئەرزڕۆم پەیمانێکیان پێ مۆربکەن[٩]

لەدوادواییەکانی سەدەی نۆزدەو بەتایبەتیش لە دوای ساڵی (١٨٧٨ن)ەوە، ئیتر دەسەڵاتی عوسمانییەکان بەرەو کزی دەچوو ئەگەرچی جەنگی یەکەمی جیهانیی داگیرکەرانی کوردستانی رووبەڕووی ماڵوێرانییەکی گەورەکردەوە، بەڵام بۆ خودی کوردان نەهامەتییەکی گەورەتر بوو. پاش تەواوبوونی جەنگ باری کوردستان بەتەواوی گۆڕا... دروستکردنی دەوڵەتی عێراق لە (١٩٢١)داو، هەڵوەشانەوەی رژێمی خەلافەتیی لەتورکیا لە (١٩٢٣)داو، هاتنەسەرکاری پەهلەوییەکان لەئێران لە (١٩٢٥)داو، دواجار ولایەتی موسڵ خستنە سەر خاکی عێراق لەهەمان ساڵدا، بارودۆخی کوردی لەجاران ئاڵۆزترو، ئەمجارەیان کوردستانی بۆ سەر زۆرتر لە چوار دەوڵەت، دابەشکرد.

## (٢-١-٢): زاراوەی کوردستان

واپێدەچێت لەسەردەمە کۆنەکاندا پێش ئەوەی ناوی کوردستان زانراو بووبێت، کوردستان بەناوی یۆنانی (کاردۆخیا) ناسرابێت. هەروەها بە یۆنانیو رۆمانی (کوردۆئین) یان (کوردیایا)ی پێوترابێتو، سریانییەکانیش بە (کاردۆ) یا (قاردۆ) ناسیبێتیان[١٠]

زانیاری لای مێژوونووسانی عەرەب دەربارەی کوردەکان لەژێر ناوی: زۆزان، خیلات، ئەرمەنی، ئازەربایجان، چیا، فارس،.... هتد. هاتووە[١١] مێژوونووسی کورد محەمەد ئەمین زەکی بەپشت بەستن بە (کتاب تقویم البلدان)، کوردستان لەناوپێنج ئقلیمدا پیشاندەدات کە ناوەکانیان بەم شێوەیە بوون:-

*ئقلیمی جزیرە[١٢]: عیبارەت بووە لەدیاری مضر (رقە)، دیاری رەبیعە (موسڵ)، دیاری بەکر (ئامێد).

*ئقلیمی عێراق: حەلوان.

*ئقلیمی (بلاد الروم): مەلاتیە، توقادو سیواس.

*ئقلیمی ئەرمینیاو ئاراتو ئازارەبایجان: وان، بەرزەعە، تەبرێز، ئەردەبیلو مەراغە.

*ئقلیمی جەبەل: سوڵتانیە، هەمەدان، قرمسین، ئەربیل، شارەزوور.... هتدی تێدابووە[١٣]

بەشێوەیەکی گشتی مێژوو نووسان لەسەر ئەوە یەك دەنگ کەوشەی کوردستان تا سەردەمی سەلجوقییان وشەیەکی نەناسراو بووە. محەمەد ئەمین زەکی لەکتێبەکەی خۆیدا (کوردو کوردستان) نووسیویە دەڵێت: (ئەسڵی ناوی "کوردستان" وەکو ریوایەت دەکرێت.. لەتەرەفی سەلجوقییەکانەوە بەمەنتیقەی بەینی ئازەربایجانو لورستانو یا بەولاتانی غەربی زاگرۆس دراوە[١٤]). هەروەها لەدرێژەی قسەکانیدا دەڵێت: (سوڵتان سەنجەری

سەلجوقی، لای غەربی جیبال کە تابعی کرماشان بوو، جێی کردەوەو ناوی نا (کوردستان)و (سلێمان شا)ی برازای کرد بە حاکمی[١٥]

کەواتە بۆ یەکەمین جار لەساڵی (١١٥٠ن)دا، لەسەردەمی سەنجەری سەلجوقییدا زاراوەی کوردستان وەکو زاراوەیەکی جوگرافیی، یاوەکو ناوی هەرێمێکی ئیداریی سەربەخۆ، لەسەر نەخشەی جوگرافیای ئەو وڵاتانەی کەئێستا خۆرهەڵاتی ناوەڕاست پێکدێنن، جێگەی خۆی گرتووەو وردە وردە بڵاوبۆتەوە[١٦]

## (٢-١-٣): زاراوەی کوردستانی باشور

لەئێران چەند ناوچەیەکی چکۆلەی سەر بەشاری سنە بەکوردستان ناسراوە. لەعێراقدا زاراوەی (باکوری عێراق)و، لەتورکیا (خۆرهەڵاتو باشوری خۆرهەڵاتی تورکیا) جێگەی ناوی کوردستانیان گرتۆتەوە، لەسوریا شتێك نییە پێی بوترێت کوردستان.

بۆ جیاکردنەوەی هەر پارچەیەکی کوردستان لەیەکدی، ساڵانێکی زۆرە زاراوەکانی کوردستانی عێراقو کوردستانی تورکیاو ئێرانو سوریا، بەکاردەهێنرێن. ناسیونالیستە کوردەکانیش زاراوەکانی کوردستانی باشورو باشوری کوردستان، کوردستانی باکورو باکوری کوردستان، کوردستانی خۆرهەڵاتو خۆرهەڵاتی کوردستان، کوردستانی خۆرئاواو خۆرئاواو کوردستان، بەکاردەهێنن.

هەر وڵاتێکی دنیا بەپێی شێوەی وڵاتەکەو رووپێوی خاكو کەشوهەواو تۆبۆگرافیاو جیۆمۆرفۆلۆجیا، هەرێمێك یان چەند هەرێمێکی جوگرافی لەخۆدەگرێتو، باکورو باشورو خۆرئاوا خۆرهەڵاتی خۆی هەیە.

ئەوە حاشا هەڵنەگرە کە کوردستان یەکەیەکی جوگرافی یەکگرتووە، بەڵام کوردستان دەوڵەت نییە، سەدان ساڵە لەژێر باری داگیرو دابەشکراویدا رووبەڕووی گۆڕانکاری سۆسیۆ-کلتوری گەورەبۆتەوە. حاڵی حازر کوردستان

لانی کەم دەکرێت دابەشی سێ هەرێمی جیاجیا بکرێت، کەهەریەکەیان لەڕووی کۆمەڵایەتی، دیالێکت، کولتورو، تەنانەت لەخودی هەر هەرێمێکیشیاندا بەتەنیا، جیاوازی ئاشکرا دەبینرێت. ئەو هەرێمانە وەکو بەرئەنجامی راستەوخۆی باری دابەشکراوی ولاتەکەو بێ رەچاوکردنی هیچ یەکەیەکی پێوانەیی و جوگرافی، باکورو باشورو ناوەڕاستی کوردستانیان گرتووە، بەم شێوەیە: باکوری کوردستان بەهێڵێك لەوپەڕی خۆرئاوای ناوەڕاستی کوردستان، لەشارۆچکەی شنگارەوە بەرەو ئەوپەڕی خۆرهەلاتی ناوەڕاست تاسەرووی شاری مهاباد، دەکشێت.. هەموو زەوییەکانی باکوری زێی گەورە دەخاتە چوارچێوەی سنورەکەی خۆیەوە.ئینجا لەسەروی شارۆچکەی خانەقینەوە هێڵێك بەرەو خۆرهەلات دەکێشین، بەباکوری خانەقین و شاری کرماشاندا رەت دەبێت و ناگاتە هەمەدان کۆتایی دێت.. هەموو ناوچەکانی خوار ئەم هێڵە باشوری کوردستان و، هەموو ناوچەکانی سەرووی ئەم هێڵەو خوارووی هێڵی پێشوو کەدەکەوێتە نێوان هەردوو هێڵەکەوە، ناوەڕاستی کوردستان پێکدێنن.

ئەگەرچی دابەشکردنێکی لەوجۆرە کە لەڕووی یەکە پێوانەیی و هەرێمە جوگرافیاکانەوە بنەمایەکی تۆکمەی نییە، بەلام لەدەرەوەی خواست و ئارەزوو، کارێکی لەوجۆرە تەنانەت لەپێکهاتنی دەولەتی یەککگرتووی کوردستانیشدا، کەم تازۆر بوونی خۆی دەسەپێنێت.

بەلام هەر دابەشکردنێك لەبەرچاو بگیرێت، هیچ کام لەکوردستانی بەعێراقەوە لکێندراوو کوردستانی بەئێران و تورکیاو سوریاوە لکێندراوی ئێستا، یەکەیەکی جوگرافی یەککگرتووی وەها پێك ناهێنن کەبتوانین هەریەك لەو پارچانە بەباکور، باشور، خۆرهەلات یا خۆرئاوای کوردستانیان، ناوزەد بکەین.

لەڕووی جوگرافیاوە ناوچەکانی پشتکۆو پێشکۆو خانەقین و کرماشان و ئیلام بەشە سەرەکییەکەی باشوری کوردستان پێکدەهێنن. هەر لێرەوە بەکارهێنانی زاراوەی باشوری کوردستان بۆ کوردستانی بەعێراقەوە لکێندراوو، ئەوەندەی حەزو ئارەزووی هێماکردنە بۆ یەك پارچەیی خاکی کوردستان، لەڕووی ئەکادیمیەوە هیچ بنەمایەکی زانستی نییە. زاراوەی باشوری کوردستان هیچ بوارێك بۆ ئەو دابەشبوونە واقیعییەی ئێستا لەئارادایە

ناهێڵێتەوەو ئەم پارچەیەی کوردستان وەکو هەرێمێکی جوگرافیی و یەکگرتوو دادەنێت و هەموو ئەوخاکەی کە لەگۆترە بەعێراقەوە لکێندراوە، بە (باشور)ی کوردستان دەزانێت.

ئێمە لەم لێکۆڵینەوەیەدا زاراوەی کوردستانی باشور (نەك باشوری کوردستان)مان بەکارهێناوە. ناوهێنانی باشور لەم لێکۆڵینەوەیەدا لەسۆنگەیەکی سیاسی/ زاراوەییەوە، نەك جوگرافی بناوان دەگرێت. زاراوەی کوردستانی باشور (نەك باشوری کوردستان) هێماکردنە بۆ باری دابەشکراوی کوردستان، داننانە بەبوونی پارچەی تری کوردستان لەدەرەوەی ئەوەی کەئێمە باسی دەکەین، لەهەمان کاتدا ناوزەدکردنی ئەم پارچەیە بەباشور، ئەوە پیشاندەدات کەئەم پارچەیە بەبەراورد لەگەڵ پارچەکانی تری کوردستاندا، لای باشوری پارچەکانی تری ئێستای کوردستانی گرتووە نەك بۆخۆی باشوری کوردستان بگەیەنێت.

## (٢-١-٤): پێشینە مێژووییەکانی سنورکێشانی کوردستانی باشور بەعێراقەوە

ئەم سنورە جوگرافییەی ئێستای کوردستانی باشور، دەرهاویشتەی پێکهاتە سیاسییەکەی عێراقە. عێراق تا جەنگی یەکەمی جیهانی، بەشێك بوو لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی. دوای لاوازکردن و نەهێشتنی دەسەڵاتی ئەو ئیمپراتۆریەتەو بەماندات بوونی عێراق لەلایەن بەریتانیاوە، سەرەتا ولایەتەکانی بەسرەو بەغدا، (دواتریش ولایەتی موسڵ کە بەشێکی گەورەی کوردستانی باشوری ئێستا دەگرێتەوە) لە لاشەی دەوڵەتی یەککەوتەی عوسمانی قرتێنراو لە ١٩٢١/٧/٢١داو لەلایەن بەریتانیاوە، دەوڵەتی عێراق دامەزرا.

پێداچوونەوەیەکی مێژوویی ناوچەکە، باشترین هۆیە کەلێیەوە بتوانرێت لەتانوپۆکانی مەسەلەی سنورکێشانی ناوچەکە بەگشتی و، کوردستان و کوردستانی باشور بەتایبەتی، تێبگەین.

لەسەرەتای سەدەی پازدەدا[١٧] سێ دەوڵەت رەشمەی هەموو خۆرهەڵاتی ناوەڕاستیان گرتبووە دەست، ئەوانیش یەکەمیان کۆنە دەوڵەتی مەمالیك بوو

لەمیسرو شامو حیجازو یەمەن، دوانەکەی تریشیان هەردوو دەوڵەتی تازەپێگەیشتوو عوسمانیو سەفەوی، یەکەمیان ئەنادۆڵو باڵقان، دووەمیشیان لەفارسدا.

دەوڵەتی عوسمانی بەدوو سەدە زیاتر پێش دەوڵەتی سەفەوی لەمیرنشینێکی چکۆلەی سونی مەزهەب کە لەسەدەی سیازدەو لەژێر فشاری مەغۆلدا لە خۆرهەلاتەوە بەرەو ئەنادۆڵ هاتبوون، لەلای باکوری خۆرئاوای ئاسیای بچوك، لەلایەن عوسمان کەپێدەچێت لەساڵی (١٢٥٨ز)دا لەدایك بووبێت، دامەزرا.

ئەم میرنشینە کەسەرەتا لەژێر سایەی سەلجوقییە رۆمەکاندا پێگەیشت، لەکاتی رووخانی سەلجوقییەکاندا کەوتە چنینەوەو خۆگرتنی ئەو میرنشینە تورکانەی لەو دەوڵەتە جیابووبوونەوەو بەمەش دەوڵەتی عوسمانی وردە وردە گەورەبوو. دەوڵەتی عوسمانی کە خۆی بەمەڵبەندی نوێی ئیسلامگەرێتی دەزانی، ئالای جیهادی دژی دەوڵەتی ماندووی بێزەنتی هەڵکرد. عوسمانییەکان توانییان سەرەتا هەموو ئەنادۆڵ لەهێزە بێزەنتییەکان پاك بکەنەوەو سنوری دەوڵەتەکەیان بەرەو خۆرئاوا فراوانتر بکەن. پاشان لەساڵی (١٤٥٣ز)دا قوستەنتینییەیان لە بێزەنتییەکان گرتو بۆ چوار سەدە کردیانە پایتەختی دەوڵەتەکەی خۆیان.

سەدەی پازدە کۆتایی نەهاتبوو کە عوسمانییەکان هەموو ئەنادۆڵو یۆنانو بەڵقانو دورگەکانی ئیجەو دورگەیەکیشیان لەخواری ئیتاڵیادا داگیرکردبوو.

تائەودەمەی لەخۆرهەلاتی ناوەڕاست دەوڵەتێکی بەهێزتر نەبوو جگە لە عوسمانییەکان بەناوی ئیسلامەوە فەرمانڕەوایی بکات، عوسمانییەکان سەرگەرمی فراوانکردنی قەڵەمڕۆکەیان بوون لە ئەورووپادا، بەجۆرێك کە دواجار تا دەروازەکانی ڤییەنا پێشڕەوییان کرد.

سەرەتای سەدەی شازدە سەرەتای بادانەوەی گەورەی عوسمانییەکان بوو بۆ خۆرهەلات. عوسمانییەکان کەتا ئەودەمە هەڵگری ئالای جیهانی ئیسلام بوون، کاتێك بەخۆیان زانی لەپەنا سنورەکەیانداو لەساڵی (١٥٠١ ز)دا، ئیمپراتۆریەتی سەفەوی شیعە مەزەب لەسەر دەستی شا ئیسماعیل سەفەوی دامەزرێنرا. دەوڵەتی سەفەوی کەلەسەر داروپەردووی دەوڵەتی ئالاق قەینلوی تورکمانی هاتەکایە، ئالای شیعەگەریی دوازدە ئیمامیی بەرزکردەوە. ئیتر لێرە

بەدواوەو تاسەرەتاکانی سەدەی بیستەم، ململانێی خۆر هەڵاتی ناوەڕاست بریتییە لەململانێی سەختو خوێناوی نێوان هەردوو ئیمپراتۆریەتی ناوبراو. ئەو ململانییە بەئاقارێك کەوتەوە کەبۆ چوار سەدە کوردستانو ئەو ناوچانەی کەئێستا سەر بەعێراق، مەیدانی چەندین جەنگی خوێناوی بن.

شا ئیسماعیل دەیویست هەرچۆنێك بێت رەشە خاکەکانی خوارووی عێراقی ئێستا بەمەزارە پیرۆزەکانی هەردوو شاری نەجەف و کەربەلاوە، بخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە. بۆیە لەساڵی (١٥٠٨ن)داو لەپەلامارێکیدا بۆ سەر ئەو ناوچانە، هەموو ئەو ناوچانەو بەغداشی گرت. شا ئیسماعیل هەر بەوەوە نەوەستا، بەمەبەستی لوت شکاندنی عوسمانییەکان، گەرەکی بوو شیعەگەرێتی بگەیەنێتە ئەنادۆڵی دڵی دەوڵەتی عوسمانییەکان. ئیتر ئەودەمە سوڵتان سەلیمی یەکەم، بەتایبەتیش پاش ئاشکرابوونی رێکەوتنی سەفەوییەکان لەگەڵ سربستانو مەجەرستان دژ بەعوسمانییەکان، کەوتەخۆو لەساڵی (١٥١٤ن)دا جاڕی شەڕێکی گەورەی دژ بەسەفەوییەکان دا.

سوپای تورك بەهێزێکی گەورەوە بەرەو تەورێزی پایتەختی سەفەوییەکان کشا. سوپای سەفەوییەکان خۆی نەگرتو لەو شەڕەی کە پاشان بە شەڕی (چاڵدێران) ناسرا، خراپ تێکشکا.

پاش ئەو شەڕە هەردوو دەوڵەت بەپێی رێکەوتننامەیەك، ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆیان دەستنیشانکردو بۆ یەکەمین جاریش کوردستانیان کردە دوو کەرتەوە... بەری خۆرهەڵات بەر سەفەوییەکانو، بەری خۆرئاوا کەبەشی هەرە گەورەی ناوچەکانی کوردستانی باشوریشی دەگرتەوە، کەوتە دەستی عوسمانییەکان.

دەوڵەتی عوسمانی کە تادەهات بەهێزترو فراوانخوازتر دەبوو، لە ساڵەکانی (١٥١٦-١٥١٧ن)دا بەرەو باشور داکشاو پەلاماری دەوڵەتی مەمالیکەکانی داو هەموو ناوچەکانی شامو میسرو حیجازی گرت. ئەو دەمە دەوڵەتی عوسمانی لەباکورو خۆرئاواوە ئابلۆقەی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی سەفەوییەکانی لەعێراقدا، دابوو. حاکمی ئەو کاتەی بەغدا (ذوالفقار الكردي) کەسەفەوییەکان دەمێك بوو دانیان لێجیڕ دەکردەوە، هیچی بۆ نەمایەوە ئەوە نەبێت بەناچاری پشتیوانی خۆی بۆ سوڵتان دەربڕێت. بەلام شا ئیسماعیل بەمە رازی نەبوو، لەپیلانێکدا (ذوالفقار)ی کوشتو بەغدای گرت.

سوپای عوسمانییەکان بۆ گرتنەوەی بەغدا، بەهێزێکی زۆرەوە پەلاماری تەورێزیان دایەوەو لەساڵی (١٥٣٤ز)دا بەرەو بەغدا کشان. ئەمجاریان سوپای عوسمانی هەر بەوەوە نەوەستا، لەوێوە بەرەو بەسرە کشان و هەموو ناوچەکانی خوارووی بەسرەو ناوچەی ئیحسایان تا مەسقەت گرت. دەوڵەتی عوسمانی کەدڵنیابوو هەموو ئەو خاکەی کەئێستا عێراقی لێپێکهێنراوەو ناوچەکانی خوارووتریشی کۆنترۆڵ کردووە، لەساڵی (١٥٤٦ز)دا، ئەو ناوچانەی بەسەر چوار ولایەتدا دابەشکرد، بەم جۆرە: ولایەتی موسڵ، ولایەتی شارەزور کە لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەدا خرایەوە سەر ولایەتی موسڵ، ولایەتی بەغدا، ولایەتی بەسرە کە ولایەتی ئیحساشی پێوەگرێدرابوو.

بەمەبەستی کێشانی سنورێك لەنێوان هەر دوولادا، پەیمانی (ئەماسیە) لە ساڵی (١٥٥٤ز)دا بەسترا. بەڵام ناکۆکی و ململانێی دەسەڵاتخوازانەو فراوانخوازانەی هەردوولا سنوری بۆ نەبوو، دوای چەند شەڕێکی لێرەو لەوێ و لەسەردەمی شا عەباسی سەفەویدا لەساڵی (١٦٢٣ز)دا سەفەوییەکان توانییان بۆ جاری دووەم بەغدا بگرنەوە. جارێکی ترو بەپێی پەیمانی (زەهاو) لە ساڵی (١٦٣٩ز)دا، سنوری هەردوو دەوڵەت جارێکی تر دەستنیشانکرایەوە. بەڵام پەیمانی (زەهاو)یش نەیتوانی کۆتایی بە ململانێی هەردوولا بهێنێت. بۆیە تاهاتنی زەندەکان و گرتنە دەستی دەسەڵات لەئێراندا، شەڕ درێژەی هەبوو. لەساڵی (١٧٥١ز)دا کەریم خانی زەند کەتازە کرابووە شای ئێران، بەسرەی گرت. پاشان قاجارەکان لەساڵی (١٧٩٠ز)دا حوکمڕانی وڵاتیان گرتە دەست، بەڵام پێوەندی قاجارەکان لەگەڵ عوسمانییەکاندا لەوەی پێش خۆیان چاکتر نەبوو، پاش چەند شەڕێکی گەورە پەیمانی (ئەرزڕۆمی یەکەم) لەساڵی (١٨٢٣ز)داو، پاشان پەیمانی (ئەرزڕۆمی دووەم) لەساڵی (١٨٤٧ز)دا بەسەر پەرشتی روسیاو بەریتانیا مۆرکراو، بەوپێیە عوسمانییەکان وازیان لەناوچەی عەرەبستانی ئێران بەشاری موحەمەرەو چەند دورگەیەکی شەتولعەرەبیشەوە هێنا بۆ ئێران و، ئێرانیش وازی لەناوچەی سلێمانی هێنا بەرامبەر بەدەستهەڵگرتنی عوسمانییەکان لە دۆڵی کەرەند بۆ ئێران.

پاش ئەوە لیژنەیەکی هاوبەشی ئێرانی و عوسمانی و رووسی و بەریتانی، هەوڵیاندا بەمەبەستی دەستنیشانکردنی سنور، پێماڵی ناوچە سنورییەکانی نێوان هەردوولا بکەن.

هەردوولا لەسەر ئەوەپێکهاتن کە ناوچەیەکی بیستو پێنج میلی، وەکو ناوچەیەکی دابڕ لەنێوان هەردوو دەوڵەتدا جێبهێڵن. بەڵام سەرەڕای دەست بەکاربوونی چەندجارەیان تاسەرەتاکانی ئەم سەدەیە هەردوولا نەیانتوانی سنوری نێوانیان دەستنیشان بکەن.

پاش پرۆتۆکۆلەکانی تاران لەساڵی (١٩١١ن)داو، ئەستانە لە (١٩١٣ن)دا، لەساڵی (١٩١٤ن)دا لیژنەی دیاریکردنی سنور پاش یەکەمین هەفتەکانی جەنگی یەکەمی جیهانی، کۆتایی بەکارەکانی هێنا[١٨] ئیتر لەو رۆژگارەشەوە سنورەکانی عێراق کە بەکوردستاندا نێدەپەڕن، بەم شێوەیە داتاشران:-

## ١-سنوری عێراق- تورکیا

سنوری عێراق بە تورکیاوە، لەئەنجامی رێکەوتنی هەردوو حکومەتی تورکیاو بەریتانیای مانداتی عێراق، رەنگ رێژکرا.

لە ٣١ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩١٨دا، ئاگربەس لەنێوان بەریتانیاو دەوڵەتی عوسمانیدا راگەیاندرا. پێشتر کە بەپێی پەیمانی (سایکس- پیکۆ) ناوچەکانی سەر بەدەوڵەتی عوسمانی لەنێوان بەریتانیاو فەرەنسەدا دابەشکرابوو، ولایەتەکانی بەسرەو بەغدا بەر بەریتانیاو، ولایەتی موسڵیش بەر فەرەنسە دەکەوت. بەڵام لەپاشانداو بەپێی ئەو رێکەوتنەی لەنێوان هەردوو دەوڵەتدا مۆرکراو بەرێکەوتنی (جۆرج- کلیمانصۆ) ناسراوە، ولایەتی موسڵیش خرایە ژێر دەسەڵاتی بەریتانیاو ئینگلیزەکان لەساڵی ١٩١٩دا شاری موسڵیان گرت.

بزوتنەوەی ناسیونالیستی لەتورکیا، هەوڵو بگیری بوو ئەوەی دەکرێت رزگار بکرێت، رزگار بکات. تەمایان بوو هەر چۆنێک بێت ولایەتی موسڵ لەدەست نەدرێت. بەگوێرەی ئەو دۆسیە نیشتمانییەی لەسەر رێکەوتبوون، دەبوا سنوری نیشتمانی تورکیای نوێ تا چیاکانی مەکحولو زنجیرە چیای حەمرین داکشێتو ئەم سنورە بکەنە خاڵی جیاکەرەوەی نێوان تورکیاو عێراق.

لە١ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٢٤دا، ئەم کێشەیە خرایە بەردەم کۆمەڵەی نەتەوەکان، لەوێرا لیژنەیەك پێکهێنرا، پاش مانەوەیان لەعێراقو ناوچەکانی موسڵدا بۆ ماوەی سێ مانگ بەپێی بڕیارێك لە ١٦ی کانونی یەکەمی ١٩٢٥داو بەپێی پیلانێکی لەوەوپێش نەخشە بۆ کێشراوی بەریتانیاوە هێڵی برۆکسل کە

سنوری ئێستای عێراق- تورکیایە، کرا بەسنوری جیاکەرەوەی هەردو دەوڵەت و ولایەتی موسڵ بەشی هەرەگەورەی کوردستانی باشور کرایە بەشێ لەدەوڵەتی تازە پێکهێنراوی عێراق و، پەرلەمانی تورکیاش لە ٢٥ی کانون یەکەمی هەمان ساڵدا بڕیاریدا کە ولایەتی موسڵ بەزۆر لەعێراق نەستێنێتەوە

هێڵی سنوری عێراق- تورکیا، لەدۆڵی حاجی بەگ کەخاڵی پێگەیشتن سنوری عێراق- ئێرانە، دەست پێدەکات... بەدرێژایی ئەم هێڵەو دۆڵ مەهدانە بەرەو خۆرئاوا تاخاڵی پێکهاتنی دۆڵی رۆکچۆکە دەکشێت، ئینج بەرەو باکور بەسەر بەرزاییەکانی نێوان هەردوو حەوزی رۆکچوك شەمدیناندا، دۆڵی زێی نزیك دۆسکی دەبڕێت و شوێن پێی هەردوو زنجی چیای زێڕێ و زۆزان و حەرور هەڵدەگرێت تا باکوری هیزڵ و دۆڵی شرانش لەخاڵی پێگەیشتنی بەخاپور. ئینجا بەرەو دیجلەو لەباکوری فیشخاپورد کۆتایی دێت.

درێژی سنوری عێراق- تورکیا، (٣٥٠کم)ەو هەمووی بەخاکی کوردستاندا تێپەڕدەبێت[١٩]

## ٢-سنوری عێراق- ئێران

بەدەستێوەردانی راستەوخۆی روسیاو بەریتانیاو بەپێی پرۆتۆکۆلی ٤ تشرینی دووەمی ١٩١٣ی (ئەستانە)و پاشان لەساڵی ١٩١٤دا، ئەم سنورە ئێستای نێوان عێراق و ئێران کێشرا.

وەنەبێت ئیتر ئەو رێکەوتنە کۆتایی بە تەنگوچەڵەمە سنورییەکانی نێوا هەردوو وڵات هێنابێت. ئێرانی پەهلەوی هەرزوو بەزوو گومانی خۆی لە سنورە ئاشکرا کرد، بەرادەیەك عێراقی ناچارکرد لەساڵی ١٩٣٤دا کێشەکە بگەیەنێتە بەردەم کۆمەڵەی نەتەوەکان. تورکیا وەکو ناوبژیوانێك توانی کێشەکە بەعێراق بکێشێتەوە. پاشان لەساڵی ١٩٣٧داو بەپێی رێکەوتننامەیە کەتێیدا عێراق دەستی لەبەشێك لەئاوی شەتولعەرەب بەدرێژایی (٧,٧٥کم) هەڵگرت، ئێرانی ناچارکرد کەدان بەدەوڵەتی عێراقدا بنێت. بەلام لەگەڵ ئەوەشدا ئێران نەیکرد دان بەرەوایەتی سنوری نێوانیاندا بنێت.

لەساڵی ١٩٦٩دا ئێران لەیەك لاوە پەیمانی ١٩٣٧ هەڵوەشاندنەوەو، تاساڵی ١٩٧٥ کەتێیدا ئێران دەسکەوتێکی ستراتیجی گەورەی لەشەتولعەرەب

بەدرێژایی نزیکەی (٩٠کم) بەدەست نەهێنا، کێشەکانی سنور ئارام نەبونەوە بەڵام پاشگەزبوونەوەی عێراق لەورێکەوتنە دوای روخانی رژێمی شاهەنشایی‌و هاتنە سەرکاری رژێمی ئیسلامی‌و پاشانیش هەڵگیرسانی جەنگی هەشت ساڵەی نێوان هەردوو وڵات، وەکو ئاتاجێکی راستەوخۆی کێشە سنورییەکان‌و دیسان رێکەوتنەوە لەسەر هەمان پرۆتۆکۆڵی ١٩٧٥، کێشەکانی نێوان هەردوو دەوڵەتی بەشێوەیەکی مۆلەق، خامۆش کردووە.

هێڵی سنوری ئەوەی بەخاکی کوردستاندا تێپەڕدەبێت، لەباشوری خۆرهەڵاتەوە لەناوچەکانی ئەم دیو سنوری لوڕی بچوک لەخواروی دەست پێدەکات... لەوێوە بەرەو باکوری خۆرئاوا بە لاپاڵەکانی زنجیرە چیای پشتکۆ، بەخۆرهەڵاتی شارۆچکەی مەندەلیدا تێپەڕدەبێت‌و چۆمی ئەڵوەن لە خۆرهەڵاتی خانەقیندا دەبڕێت‌و، جارێکی تر بەرەو رێگەی نێودەوڵەتی بەغدا- تاران لەنێوان مونزریەو خوسرەویدا دەبڕێت‌و، هەروەها روباری سیروان بەپێچەوانەی ئاوەڕۆکەیەوە دەبڕێت تادەگاتە خاڵی پێگەیشتنی سێ کوچکەی سنوری عێراق- ئێران- تورکیا لەدۆڵی حاجی بەگ.

سەرجەم درێژی سنوری عێراق- ئێران (١٣٠٠کم)ەو بەشی هەرەگەورەی بەکوردستاندا دەڕوات[٢٠]

### ٣-سنوری عێراق- سوریا

دوای جەنگی یەکەمی جیهان، بەپێی رێکەوتنی پێش جەنگ لەنێوان دەوڵەتە ئیمپریالیستەکان، سوریا بەر فرەنسە کەوت‌و فرەنسە بووە خاوەنی.

سەرەتا بەشێوەیەکی کاتی لە ٢٣ی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٢٠دا، لەنێوان هەردوو ناوچەی مانداتی بەریتانیاو فرەنسەدا؛ عێراق‌و سوریا، هێڵی سنور دەستنیشانکرا. هێڵی سنوری هەمان ئەو هێڵەی ئێستای سنوری عێراق- سوریا بوو، تەنیا لەوەدا نەبێت کە هێڵەکە چیای شنگاری دەبڕی‌و دەیکردە دووکەرتەوە.

پاش ناڕەزایەتی دەربڕینی حکومەتی عێراق بەرامبەر بەم هێڵەو داواکردنی هەموو روبەری چیای ناوبراو بۆ خستنە سەرخاکی عێراق، ریفراندۆمێک لەناوچەی چیاکەدا سازدرا، لە ٥ی ئابی ١٩٢٣دا ئەو بەشەی تری چیاکەش بەر عێراق کەوت.

سنوری عێراق- سوریا، لەباکورەوە لە گوندی (خانك السفلی)ەوە دەست پێدەکات و لەخاڵی پێگەیشتنی سنوری عێراق- ئوردوندا کۆتایی دێت. درێژ سنوری عێراق- سوریا نزیکەی (٦٠٠کم)ەو بەشێکی بەکوردستا تێپەڕدەبێت[٤١]

## (٢-١-٥): دیاریکردنی هێڵی سنور

دیاریکردنی سنوری کوردستان بەشێوەیەکی گشتی و هەر پارچەیەک بەجیا کارێك بووە هەرگیز نەیتوانیوە بگاتە کەماڵی زانستیانەی کارێ ئەکادیمی لەسەرەتای هێرش و پەلاماری عەرەبەکان بۆ کوردستان و شالاو فەتحی عەرەبی ئیسلامی بۆ دەشتاییەکانی ئێستای عێراق و خاک میزوپۆتامیا، ئەم بەشەی کوردستان جیا لەهەر بەشێکی تری ڕووبەڕوو تەعریب و دانیشتوانە کوردەکەی دوچاری هەڵکەندن و لانە تێکدا کۆچپێکردن بوونەتەوە. پاشانیش لەسەردەستی هەردوو ئیمپراتۆریە عوسمانی و سەفەوی و بەرەودوا، داگیرکەرانی کوردستان هەریەکە بەجی چۆنیان بۆ لوا بێت کوردستان و دانیشتوانە کوردەکەیان لەسنور دەوڵەتییەکانی خۆیاندا عاسی کردووە، بەردەوامیش چەقۆیان لە جەستە خاکەکەی و سنورە نەتەوەییەکەی ئاژنیوە.

باشترین دۆکۆمێنتێك کەلێیەوە بتوانین سنوری نەتەوەیی وڵاتەکەمانی پ دیاری بکەین، نووسراوی ئەو گەڕیدەو مێژوونووس و جوگرافیناسە بێگان کوردانەیە کە لەسەر شوێنی ژیانی کورد لەمەوبەر راوبۆچوونیان خستۆتەڕوو لێرەدا هەوڵدەدەین لەمیانەی بەشێکی ئەو راوبۆچوونانە سەبارەت بەخاک مێژوویی و نەتەوەیی کورد، سنوری کوردستانی باشور بەعێراقەوە دیار بکەین بۆ ئاسانکردنی باسەکەش، راوبۆچوونەکان بەسەر سێ کۆمەڵ دابەشدەکەین کە هەریەکەیان بەجیا، جەختی لەسەر کوردستانی بوون ناوچەیەك یان چەند ناوچەیەك، بەمەبەستی دیاریکردنی سنوری کوردست بەعێراقەوە، کردووە.

کۆمەڵەی یەکەم: ئەوانەی پێیان لەسەر کوردستانی بوونی موسڵ، ی بەعێراقی نەبوونی ئەوشارەو دەوروبەری داگرتووە..

دکتۆر فازل حسێن لەپێش هەموو ئەوانەوە دێت کە بەشێوەیەکی زانستیو لەمیانەی نامەی دکتۆراکەیدا بەئاشکرا بەعێراقی نەبوونی موسڵو ولایەتی موسڵی بەم شێوەیە دەربڕیوە: (لیژنەکە- مەبەست لە لیژنەی کۆمەڵەی نەتەوەکانە- مێژوونووسانو جوگرافیناسە عەرەبو ژمارەیەکی زۆری نەخشە عەرەبیەکانو سەدان لەو نەخشانەی کە لەنێوان سەدەکانی شازدەو بیستدا کێشرابوون، بەسەرکردەوە. سەرەڕای کتێبی گەڕیدەی هەموو ماوە جیاجیاکانو سەرچاوە جوگرافییەکانو ئەو کتێبە جوگرافییانەی کە لەقوتابخانە ئامادەییە عەرەبییەکانی میسردا کاریان پێدەکرا، لیژنەکە گەیشتە ئەوەی کەسێ ناوچەی ئاشکرا هەیە: عێراقی عەرەبیو جزیرەو کوردستان. عێراق لەباکورەوە لەهیت- تکریت یا ناوچەی حەمرین زیاتر تێناپەڕێت.. لیژنەکە تەئکیدی کرد کە لەسەرجەم ئەدەبیاتە جوگرافییەکاندا هەر لەفەتحی عەرەبییەوە تا مێژووی هەڵپێچانی لیژنەکە (١٩٢٥ز)، هەموو ئەو زەوییانەی کێشەیان لەسەر هەبووە- مەبەست لەولایەتی موسڵە- رۆژێك لەرۆژان نەوەکو بەشێك لەعێراق دانراوون، نەوا وەسف کراوون، نەواش دەرکەوتوون[٢٢]

دیسانەوە ژان ئۆتێری گەڕیدەی فرەنسەوییو نوێنەری تایبەتی لویسی پانزەهەم بۆ خۆرهەڵاتو، لەگەشتە نۆ ساڵییەکەیدا (١٧٣٤-١٧٤٣) کە لەمارسلییەوە دەستی پێکردو ئەسفەهانو ئەنادۆڵو حەڵەبو عێراق گەڕا، ئەگەرچی بەئاشکرا کوردستانی بوونی موسڵ راناگەیەنێت بەڵام بەدڵنیاییەوە بەعێراق نەبوونی شاری ناوبراو دەسەلمێنێت (کەدەگاتە موسڵ باسی دوو رێگە دەکات لە موسڵەوە بۆ بەغدا موسڵ عێراق نەبووە، بۆیە دەڵێت: لەموسڵەوە تا عێراق شەش رۆژە رێیە[٢٣]).

(ئیبن حەوقەل کە لەساڵی (٣٥٨ك)دا لەموسڵ بووە دەڵێت شارێکی چاکە، بازاڕی گەورەو رەونەقداری تێدایە، کەوتۆتە نێوان کۆمەڵێك خاکی بەپیتو بەرەکەتەوە کە ناودارترینیان گوندی نەینەوایە، مەزارو گۆڕی یونس پێغەمبەر کەوتۆتە ئەو گوندەوە. بەشی هەرە زۆری خەڵکی موسڵ لەسەدەی چوارەمدا کورد بوون[٢٤]).

هەردوو وەرگێڕی عەرەبی کتێبی (عێراق لەسەدەی حەڤدەدا لەدیدی گەڕیدەی فەرەنسەوی تاڤەر نێیە)، لەباسکردنی موسڵداو لەیەکێك لە پاشکۆکانی کتێبەکەدا، ئاوەهایان نووسیوە: (دوای ئیبن بەتوتە، گەر بچینە

سەر ئەو گەڕیدە خۆرئاواییانەی کە سەردانی موسڵیان کردووە، (راوڵف)
گەڕیدەی ئینگلیزی کە لەساڵی (١٥٩٦ز)دا کۆچی دوایی کردووە، لەپێش
هەمووانەوە دێت. ئەو ئاوەها وەسفی کردووە- واتە وەسفی شاری موسڵ
موسڵ دەکەوێتە وڵاتی کوردانەوە[٢٥]).

ئەولیا چەلەبی گەڕیدەی تورك کە لەساڵی (١٠٦٥ك)دا هەموو کوردستا
گەڕاوە، لەسیاحەتنامەکەی خۆیدا ناوی نۆ شاران دەبات کە لەسەردەمی ئەو
قەڵەمڕەوی کوردستانیان پێکهێناوەو موسڵی بەیەکێك لەوشارانە دانا
شارەکانیش بریتیە لە:- ئەرزڕۆم، وان، هەکاری، دیاربەکر، جزیرە، ئامێدی
موسڵ، شارەزوورو ئەردەڵان[٢٦]

مێژوونووسی کوردیش، محەمەد ئەمین زەکی لەکتێبەکەی خۆیدا (کورد
کوردستان)، بەپشت بەستنی بە(کتاب تقویم البلدان) کوردستان لەناو پێن
ئقلیمدا پیشان دەدات، شاری موسڵیشی تێکەوتووە. ئقلیمی جزیرە کەیەکێ
بووە لەو پێنج ئقلیمە لەم ناوچانە پێکهاتووە: (دیاری مضر (رقە)، دیار
رەبیمە (موسڵ)، دیاری بەکر (ئامێد[٢٧]).

کۆمەڵەی دووەم: ئەوانەی (زەوییەکانی خۆرهەڵاتی رووباری دیجلەو چیا
حەمرین تا دەگاتە خانەقین یان مەندەلی) بەکوردستان دەزانن..

جوگرافیناس و کوردناسی عەرەب، دکتۆر شاکر خەصباك لەیەکێ
لەشاکارەکانیدا سنوری کوردستانی بەگشتی لەرێی راوبۆچوونی نوسەرێک
بێگانەوە دەستنیشانکردووەو ئەوبەشەی کەتایبەتە بەسنوری کوردستانی بە
شێوەیە دیاریکردووە: (سنووری باشوری خۆرئاوا- مەبەستی لەباشور
خۆرئاوای کوردستانی گەورەیە- بەهێڵێك لەباشوری لوڕستانەوە دەس
پێدەکات و بەئاقاری باکوری خۆرئاوا دەکشێت ومەندەلی دەبڕێت و بەخۆرئاوا
خانەقیندا رەت دەبێت و تا تەپۆڵکەکانی حەمرین و زنجیرەی یەکەمی چیاکان
شێخان. ئینجا بەرەو باکوری خۆرئاوا بەدرێژایی لاپاڵەکانی گردۆڵکەکان ت
فیشخاپور لەسەر روباری دیجلە درێژدەبێتەوە، ئینجا بۆ خۆرئاوا بەرەو چیا
شنگار وەردەگەڕێت تا لەسەر روباری فورات لەنزیك جەرابلوس کۆتایی دێت[٢٨]

دەبلیو، ئار، های کۆنە ئەفسەری بەریتانی و حاکمی شاری هەولێر، جگ
لەوەی نەخشەیەکی کۆنی بۆ نووسینەکەی کردۆتە بەڵگە، کەباس لەسنور

کوردستانی باشور دەکات، نووسیویە دەڵێت: (بەشێوەیەکی گشتی هەموو ئەو زەوییانەی دەکەونە خۆرهەڵاتی دیجلەو باکوری ئەو هێڵەی لەمەندەلییەوە تا خالّی پێکەیشتنی زێی بچوک بەم رووبارە دەکشێت، نیشتمانی کوردانە. گرنگترین دوو مەڵبەندیش لەخوارووی زێی بچوکدا کەرکوکو سلێمانییە. شاری یەکەم هەروەکو هەولێر دانیشتوانێکی تورکیان تێدایە، بەڵام ئەوەی تریان تەواو کوردییە[29]

کوردناسی روسیش باسل نیکیتین ئاوەها ئاماژەی بۆ سنوری کوردستان بەگشتی کردووە: (ئەمڕۆ کوردەکان لەسەر زەمینێکی فراواندا دەژین کە لەنزیك بەغدا لەشارۆچکەی مەندەلییەوە دەست پێدەکات بەرەو باکور بەدرێژایی سنوری عێراق- ئێرانو ئینجا سنوری ئێران- تورکیا تا دەگاتە چیای ئارارات[30]

نزیکەی شەش سەد ساڵ لەمەوبەریش، زانای کۆمەڵناسی عەرەب ئیبن خەلدون لەیەکێك لەنووسینەکانیدا چیای حەمرینی بەچیای کوردان ناوزەدکردووە. چونکە هەرەکو ئەو دەڵێت زۆربەی دانیشتوانی دەوروبەری چیای ناوبراو، کورد بوون[31]

ئەدمۆندزیش لەکتێبەکەی خۆیدا (کرد وترك‌و عرب) لەمیانەی دیاریکردنی سنوری کوردستاندا، هێمای بۆ هێڵی سنوری کوردستانی باشور بەعێراقەوە کردووەو نووسیویە: (سنوری باکوری کوردستان نزیك لەو هێڵەوە بناوان هەڵدەگرێت کە لەئەریڤانو ئەرزرۆمو (مەرەش)ەوە بەئاقاری حەڵەب رەت دەبێت‌و لەباشوری خۆرئاواوە بەدرێژایی لاپالّی ئەو چیایانەدا دەکشێت کە کەنارەکانی دیجلە کۆتاییەکانی دەبێت. پاشان خۆرهەڵاتی ئاوەڕۆی رووبارەکە دەگرێت‌و ئەوەندە لێی دوورناکەوێتەوە، بەهێڵەکەی چیای حەمریندا تا گەیشتنی بەنوختەی سەر سنوری عێراق- ئێران لە نزیکەی شارۆچکەی (مەندەلی) رادەکشێت[32]

ژان ئۆتێر زۆر بەدڵنیاییەوە دەڵێت: (عێراق لەتکریتەوە دەستی پێکردووە- مەبەستی تکریت بەرەو خوارە[33]). دەربارەی خانەقینیش نوسیویە: (ئەم شارە لەژێر فەرمانڕەوایی ئیمپراتۆریەتی عوسمانییەو بەشێکە لەسەرزەمینی خاکی کوردستان[34]

هیچ سەرچاوەیەکی کوردیش ئەوەندەی لێکۆڵینەوەکەی چیا (ئەم ستراتیجی عێراق و سێ کوچکەی بەعسییان: تەرحیل، تەعریب، تەبعیس بەوردی دەستنیشانی سنوری کوردستانی باشوری نەکردووە. چیا لە بارەیەوە نوسیویە: (بەشێوەیەکی گشتی کوردستانی عێراق یا کوردستا باشور، دەکەوێتە ناوەڕاست و باکوری رۆژهەڵات و باکوری عێراق و هەموو ئ خاکە دەگرێتەوە کە بەهێڵێکی راست لەسنوری عێراق- ئێرانەوە بەرەو رۆژئا دەکشێ تا دەگاتە خواروی جەسان، لەوێوە هاورێك لەگەڵ سنوری عێراق ئێران بەرەو رۆژئاوای بلدروز و شارەبان (مقدادیە) دەڕواو لەوێش را بەر چیای حەمرین هەڵدەکشێ، هەموو ئەو زەوییانەی دەکەوێتە رۆژهەڵاتیەوە ب کوردستان و هەموو ئەو زەوییانەی کە لەرۆژئاوایەتی بەر ناوچەی عەرە عێراق دەکەوێ تا دەگاتە سەروی شاری موسڵ لەسەر موسڵیشەوە هێڵێک راست روو لەباشوری رۆژئاوا دەکات و بەخوار تەلەعفەردا تێدەپەڕێت ت دەگاتە ١٠ کیلۆمەتری باکوری شاری (بەعاج)، ئینجا بەهێڵێکی راست بەر رۆژئاوا دەڕوات و لەگەڵ سنوری عێراق- سوریادا یەك دەگرێتەوە[٣٥]).

کۆمەڵەی سێیەم: ئەوانەی دوور لەوردەکاری و بێ مەبەستی لێکۆڵینە لەسنوری مێژوویی خاکی کوردستان، بەچەند هێڵێکی گشتی (سنو کوردستان)یان دەستنیشانکردووە..

دکتۆر عەبدولڕەحمان قاسملۆ لەدکتۆرا نامەکەیدا (کوردستان و کور کەدێتە سەرباسی سنوری کوردستان، نوسیویە: (لەشیمالی رۆژهەڵاتی لوتکە ئاراراتەوە خەتێکی راست دەست پێدەکات، بەرەو جنوب بۆ بەشی جنوب زاگرۆس و پشتکۆ دێتە خوارێ، لەوێ را خەتێکی راست بۆ لای رۆژئاو دەکێشین هەتا دەگاتە شاری موسڵ لەعێراق، لەوێوە خەتێکی راست بۆ لا رۆژئاو کە لەموسڵەوە دەگاتە بەشی تورك نشینی ویلایەتی ئەسکەندەرون[٣٦])

کوردناسی سۆڤێتی م.س. لازارێڤ بەشێوەیەکی کورت نووسیو (لەسەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا کورد لەناوچەیەکی فراوا ئەژیا، لەرۆژهەڵاتەوە: لەهەمەدان و ورمێ (ئێستە رەزائیەی پێ ئەڵێن خۆی و ماکۆوە، هەتا هێڵی بریجیك و مەلاتیاو ئەرزنجان لە رۆژئاوادا در ئەبێتەوە، لێرەشەوە بەرەو خوار هەتا خانەقین و کەرکوك و موسڵ و حەڵ دەکشێت[٣٧]

ئینسکلۆپیدیای ئیسلامیش کەیەکێکە لەسەرچاوە بە برشتەکانی خۆرهەڵاتناسی. لەو بەشەیدا کەتایبەتە بەکورد دێتە سەر جوگرافیای کوردستان و جگە لەدەستنیشانکردنی هەموو ناوچە کوردنشینەکانی سەر بەتورکیاو ئێران و سوریاو چەند کۆمارێکی سۆڤێتی جاران، بەم شێوەیە ناوچە کوردنشینەکانی سەر بەعێراق دیاری دەکات: (لەعێراقدا شارە کوردنشینەکان بریتین لە: دهۆك، زاخۆ، مزوری، جیز، ئامێدی، ئاکرێ، شنگار، کەرکوك، هەولێر، سلێمانی، دیالەو خانەقین و مەندەلی[٣٨]

دکتۆر ئیبراهیم شەریف لەدکتۆرا نامەکەیدا ئەگەرچی مەبەستی نەبووە سنوری کوردستانی باشور دەستنیشان بکات، لەشوێنێکدا ئاوا هێمای بۆ سنوری ئەم بەشەی کوردستان کردووە: (پشتێنەی حامیە عەسکەرییەکانی تورك، کە تورکە سەلجوقی و تورکە عوسمانییەکان دایانمەزراندبوون، لەشێوەی جیاکەرەوەیەکدا لەنێوان ئەو ناوچانەی لەلایەك عەرەبەکانی تێدا دەژین و لەولاکەی تریشەوە کوردەکانی تێدادەژین، درێژ دەبێتەوە. ئەو پشتێنەیە لەناوچەی مەندەلییەوە دەست پێدەکات و بەخانەقین و قزلڕبات و قەرەتەپەو کفری و توزخورماتوو داقوق و تازەخورمات و کەرکوك و پردێ و هەولێرو موسڵدا دەڕوات هەتا تەلەعفەر[٣٩]

دواجار گەڕیدەی روسی جەنەراڵ م. لیخوتین لەپێناسەکردنی کوردو شوێنی نیشتەجێ بوونیاندا نووسیویە: (کورد گەلێکی تایبەتین (....)، لەو زەوییانەدا دەژین کە لەڕووسیاو ئێران و تورکیاوە بەلاپاڵی زنجیرە چیاکانی ئاگریداخ تا دەشتە لماوییەکانی هەردوو رووباری دیجلەو فورات درێژدەبێتەوە لە باشور[٤٠]).

ئێستا دەکرێت دوای خستنەڕووی ئەو راوبۆچوونانە، بەم شێوەیە سنوری کوردستانی باشور دیاری بکەین و بگەینە ئەم ئەنجامانەی لای خوارەوە:-

١-زاراوەی کوردستانی باشور، هێمایە بۆ باری دابەش و داگیرکراوی کوردستان و لکاندنی زۆرە ملێیانەی خاکەکەی بەدەوڵەتی عێراقەوە. بۆیە دیاریکردنی سنوری ئەم پارچەیەی کوردستان، دیاریکردنی سنوری کوردستانە بە خاکی عەرەبیی عێراقەوە. جگە لەو چوکڵەیەی نەبێت کە بەخاکی عەرەبیی سوریاوە بەستراوەتەوە، ئیتر کوردستانی باشور لەهەموو لاکانی تریەوە بەپارچەکانی تری کوردستان دەورەدراوەو ئەمیش لەگەڵ

سەرجەم پارچەکانی تردا، سنوری مێژوویی و نەتەوەیی کوردستان پێکدەهێنێت.

٢-لەسەر بنەمای ئەو زانیارییانەی خرانەڕوو، دەکرێت بەم شێوەیە سنوری کوردستانی باشور بەعێراقەوە دەستنیشان بکرێت:-

گەر لەباشوری خۆرهەڵاتەوە دەست پێبکەین، لەخاڵی سنوری عێراق-ئێرانەوەو لەسەروی شارۆچکەی عەلی غەربییەوە، هێڵێك بۆ خۆرئاوا دەکێشین، پاشان بەرەو باکوری خۆرئاوا شارۆچکەکانی جەصان و بەدرەو زڕباتیە دەگرێتە خۆ، ئینجا بە خۆرئاوای شارۆچکەکانی بەلەدروزو شارەبان و لەوێوە تادەگاتە زنجیرە چیای حەمرین، هێڵەکە بەدرێژایی چیای ناوبراو تا شارۆچکەی فەتحە لەخوار پێگەیشتنی زێی بچوك بەڕووباری دیجلە هەڵدەکشێت. لەفەتحەوە تا شاری موسڵ، دیجلە دەبێتە سنورو لەخواروی شاری موسڵەوە، شاری ناوبراو دەخاتە ناو سنورەکەی خۆیەوەو هێڵەکە بەرەو باشوری تەلەعفەرو لەوێشەوە بە هێڵێکی ڕێك بەرەو باشوری خۆرئاوا بەخواروی شارۆچکەی شنگاردا ڕەت دەبێت و تا سنوری ئێستای عێراق-سوریا، دەکشێت.

٣-بەوپێیە کوردستانی باشور لەشێوەی هەرمێیەکە، یا سێگۆشەیەکی لاوەستاوی سەرەو نخوندایە، کە بەئاقاری خۆرئاوادا لار بۆتەوە سەری هەرمێکە یان سێگۆشەکە لەوپەڕی باشوری خۆرهەڵاتەوە ناوچەکانی بەدرەو جەصان و زڕباتیە لەخۆدەگرێت، لاوەستاوەکەی سێگۆشەکە بەقوڵایی کوردستاندا تێپەڕدەبێت، مەندەلی و خانەقین و ناوچەکانی سلێمانی و بەشێکی ناوچەکانی هەولێریش دەخاتە سنورەکەی خۆیەوەو، لایەکەی تری سێگۆشەکە بەئاقاری باکورو باکوری خۆرئاوای بەرەو مەندەلی و شارەبان و خانەقیندا ڕەت دەبێت و چیای حەمرین و بەشێکی روباری دیجلە دەکاتە سنوری خۆی و لەخواروی شاری موسڵدا تا خاڵی پێگەیشتنی سنوری ئێستای عێراق- سوریا درێژدەبێتەوە. بنکەی سێگۆشەکەش ئەو بەشەی کوردستانە کە سنوری ئێستای عێراق- تورکیای پێدا ڕەت دەبێت.

٤-کەواتە بەپێی هێڵەکانی درێژی و بازنەکانی پانی کوردستانی باشور دەکەوێتە نێوان بازنەکانی پانی (٣٣-٣٧) پلەی باکورو، هێڵەکانی درێژی

(٤١-٤٦) پلەی خۆرهەڵاتەوە کوردستانی باشور دەکەوێتە باکورو باکوری خۆرهەڵاتی عێراقەوە.
٥-روپێوی کوردستانی باشور دەوربەری (٨٥٠٠٠ کچگ- کیلۆمەتری چوارگۆشە[41])یە. کوردستانی باشور لەپێنج مەڵبەندی پارێزگاو سیوحەوت قەزاو سەتوسی ناحیە پێکهاتووە[42] بەم شێوەیە:-

## یەکەم:- پارێزگای دهۆك[43]

لەچوار قەزا پێکهاتووە کە ئەمانەن:-
١-قەزای دهۆك: کە لەناحیەکانی دهۆكو دۆسکیو زاوێتە پێکهاتووە.
٢-قەزای ئامێدی: کە لەناحیەکانی ئامێدیو سەرسەنگو نێورەقریکانو بەرواری باڵا پێکهاتووە.
٣-قەزای زاخۆ: کە لەناحیەکانی زاخۆو سندیو گلیو رزگاری پێکهاتووە.
٤-قەزای سومێل: کە لەناحیەکانی سومێلو سلێڤانیو فایدە پێکهاتووە.

## دووەم:- پارێزگای هەولێر (ئەربیل)

لەحەوت قەزا پێکهاتووە کە ئەمانەن:-
١-قەزای هەولێر: کە لەناحیەکانی هەولێرو قوشتەپەو خەبات پێکهاتووە.
٢-قەزای مەخمور: کە لەناحیەکانی مەخمورو گوێرو کەندێناوەو قەراج پێکهاتووە.
٣-قەزای کۆیە: کە لەناحیەکانی کۆیەو تەقتەقو شۆرش پێکهاتووە.
٤-قەزای رەواندز: کە لەناحیەکانی رەواندزو برادۆستو دیانەو خەلیفان پێکهاتووە.
٥-قەزای شەقلاوە: کە لەناحیەکانی شەقلاوەو خۆشناو و حەریرو سەربەن پێکهاتووە.
٧-قەزای چۆمان: کە لەناحیەکانی چۆمانو حاجی ئۆمەران پێکهاتووە.

## سێیەم:- پارێزگای سلێمانی

لەدە قەزا پێکهاتووە کە ئەمانەن:-

١-قەزای سلێمانی: کە لەناحیەکانی سلێمانیو سەرچنارو تانجەرۆ بازیانو قەرەداغ پێکهاتووە.

٢-قەزای هەڵەبجە: کە لەناحیەکانی هەڵەبجەو سیروانو خورماڵو بیارە شارەزور پێکهاتووە.

٣-قەزای پێنجوێن: کە لەناحیەکانی پێنجوێنو ناڵپارێز پێکهاتووە.

٤-قەزای شارباژێڕ: کە لەناحیەکانی شارباژێڕو کەناروێو کارێزەو سرۆچا پێکهاتووە.

٥-قەزای پشدەر: کە لەناحیەکانی پشدەرو ناودەشتو هێرۆ پێکهاتووە.

٦-قەزای رانیە: کە لەناحیەکانی دوکانو سورداشو چنارانو مەرگە پێکهاتووە.

٨-قەزای دەربەندیخان: کە لەناحیەکانی دەربەندیخانو زەڕایەن پێکهاتووە

٩-قەزای چەمچەماڵ: کە لەناحیەکانی چەمچەماڵو ئاغجەلەرو سەنگا پێکهاتووە.

١٠-قەزای کەلار: کە لەناحیەکانی کەلارو پێبازو تیلەکۆ پێکهاتووە.

## چوارەم:- پارێزگای کەرکوك (تەئمیم)

لەسێ قەزا پێکهاتووە کەئەمانە:-

١-قەزای کەرکوك: کە لەناحیەکانی کەرکوكو قەرە حەسەنو شوان تازەخورماتو و بایچیو داقوقو قەرەهەنجیر پێکهاتووە.

٢-قەزای حەویجە: کە لەناحیەکانی حەویجەو عەباسیو ریازو شەا پێکهاتووە.

٣-قەزای دوبز: کە لەناحیەکانی دوبزو پردێو سەرگەڕان پێکهاتووە.

## پێنجەم:- لە پارێزگای موسڵ (نەینەوا)

حەوت قەزای پارێزگەکە سەربە کوردستانی باشورە، کەئەمانەن:-

١-قەزای موسڵ: کە لەناحیەکانی موسڵو بەعشیقە پێکهاتووە.

٢-قەزای حەمدانیە: کە لەناحیەکانی حەمدانیەو کەلەكو نەمرودو بەرتەلە پێکهاتووە.
٣-قەزای تەلکیف: کە لەناحیەکانی تەلکیفو وانەو ئەلکیش پێکهاتووە.
٤-قەزای شنگار: کە لەناحیەکانی شنگارو شیمالو قەیرەوان پێکهاتووە.
٥-قەزای تەلەعفەر: کە لەناحیەکانی تەلەعفەرو زومارو ئاڤگەنیو رەبیعە پێکهاتووە.
٦-قەزای شیخان: کە لەناحیەکانی شیخانو مریبەو ئەتروش پێکهاتووە.
٧-قەزای ئاکرێ: کە لەناحیەکانی ئاکرێو نەهلەو ناوکورو سورچیو گردەشین پێکهاتووە.

## شەشەم:- لە پاریزگای تکریت (سەلاحەدین)

قەزایەکی پاریزگاکە سەر بەکوردستانی باشورە، ئەویش قەزای توزخورماتووە، کە لەناحیەکانی توزخورماتوو ئامرلیو سلیمان بەگو نەوجولو قادرکەرەم پێکهاتووە.

## حەوتەم:- لە پاریزگای بەعقوبە (دیالە)

چوار قەزای پاریزگاکە سەر بەکوردستانی باشورە کەئەمانەن:-
١-قەزای خانەقین: کە لەناحیەکانی خانەقینو مەیدانو قۆرەتوو جەلەولاو قزلربات پێکهاتووە.
٢-قەزای مەندەلی: کە لەناحیەکانی مەندەلیو قەزانیەو بەلەدروز پێکهاتووە.
٣-قەزای شارەبان: کە لەناحیەکانی شارەبان پێکهاتووە.
٤-قەزای کفری: کە لەناحیەکانی کفریو جەبارەو سەرقەلاو کۆکسو قەرەتەپە پێکهاتووە.

## هەشتەم:- لە پاریزگای کوت (واست)

قەزایەکی پاریزگاکە سەربە کوردستانی باشورە، ئەویش قەزای بەدریە کە ناحیەکانی بەدرەو زرباتیەو جەصان پێکهاتووە[٤٤]

فەسلی دووەم

# پەرەسەندنی جیۆلۆجییو جۆری خاکی کوردستانی باشور

## (٢-٢-١)؛ میژووی جیۆلۆجیی ناوچەکە

میژووی پەرەسەندنی جیۆلۆجیی ئەوە دەردەخات کە کوردستانی باشور هەروەکو عیراق، بەشیك بووە لەو کیشوەرە مەزنەی کە نیشتمانی ئیستای فارسو عەرەبو بەشی گەورەی کیشوەرەکانی ئوستralیاو ئەفریقاو ئەمریکای لاتینی پیکدەهیناو، بەکیشوەری (گۆندوانالاند Gondwanaland) ناودەبریت.

کۆلینکارییە جیۆلۆجییەکان پیکهاتنی بەردی خاکی عیراق بەشیوەیەکی گشتی دەبەنەوە بۆ هەر چوار سەردەمە جیۆلۆجییەکە.

لەچەرخی پەرمیدا، زۆرینەی بەشەکانی باکورو خۆرهەلاتی ناوچەکانی باشوری خۆرئاوای ئاسیا بەکوردستانیشەوە، لەژیر ئەو دەریا مەزنەدا بووە کە جیۆلۆجییەکان بە (دەریای تەتس Tethys sea) ناوی دەبەن.

لەسەرەتاکانی چەرخی مەیۆسیندا ئاوی دەریای ناوبراو بەرەو کەمبوونەوە چووە زەوییەکەی ژیری وردە وردە لەبەرزبوونەوەو دەرکەوتندا بووە. هەر لەوچەرخەدا هاتنەوەیەكو چوونەوەیەکی زۆر روویانداوە، بەشەکانی ئاسیای بچوك بەرەو ئاقاری ئەو بەشانەی کە بەرگرییەکی زۆری ئەو گۆرانکارییانەیان دەکرد (نیمچە دورگەی عەرەب)، بایاندا. بۆیە ئەم چەرخە دوا قۆناغی گرنگی قۆناغەکانی پیکهاتنی جیۆلۆجیی ئەم ناوچەیەو لەکۆتایی چەرخی ناوبراودا هەموو ئەو زەوییانەی ئیستا پییان دەوتریت عیراق، دەرکەوتن[٤٥]

هەرلەم چەرخەدا جوڵانەوەیەکی مەزن کەپالەپەستۆی خستە سەر چینە نەرمەکانی دەریای تەتس، روویداو لەپاشاندا چیا پیچ خواردووەکانی لیکەوتەوە. چیاکانی تۆرۆس لەو دیاردە سروشتییەی ئەو رووداوەن، واش دەردەکەویت ئەو جوڵانەوەیە لەهەریمی چیاکانی کوردستانی باشوردا، جگە لەناوچەکانی ئەوپەری باکورو باکوری خۆرهەلاتیدا نەبیت، هیندە بەزەبر نەبووبیت، بۆیە دەبینین چیاکانی کوردستانی باشور بەشیوەیەکی گشتی لەجۆری پیچ خواردووی ساکارن. ئەمە جگە لەوچیایانەی باکورو خۆرهەلاتی کوردستانی باشور کەبەهۆی نزیکییان لەچەقی پالەپەستۆکەوە لەجۆری پیچ خواردووی ئالۆزن[٤٦]

لەچەرخی پلیۆسیندا، جوڵانەوە پیچ ئامیزەکان لەوپەریدابوو، ئەو جوڵانەوانەی کەپاشان سیستمی ئەلپییان لیکەوتەوەو چیاکانی زاگرۆس بەچیاکانی کوردستانی باشوریشەوە، دوا شیوەی ئیستایان بەئاقاری باکوری خۆرئاوا باشوری خۆرهەلات وەرگرتو دواجار لەسەرەتاکانی زەمەنی چوارەمی چەرخی پلیۆستۆسیندا جوڵانەوە پیچ ئامیزەکان پیکهاتنی چیاکانی کوردستانی باشوریان گەیاندە ئەنجام.

وەکو دەرەنجامی ئەم حالەتەش، زەوییەکانی عیراق رۆچوونو ئەم ناوچەیەی لیکەوتەوە کەئیستا بەدەشتی لیتەیی، یا رەشەخاکەکان ناسراوە.

ناوچە شاخاوییە پیچ خواردووە ئالۆزەکانی بەردە ئاگرینەکان، بەدریژایی سنوری خۆرهەلاتو باکوری خۆرهەلاتی کوردستانی باشور دەکشین. لەپاریزگای سلیمانی بەدریژایی ناوچەکانی خۆرهەلاتو باشوری خۆرهەلاتی هەلەبجەو ناوچەکانی خۆرهەلاتو باکوری خۆرهەلاتی پینجوینو، خۆرهەلاتو باکوری خۆرهەلاتی رانیە دەکشین. هەروەکو لەپاریزگای ئەربیلیشدا بەشیکی گەورەی رەواندزو بەتایبەتیش ناوچەکانی خۆرهەلاتو باکوری شارۆچکەکەو ناوچەکانی باکوری شارۆچکەی زیبار دەگریتەوە. لەپاریزگای دهۆکیش بەدریژایی ناوچەکانی ئەوپەری باکوری زاخۆو ئامیدی دەکشین.

پیکهاتە ئەیۆسینییەکانیش کە لەهەمان ناوچەی شاخاوی پیچ خواردووی ئالۆزدا دەردەکەون، لەبەرزاییەکانی پینجوینو چیاکانی ماوەتو قەندیلدا هەن.

نمونەی بەردە کلسیو شیلییەکانی چەرخی ئەیۆسین لەچیای شنگارو نیوان زاخۆو ئاکرێو هەروەها لەنیوان هەلەبجەو رانیەدا تائیستا بەروونی دەبینرین. بەلام ئەو بەردانەی کە بۆ چەرخی ئۆلیکۆسین دەگەریتەوە، لەناوچەیەکی بچوکی نیوان زیی گەورەو زیی بچوک لەچیاکانی قەرەچوخدا دەردەکەویتو هەر بەکلسی قەرەچوخیش ناسراوە. ئەمە لەکاتیکدا بەردی چەرخی مەیۆسینی نزم لەناچەی جزیرەو چیای حەمریندا دەرکەوتوون.

جگە لەم پیکهاتانە، پیکهاتە کۆنەکانی چەرخی پەرمیو کریتاسیو جوراسی لەبەشی خوارووی خۆرهەلاتی هەلەبجەو لەسووررداشدا دەردەکەوون. بەرزاییەکانی باکوری ئاکرێو بەرزاییەکانی ئامیدیو ریکانو سندی پیکهاتەی جوراسیو ناوچەکانی گلیو سندی پیکهاتەی پەرمییان تیدا دەردەکەویت. لەپاریزگای سلیمانیو هەروەها ناوچەکانی کۆیەو رەواندزو زیباردا، پیکهاتەی کریتاسی دەردەکەوون. پیکهاتەکانی فارسی بالاش لەچەمچەمالو بەرزاییەکانی قەرەداغو بەرانانو گەوەکانی مەتینەو چیای سپیو ئاکرێو هەیبەت سولتانو پیرماما‌دا خۆدەنوینن‌و پیکهاتەکانی فارسی نزمیش لەنەینەوا، پاشانیش لەتەنیشت هەلەبجەوەو هەروەها لەکەرکوكو کفری قادرکەرەمو قەرەحەسەنو تەقتەقو سلیمانیدا، پیکهاتەکانی بەختیاری دەردەکەون. هەموو پیدەشتەکانی شارەزوورو رانیەو پشدەرو حەمرینو حەویجەو کەرکوكو هەولیرو دیبەگەو کەندیناوەو سندی، لەپیکهاتەکانی چەرخی پلۆستۆسینو چەرخی نوین[٤٧]

گرنگی پیکهاتەکانی جیۆلۆجیی کوردستانی باشور لەوەدایە کە چەند جۆریك لەوپیکهاتە بەردانەی تیدایە کەپیوەندی راستەوخۆیان بەچالاکیو بژیوی مرۆڤەوە هەیە. بۆ نمونە بەشیکی گەورەی ئەو پیکهاتانە خەسلەتیکی کلسییان هەیە، بەردە کلسییەکان ئاوی بارانو هەلدەمژنو پاشان لەشیوە کانیاوو کاریزدا دەیدەنەوە. ئەمەش کاراییی گەورەی بەسەر دابەشبوونی دانیشتوانەوە هەیە لەکوردستانی باشوردا. وەکو تریش بوونی بەردە ئاگرینەکان کە بەدریژایی هەریمی شاخاوی پیچ خواردووی ئالۆز کشاون، پیوەندی گەورەیان بەبوونی سامانو کانزاکانی ژیر زەوییەوە هەیە.

## (٢-٢-٢): جۆرەكانی خاكی كوردستانی باشور

كۆمەلێك هۆكار خەسلەتەكانی هەر خاكێكمان بۆ دەستنیشان دەكەن لەوانە: جۆری بەردە ئەسلییەكان و تەمەن و رادەی شیتەڵ بوونیان، ئینجا كاریگەریتی كەشوهەواو رووەك و تۆبۆگرافیاو، پاشانیش ئەو ریوشوینانەی كە مرۆڤ لەبەكارهێنانی خاكدا دەیگریتەبەر.

لەهەمان پیودانگەوە پێ‌بەپێی جیاوازی مۆرفۆلۆجیای كوردستانی باشور خاكەكەشی لەشوینكەوە بۆ شوینیكی تر، جیاوازی هەیە.

بەشیوەیەكی گشتی، خاكی كوردستانی باشور لەوجۆرە خاكانەیە كە بریكی زۆر ماددەی خۆراكی‌و خویی وەكو كالیسیۆم‌و گۆگردو فۆسفۆرو پۆتاسیوم‌و نایترۆجینی تیدایەو، هەلكەوتی خاكەكەشی بەجۆریكە كە سیستمی ئاوو ئاوەرۆی بەشیوەیەكی سروشتی لەبارەو بری بارانی سالانەی باش‌و، كەمی رادەی بەهەلم بوون لەزۆربەی ناوچەكانیدا وایكردووە سویری خاك نەبیتە تەنگوچەلمە.

بەپیی ئەو پۆلینەی (پ. بورینگ) بۆ خاكی عیراق كردوویەتی، خاكی عیراق بەكوردستانەوە دابەشی چواردە پۆلی جیاجیای خاك كراوە، كە دەكریت لەهەمان سۆنگەوە كوردستانی باشور بۆ حەوت پۆل لەوچواردە پۆلە بەم شیوەیە ریزبەند بكریت:[٤٨]

١-خاكی كەستەنائی Chestnut Soils

ئەم شیوەیە خاكە دەشتەكانی ناوچە شاخاوییەكان دەگریتەوە گرنگترینیشیان دەشتی شارەزوورو دەشتی رانیەو دەشتی سندییە. ئەم خاكە لەبەشەكانی سەرەوەیدا خاكیكی فشەلە، رەنگی قاوەییەكی مەیلەو سوورە ئەم جۆرە خاكە لەوناوچانەدایە كەهاوینی گەرم‌و زستانی بەشیوەیەكی مامناوەندی باراناوییەو بری بارانەكەی لەنیوان (٤٠-٨٠سم)دایە. ئەم خاكە بەریژەی (١-٤٪) خۆراكی ئۆرگانی تیدایە.

٢-خاكی قاوەیی بۆر Brown Soils

لەوەکــەی پێشــووتر بڵاوەتــرەو دەکەوێتــە ســنوری ناوچــەی نیمچــە شاخاوییەوە. رەنگەکەی بۆرێکــی مەیلەوسـوور دەچێتـەوە. ئـەم جـۆرە خاکـە زۆرتـر لەکەنارەکانی بەردی خۆرهەڵاتی دەشتی نیشـتەیی لەوپـەڕی باشـوری خۆرهەڵاتی کوردستانی باشوردا دەبینـرێت‌و، بەشێوەیەکی گشـتیش خۆراکی ئۆرگانی لەجۆری یەکەم کەمترە.

### ٣-خاکی قاوەیی سور Reddish Brown Soils

زۆربـەی دەکەوێتـە بەشـەکانی خـوارەوەی هــەرێمی نیچمـە شـاخاوییەوە. لـەباکوری خۆرئـاوا لـەبانی جزیـرەوە تاسـنوری رەشـە خاکـەکان لەوپـەڕی باشــوری خۆرهــەڵاتی کوردســتان دەکشــێت‌و خــاکی دەشــتە گردۆڵکەییــە راکشاوەکانی کەناری خۆرهەڵاتی رەشە خاکەکانیش لـەخۆدەگرێت. ئەم شێوە خاکە قاوەییەکی مەیلەو سوورە. بەشێوەیەکی گشتی رووتانەوەی بایۆلۆجی‌و کیمیایی لەم جۆرە خاکەدا کەمە.

### ٤-خاکی چیا Montain Soils

دەکەوێتە دەوروبـەری سنوری هـەرێمی شـاخاوییەوە. پێ‌بـەپێی جیـاوازی مۆرفۆلۆجیـاو بـەرزی‌و لێــژی‌و رووتــەنی ناوچەکــە، ئــەم شــێوە خاکــەش لەگۆڕاندایەو هەمووی بەیەك جۆر ناچن.

### ٥-خاکی تەنکە بەردەڵان Lith Soils

ئەم شێوە خاکە لەبەرزاییەکانی سنوری هەرێمی ناوچە شاخاوییەکاندایە. لەسەر بەردو تاشەبەردی کلسی‌و گەج دروستبوون.

### ٦-خاکی نیشتەنیی سوێری دەشتی خۆرهەڵات
### Saline Alluvial Soils of The Eastern Plain

دەکەوێتە بەشی خۆرهەڵاتی رەشە خاکەکانی نێوان دیجلەو سنوری ئێران-عێراقی ئێستا. بەشێوەیەکی گشتی هەموو ناوچەکانی خوار کۆتایی زنجیرەی حەمرین بەئاقاری باشوری خۆرهەڵات دەگرێتەوە. ئەم شێوە خاکە لەئەنجامی لیتەی رووباری دیجلەو سێڵاوی چۆم‌و لافاوی ئەو باراناوەوە دروست بووە کە لەچیاکانی کوردستانی خۆرهەڵاتـەوە دێن. ئـەم خاکـە روویـەکی زۆر تـەختی هەیەو رێژەی خۆی لەبەشە نزمەکانیدا زۆرە.

### ٧-خاکی نیشتەنیی سوێری دەشتی لیتەیی
### Saline Alluvial Soils of The Plain

روپێوێکی بچوکی خاکی کوردستانی باشور پێکدەهێنێت، دەکەوێتە باکوری رەشە خاکەکانی عێراق و خۆرئاوای خاکی نیشتەنیی سوێری دەشتی خۆرهەڵاتەوە. ئەم خاکە لەئەنجامی پێچ خواردنی رووبارو چۆمەکانەوە دروست بووەو، لە بەهاراندا رووەکەی ئاو دایدەپۆشێت و ساڵانە بەچینی تازەی خاکوخۆڵ پردەبێتەوە[٤٩]

بەشێوەیەکی گشتی خاکی کوردستانی باشور بە بەراورد لەگەڵ خاکی عێراقدا، جیاوازییەکی زۆری هەیە. لەکاتێکدا زۆربەی جۆرەکانی خاکی عێراق، بەتایبەتیش ئەو شەش جۆرەی کەرەشە خاکەکانی عێراقی لێ پێکهاتووە[٥٠]، بەرێژەی ٦٠٪ لەسەرجەمی ئەو زەوییانەی لەرێی ئاودێرییەوە کشتوکاڵیان تێدا دەکرێت بەدەست سوێرییەوە دەناڵێنن[٥١]، خاکی کوردستانی باشور لەو تەنگژەیە بەدوورەو رووبەڕووی تەنگژەی تری وەکو راماڵینی خاک بۆتەوە. راماڵین دەرەنجامی چەند هۆکارێکە، گرنگترینیان: رادەی لێژیی زەوی و، باری رووەکی سروشتی و کێڵانی ناڕاست و بارانی بەخوڕو، لافاوو تووندەبای بەهێزە.

راماڵینی خاک چارەسەری تایبەتی خۆی هەیە. دەکرێت بەچەند هۆیەك کاریگەرێتی راماڵین تا رادەیەکی زۆر کەم بکرێتەوە. لەوانە: پاراستنی رووەکی سروشتی، دروستکردنی بەربەست لەچاڵایی و درزو زەمینە لێژەکاندا، دروستکردنی بەربەست لە درەختە بەرزو سەوزەکان بەمەبەستی کەمکردنەوەی هێزی تووندەبا، پیرەوکردنی کێڵانی ستونی لەقەدپاڵە لێژەکاندا، هەروەها دامەزراندنی رێژگەی دەستکرد بەمەبەستی کۆکردنەوە ئاوی زیادە[٥٢]



**نەخشەی ژمارە (٢)**

**جۆرەکانی خاك لەکوردستانی باشوردا**

## فەسلی سێیەم

# جیۆمۆرفۆلۆجیای کوردستانی باشور

### پێشەکی:-

خاکی کوردستانی باشور، خاکێکی فرەڕوو و فرەچەشنە.. لەباکورەوە بۆ باشور، لەخۆرهەڵاتەوە بۆ خۆرئاوا، ڕووی خاکەکەی جیاوازی هەیە جیۆمۆرفۆلۆجیای کوردستانی باشور وەکو دەرەنجامی بارودۆخی ڕووی خاک، چەند بارێکی جیاجیای بەخۆوە گرتووە. لەکاتێکدا بەرزی ڕووی خاکی کوردستانی باشور لەچیا بەرزەکانیدا لەسێ هەزار مەتر تێدەپەڕێنێت، کەچی بەرزی هەمان خاك لەپێدەشتەکانی ئەوپەڕی باشوریدا، لەچەند مەترێکی کەم بەرزتر لەئاستی ڕووی دەریا، زۆرتر تێناپەڕێت.

ئەگەرچی لەڕووی تۆبۆگرافییەوە، کوردستانی باشور لەدوو هەرێمی سەرەکی؛ هەرێمی شاخاوی‌و هەرێمی نیمچە شاخاوی پێکدێت[٥٣] کەچی لەڕووی جیۆلۆجییەوە دەکرێت هەر لەمیانەی ئەو دوو هەرێمەدا پێنج ناوچەی جیاجیا دەستنیشان بکرێن بەم شێوەیە: ناوچەی شاخاوی، ناوچەی دەشتە شاخاوییەکان، ناوچەی قەدپاڵە شاخاوییەکان، ناوچەی بانە گردۆڵکەییەکان‌و، ئینجا ناوچەی دەشتە گردۆڵکەییەکان. ئەمە جگە لەبوونی هەرێمێکی بچوکی خاك دەشتە لیتەییەکان[٥٤]

هەر ئەم جیاوازییە جیۆمۆرفۆلۆجییەشە، جیاوازی لە کەشوهەوای کوردستانی باشوردا بەرجەستە کردووە... لەکاتێکدا بارانی ساڵانەو بەفر

لەناوچە شاخاوییەکاندا بەبڕێکی زۆر دەبارێن، کەچی تابەرەو باشورو باشوری خۆرئاوا بچین، بەپێچەوانەی ناوچە شاخاوییەکانەوە ئەو بڕە لە کەمبووندا دەبێت.

هەروەها جیاوازی جیۆمۆرفۆلۆجیا، کاریگەریی گەورەی بەسەر جۆری خاکی کوردستانی باشورەوە جێهێشتووە.. جۆری ئەو خاکەی لەچیاکاندا هەیە، هەمان ئەو خاکە نییە کە لەبانەکانو رەشە خاکەکانیدا هەنو، ئەو خاکەش لەدەشتە شاخاوییەکاندا هەیە، هەمان جۆری خاکی دەشتەکانی هەرێمی هەردەکان (ئەستێبس) نییە.

دیسانەوە جیاوازی رووی خاك کاریگەریی خۆی لەسەر بوونی کانزاکانو شێوەی دابەشبوونی ئەو کانزایانەوە کۆبوونەوەیانی لەژێر زەویداو، پاشانیش جێپەنجەی خۆی بەسەر چۆنێتی دابەشبوونی رێگەوبانو هاتوچۆی ناوچە جیاجیاکانی کوردستانی باشورەوە جێهێشتووە.

دواجار جیاوازییەکانی رووی خاك، رۆڵی گەورەی لەچۆنێتی گوزەرانی دانیشتوانی کوردستانی باشورو، دابەشبوونو نیشتەجێبوونیاندا بینیووە.

### (٢-٣-١): هەرێمی شاخاوی

بەشێوەیەکی گشتی، چیاکانی کوردستان بەشە ناوەندییەکانی زنجیرە چیاکانی زاگرۆسو تۆرس پێکدەهێنن. ئەو چیایانەی لەخۆرئاوای ئێستای ئێرانو باکورو باکوری خۆرهەڵاتی ئێستای عێراقو باشوری خۆرهەڵاتی ئێستای تورکیاوە دەکشێنو، لەباکورەوە دەگەنە ئاراراتو سنورەکانی وڵاتانی ئاسیای ناوەڕاستو، لەباشوریش تا کەنارەکانی خۆرهەڵاتی کەنداوی فارس درێژدەبنەوە، لایەکانی خۆرئاواشیان لەتۆرۆسەوە نزیکی کەنارەکانی باکوری خۆرهەڵاتی دەریای سپی ناوەڕاست دەبنەوە.

ئەم هەرێمە شاخاوییە کە بەشێکی سیستمی ئەلپییەو لەچیاکانی ئەلپی ناوەڕاستەوە لە بەڵقان بەرەو زنجیرەکانی تۆرۆس- زاگرۆسو ئینجا بەرەو هیمالایا بەئاقاری باشوری خۆرهەڵات درێژدەبنەوە، ئەو سیستمە هەمان ئاقاری درێژبوونەوەی لای چیاکانی کوردستان بەگشتیو چیاکانی کوردستانی باشور بەتایبەتی جێهێشتووە.

چیاکانی کوردستانی باشور°° لەشێوەی داسولکەیەکدا، لەسنورەکانی ئێستای عێراق- ئێران- تورکیاوە بەئاقاری باکوری خۆرئاوا- باشوری خۆرهەڵاتو تێکڕای بەرزیی (١٠٠٠-٣٦٠٠م) درێژدەبنەوە.
سەرجەم ڕوپێوی هەرێمەکە- مەبەست لەهەرێمی شاخاوییە (٢٣,٣٧٠کچگ) دەبێتو بەوپێیەش (٢٧,٤٩٪)ی سەرجەم ڕوپێوی کوردستانی باشور دەگرێتەوە.
تاله باشورەوە بەرەو باکورو، لەخۆرئاواوە بەرەو خۆرهەڵاتی کوردستانی باشور بچین، ئاستەکانی زەویش لەبەرزبوونەوەدا دەبێت. لە ناوچەکانی باشورو خۆرئاوای هەرێمەکەدا، زنجیرەکان زنجیرەی نزمو ڕووتەنو هاوتەریبنو چەندین دەشتی گردۆڵکەیی تانوپۆر لەنێوان ئەو زنجیرانەدا دەبن. کەچی وردە وردە چیاکان بەرەو بەرزبوونەوەو زنجیرەکان بەرەو تێکچڕژانو دەشتەکان تەسکو شیوو دۆڵەکان قوڵو گژو گیاو ڕووەکی سروشتیو درەختو دارستان ڕوو لە زۆربوونو چڕبوونەوە دەبن.
جوڵانەوە پێچ خواردووە چالاوییەکانی ئەم هەرێمە، بەپێچەوانەی ئەوەکەی هەرێمی نیمچە شاخاوییەوە، تیژڕەوو قوڵو تەسکەو جوێکردنەوەی دۆڵو شیوەکانی نێوان زنجیرە چیاکان، وەکو دەستنیشانکردنی پێدەشتە ڕووتەختەکانی هەرێمی دووەم نییە.
بەهۆی بڕی بارانی ساڵانە کە لەنێوان (٥٠-١٠٠سم) دایەو مانەوەی (١٠-١٢) مانگەی بەفر لەبەشێکی زۆری چیاکانی هەرێمەکەدا، ڕاماڵینو ڕووتانەوەی یەکبینە خەسڵەتێکی دیاری هەرێمەکەیەو، بەشێوەیەکی گشتیش هێشتاکە هەرێمەکە لەقۆناغی دروست بوونو تازەبوونەوەی بەردەوامدایە. هەر بەهۆی ئەوبڕە زۆرەی بارانو بەفری ساڵانەو پاشانیش بەهۆی ئەو سیستمی ئاوو ئاوەڕۆیەی لەهەرێمەکەدا لەئارادایە، ئەم هەرێمە بە یەکەمین سەرچاوەی سەرەکی ئاوی کوردستانی باشور دادەنرێت.
پێبەپێی بەرزیو بینای جیۆلۆجیی، دەکرێت هەرێمی شاخاوی بۆ دوو ناوچە دابەش بکرێت، کە بریتین لە:-

یەکەم: ناوچەی شاخاوی پێچ خواردووی ئاڵۆز (٢١٠٠-٣٦٠٠م).
دووەم: ناوچەی شاخاوی پێچ خواردووی ساکار (١٠٠٠-٢١٠٠م).

لەکاتێکدا بەرزایی چیاکانی ئەم ناوچەیە لەنێوان (٢١٠٠-٣٦٠٠م)دایە، کەچی هێندێك دۆڵو شیوی بەقوڵایی (١٠٠م) لەدامێنی چیاکاندا ڕۆچووە. بۆیە ئەم ناوچەیە بەناوچەیەکی دابڕاو لەسەرجەم ناوچەکانی تری کوردستانی باشور دادەنرێت. بەتایبەتی کە کەمترین ڕێگەوبانی هاتوچۆی تێدەکەوێتو فاکتەرە سروشتییەکان هەر لەکۆنەوە وایانکردووە نیشتەجێبوون بەشێوەیەکی سنوردارو پچڕپچڕ بێت.

ئەم هەرێمە یەك بەدوای یەك ئەم زنجیرە چیایانەی تێدەکەوێت:

١-چیاکانی نێوان سنوری عێراق- تورکیای ئێستاو ناوچەی چۆمی خاپور کەچیای شرانش (٢٠٥٢م)و گەوەکانی چیاکیرێ (١١٨٦م)و چیا دیرێ (١٢٣٠م)و گەوەکانی ڕەشوانی (٢٠٢٣م) دەگرێتەوە.

٢-چیاکانی نێوان چۆمی خاپورو زێی گەورە، ئەمیش لەدوو زنجیرە پێکدێت؛ چیاکانی زۆزان حەرور یان چیا زینان (٢٤١١م) کە زنجیرەی باکور پێکدێنێت، زنجیرەی باشور لەهەردوو چیای مەتینە (٢٠٩٥م) لەخۆرئاواو، سەری ئامێدی (٢٠١٣م) لەخۆرهەلات پێکدێتو ئەمیان بەهەردوو چیای سەربزێنی (١٩٠٢م)و چیای بەرواری بالا (٢٠٩٧م) بەستراوەتەوە.

٣-چیاکانی نێوان زێی گەورەو ڕووباری کوچك، کەدیارترینیان چیای کۆهی ژێر (٢٢٨٢م)و چیای سوکی (١٦٣٥م)و چیای باروش یا شیرین (٢٣٧٨م)و چیای سەرمێدانە (٢٦٠٨م).

٤-چیاکانی نێوان ڕووباری ڕەواندز، گرنگترینیان زنجیرەی برادۆستە (٢٠٧٦م) لەخۆرهەلاتی زێی گەورەو چیای زۆزگ (١٨٢٩م)و چیای پیران (٢٠٧٦م)و گەوەکانی حەسارۆست لەنێوان ڕووباری ڕەواندزو ڕووباری حاجی بەگ کە لوتکەی هەلگورد (٣٦٠٧م) بەرزترین لوتکەی زنجیرەکەو بەرزترین لوتکەی کوردستانی باشورە، ئینجا زنجیرەی چیای دۆڵەمەڕ کە سەرکلاوە (٣٣٩٩م)و شاکێف (٣٠٦٨م)و سەربەندان (١٨٠٠م) دیارترین لوتکەکانیەتی.

هەر لەم ناوچەیەدا چیاکانی چیامەنداو (٢٤٤٠م)و چیای کوڕەك یا خەلیفان (٢١٢٥م)و چیای بیجان (٢١٧١م)و چیای کونەکۆتر (٢٦٩٢م)و چیای کارۆخ (٢٥٦٠م) درێژبوونەتەوە.

٥-چیاکانی نێوان ڕووباری ڕەواندزو زێی بچوك، ئەمیش بە درێژایی سنورەکانی ئێستای عێراق- ئێران دەکشێنو گەوەکانی قەندیل کە لوتکەی

حاجي برايم (٣٤٥٢م)و لوتكەی حاجي ئۆمەران (١٧٨٠م)و چياكاني دريـزه (٢٣١٤م) ديارترين لوتكەكاني دەگرێتەوە.

٦-چياكاني نێوان زێی بچوك‌و چۆمی سيروان ئەميش بەهەمان شێوە هێڵی سنوری ئێستای عێراق- ئێران پێكدەهێنێت‌و چياكـاني سوركێو (٢٢٢٣م)و كۆتـره رەش (٢٧٥٢م)و چيـای بەردەسـپی (٢٤٨٩م)و چياكـاني هـەورامان (٢٥٤٨م)و چياكاني پێنجوين (١٥٠٠-٢٠٠٠م) دەگرێتەوە.

٧-چياكاني باكورو باكوری خۆرهەڵاتی شاری سلێماني، كەئـەم چيايانـە دەگرێتەوە: چيای كورەكاژاو (١٩٥٧م)و چيای گۆمەدۆڵ (١٣٣٢م)و كونەكۆتر (٢٧٦٤م)و چيـای پيرەمـەگرون (٢٦٢٠م)و چيـای شـێرباخ (٦٣٧م)و ئـەزمڕ (١٧٠٢م)و گويژه (١٥٢٤م)و سەرمەند (١٤٨٦م).

## دووەم: ناوچەی شاخاوی پێچ خواردووی ساكار

ئەم ناوچەيە دەكەوێتە نێـوان ناوچـەی شـاخاوی پێـچ خـواردووی ئـاڵۆزو هـەرێمی نيمچـە شـاخاوييەوە. لـەو زنجـيره چيـا پێچاوپێچانـە پێكدێـت كەبەشێوەيەكی گشتی تەريب لەپاڵ يەكدا دەكشێن‌و ئەو دۆڵ‌و شيوه درێژانـە لەئامێز دەگرن كە لەبنەڕەتدا چەند پێچێكی چاڵاوين‌و، ئاوو ئاوەڕۆی ناوچەكە كـەندڕو نيشـتەيەكی زۆری تێـدا جێهێشـتووەو وايكـردووه رووی خـاكی ناوچەكە شێوەيەكی ناجۆرو نارێكوپێكی هەبێت.

سەرەڕای بوونی چەند دۆڵێكی شاخاوی لەنێوان زنجيره چياكان‌و، چەند دەشتێكی تاڕادەيەكی فراوان، ناوچەی شاخاوی پێچ خواردووی ساكار لە دوو هێڵی سەرەكی زنجيره چياكـان پێكدێت كە شان بەشـانی يـەك كشـاون. هێڵـی يەكەم كە هێڵی باكوری ناوچەكە پێكدێنێت، لەچياكاني گاره (٢١٦٠م)و چيای پـێرس (١٦٢٤م)و چيـا خـێرێ (١٤٧٠م)و چياكـاني پـيران (١٦٥٢م)و چيـای حـەرير (١٤٤١م)و چياكـاني بـانزاد (١٥٣٠م)و چياكـاني تاسـڵوجە (٩١١م)و چياكاني بەرانان (١٣٧٣م)و كێوی بەمۆ (١٨٢٨م) پێكهاتووە.

هێڵی دووەميش كەهێڵی جياكـەرەوەی نێـوان هـەرێمی شاخاوی‌و هـەرێمی نيمچە شاخاوييە، لەباكوری خۆرئـاواوە بـۆ باشـوری خۆرهـەڵات لـەم چيايانـە پێكهاتووە: چيـای بێخێر يان چيا سپی (١٣٠٢م)و چيـای بكرمـان (١٠٢٤م)و

چیای ئاکرێ (١٥٤٨م)و چیای باباجیجك (١٠٠٥م)و چیای پیرمام (١٠٩٠م)و چیای سەفین (١٤٧٥م)و چیای هەیبەت سوڵتان (١٢٠٦م)و چیاکانی بازیان (١٥٤٤م)و چیای سەگرمە (١٧٢٧م)و چیای هەنجیرە (١٣٧٢م)و چیای قەرەداغ (١٠٧٦م)و چیای زەردە (١٧٩٥م).

لەپاش ئەو زنجیرە چیایانە، ئەو پێدەشتانە دێن کە دەکەونە نێوان ناوچەی شاخاوی پێچ خوارووی ساکارو ناوچەی شاخاوی پێچ خواردووی ئاڵۆزەوەو بەدەشتە شاخاوییەکان ناسراون و گرنگترین دەشتەکانی هەموو ناوچەی شاخاوی پێکدەهێنن و سەرەکیترین مەڵبەندەکانی دانیشتوان و نیشتەجێبوون و سەرچاوەی کشتوکاڵی ناوچەکەی تێدەکەوێت دەشتەکانیش بریتین لە:-

١-دەشتی سندی (یان دەشتی زاخۆ)

دەکەوێتە نێوان زێی گەورەو روباری دیجلەوە. لەرووباری هیزڵ- سنوری ئێستا عێراق و تورکیا-ەوە بەرەو خۆرهەڵات بەدرێژایی (٣٥کم)و تێکڕای پانی (٦کم) دەکشێت. لەباکورەوە چیاکانی چیاکێری و چیادێری، لە باشورەوە چیای بێخێر دەورەی داوەو، زاخۆ گرنگترین شاری دەشتەکە پێکدەهێنێت.

دەشتی سندی لەخۆرهەڵاتەوە دەشتی ئامێدی پێدەگات، کە پێدەچێت بەشێکی تەواوکەری دەشتی سندی بێت. لەباکوری دەشتی ناوبراوەوە چیای بەرواری باڵا؛ کەبەشەکەی خۆرهەڵاتی بەچیای ئامێدی و بەشەکەی خۆرئاوای بەمەتین ناسراوە، لەباشوریشەوە چیای بەرواری ژێر؛ کەچیای گارەشی پێدەوترێت دەوریان داوە. ئامێدی گرنگترین شاری دەشتی ئامێدی پێکدەهێنێت.

٢-دەشتی رانیە

زۆربەی ئەو زەوییانە دەگرێتەوە کەئاوەڕۆی زێی بچوکی پێش رێژگەکەی لە بەستی دوکان، پێدا رەت دەبێت.

زنجیرەی کێوەڕەش دەشتەکە دەکاتە دوو بەش، بەشەکەی خۆرهەڵاتی بە دەشتی پشدەر کە بەدرێژایی (٢٠کم) دەکشێت و، ئەوەکەی خۆرئاوای کە لەوەکەی تریان گەورەترە بەدرێژایی (٣٠کم) درێژ دەبێتەوەو بەدەشتی بیتوێن دەناسرێت. سەرجەم روپێوی دەشتەکە دەگاتە (٨٠٠کچگ). شارەکانی رانیەو

قەڵادزێ گرنگترین دوو مەڵبەندی دانیشتوانی دەشتەکەو بەشی دوکان لەسەر زێی بچوك گەورەترین پرۆژەی ئاودێری‌و وزەی ناوچەکە پێکدەهێنێت.

٣-دەشتی شارەزوور

دەکەوێتە ئەوپەڕی باشوری خۆرهەڵاتی هەرێمی شاخاوییەوە، لەنێوان چۆمی سیروان‌و زێی بچوکدا. چۆمی تانجەرۆ بەشەکانی ناوەڕاست‌و خۆرهەڵاتی ئاو دەدات‌و، چۆمی تابین بەشەکانی خۆرئاوای.

دەشتی شارەزوور کەبەچیاکانی بەرانان‌و گڵەزەردەو تاسڵوجە لەباشوری خۆرئاواوەو، چیاکانی گۆیژەو ئەزمڕو سورداش لەباکورو باکوری خۆرهەڵاتەوە چێوەکێشراوە، تادەشتی تابین بەدرێژایی (٤٥کم)و تێکڕای پانی (١٥-٢٠کم)و سەرجەم روپێوی (٦٧٥کچگ) دەکشێت‌و، دەشتی تابین وەکو سنورێکی سروشتی، سلێمانی لەدەشتی هەولێر جیادەکاتەوە.

مەڵبەندی پارێزگای سلێمانی‌و چەند شارێکی تری وەکو هەڵەبجەو سەیدسادق‌و عەرەبەت‌و هی‌تر دەکەونە سنوری دەشتەکەوە.

## (٢-٣-٢): هەرێمی نیمچە شاخاوی

روپێوی ئەم هەرێمە[٥٦] نزیکەی (٦١,٦٣کچگ)ە، کە دەکاتە (٧٢,٥١٪)ی سەرجەم روپێوی کوردستانی باشور. بەرزی خاك لەم هەرێمەدا لەنێوان (٢٠٠-١٠٠٠م)دایە، درێژی بەشەکانی باشوری کە سنوری جیاکەرەوەی نێوان کوردستانی باشور بەگشتی‌و رەشەخاکەکانی عێراق، دەگاتە دەوروبەری (٥٠٠کم)و تێکڕای پانی هەرێمەکە لەنێوان (٨٠-١٥٠کم)دایە. سنورەکانی باکوری بە پەنا ئەو زنجیرە چیایانەدا رەت دەبێت کە بەرزییان لەنێوان (١٠٠٠-٢٠٠٠م)دایەو لەشێوەی کەوانێکدا لەباکوری خۆرئاواوە بەرەو باشوری خۆرهەڵات کشاون.

ئەم هەرێمە بەپێچەوانەی هەرێمی شاخاوییەوە، زنجیرە چیاکانی نزم‌و درێژن، ژمارەیەکی زۆر دەشتی فراوان‌و گردو تەپۆڵکەی تێدەکەوێت کەساڵانە بەهۆی نیشتەی رووبارو چۆمەکان‌و توونده باوە، پڕبوونەتەوە.

رووبارو چۆمەکانی ئەم هەرێمە لەخۆرهەڵاتی دیجلەدا، جگە لەچۆمی عوزێم ئیتر ساڵ دوانزە مانگ ئاویان لەبەردەڕوات. ئەوانەی خۆرئاوای رووباری دیجلە

زۆربەی چەند چاڵو نشێوێکن، لەوەرزی باراندا پڕدەبنەوەو پاشان بەرەو زەوییە بیاباناوییەکانی خۆرئاوای عێراق رۆدەچن.

تالە باشوری خۆرئاواوە بەرەو باکوری خۆرهەڵاتی هەرێمەکە بچین، زنجیرە چیاکان کورتترو بەرزتر دەبنەوە. دەشتەکانیش تەسکترو بەرزتر دەبنەوەو نیشتەییەکانی ناوی قوڵترو زبرترو پتەوتردەبن.

بەهۆی جیاوازی رووی خاکی هەرێمەکەوە، دەکرێت هەرێمی نیمچە شاخاوی سێ ناوچەی جیاجیای تێدا دەستنیشان بکرێن، ناوچەکانیش:-

یەکەم: زنجیرەی چیاو گرۆدۆڵکەکان.

دووەم: پێدەشتەکان.

سێیەم: بانەکان.

## یەکەم: زنجیرەی چیاو گردۆڵکەکان

ئەم زنجیرانە لەشێوەی سێ کۆمەڵەی جیاجیادا، بەئاقاری باکوری خۆرئاوا- باشوری خۆرهەڵات خۆدەنوێن، بەم شێوەیە:-

-کۆمەڵەی یەکەم: ئەم کۆمەڵەیە ئەو بەشەیە کەسنوری باشوری ناوچەی نیمچە شاخاوی پێکدەهێنێتو لەچیاکانی حەمرین (٥٢٧م)و چیای ئیبراهیم (٥٣٦م)و چیای تەلەعفەر (٥٩٨م)و چیای ئەشکەفتە (٦٢٤م)و چیای شنگار (١٤٦٣م) پێکدێت.

زنجیرە چیای حەمرین لەخاڵی سنوری ئێستای عێراق- ئێرانەوە، لەخوارووی شارۆچکەی خانەقینەوە بەئاقاری باکوری خۆرئاوای شارۆچکەکە، تا خاڵی بەیەکگەیشتنی لەگەڵ رووباری دیجلە لەنزیك فەتحە دەکشێت. ئەم زنجیرەیە کە بەدرێژترین زنجیرە چیای کوردستانی باشور دادەنرێت، بەدرێژایی (٢٥٠کم)و تێکڕای پانی (١٢کم)و تێکڕای بەرزی (٢٠٠م)و ئەوپەڕی بەرزی (٥٢٧م) درێژبۆتەوە. لەم هەرێمەدا چیای شنگار کەبەرزییەکەی (١٤٦٣م)و درێژییەکەی (٧٣کم)و پانییەکەی (١٣کم)ە، بە بەرزترین چیای هەرێمی نیمچە شاخاوی دەژمێرێت.

چیای حەمرین لەمپەرێکی سروشتیی نێوان هەرێمی نیمچە شاخاویو هەرێمی رەشەخاکەکانی عێراق پێکدەهێنێت. خۆگەر زانیمان کە چیای

حەمرین لە بەشێکی گەورەیدا سنوری کوردستانی باشور لەباشوریەوە تەواو دەکات، ئەوا بۆمان روون دەبێتەوە کەئەم زنجیرە چیایە وەکو دابڕێکی جوگرافیی نێوان هەردوو وڵات خەسڵەتێکی سروشتیی گرنگی هەیە.

لەسێ گەروی سەرەکی ئەم زنجیرانەوە، رووبارو چۆمەکانی ئەم هەرێمە رووەو ناوچەکانی عێراق تێپەڕدەبن.. چۆمی سیروان لەخاکی (منصوریە الجبل)دا چیای حەمرین دەبڕێت، هەروەها چۆمی عوزێم لەخاڵی (دەمیر قەبو)دا چیای ناوبراو دەبڕێتو، سێیەمیشیان رووباری دیجلەیە کەلەخاڵی (فەتحە)دا لەنێوان حەمرینو چیای مەکحولدا تێپەڕدەبێت.

-کۆمەڵەی دووەم: زنجیرەکانی ئەم کۆمەڵەیە دەکەونە ناوەڕاستی هەرێمی نیمچە شاخاوییەوە. لەچەند زنجیرەیەکی جیاجیاو کورت پێکهاتوون، کەبە پێچەوانەی کۆمەڵەی یەکەمەوە هێڵێکی ئاشکرا پێکناهێننو، زۆرینەی چاڵگە نەتەوەکانی کوردستانی باشور دەکەونە ئەم ناوچەیەوە.

پێبەپێی ئاقاری زنجیرەکان، دەکرێت وەکو سێ زنجیرەی جیا دابەش بکرێن، بەم شێوەیە:-

١-بەشی باشوری خۆرهەڵات، کە فراوانترین بەشیانە، لەسنوری ئێستای عێراق- ئێرانەوە دەست پێدەکاتو لەخۆرهەڵاتی شاری کەرکوك کۆتاییان دێت، لەم چیایانە پێکهاتووە: دارەوشکە، جبەداغ، گەلابات، گمار، کۆهیداغ، نەوت داغ، چیای توزخورماتو، شاکەلو عەلی داغ.

٢-بەشی ناوەڕاست، ئەوچیایانە دەگرێتەوە کە دەکەونە نێوان کەرکوكو زێی گەورەوەو بریتین لە: چیای کانی دۆمەلانوچیای ئاوانە (٥٠٠م) کە واپێدەچێت هەریەك زنجیرە بنو لای (پردێ)وە زێی بچوك کەوتبێتە نێوانیانەوە. درێژی زنجیرەکە بەگشتی (١٠٠کم) دەبێت، لەخۆرئاوای ئەم زنجیرەیەوە زنجیرەیەکی درێژتر هەیە، ئەوبەشەی زنجیرەکە کە دەکەوێتە خۆرهەڵاتی زێی بچوکەوە بەچیای باتیوەو، بەشەکەی نێوان هەردوو زێی بەچیا قەرەچوغ (٨٠٠م) ناودەبرێت. لەباکوری زنجیرەی ئاوانەوە زنجیرەیەکی نزمتر بەناوی دەمیرداغ (٥٠٠م)هەیە.

٣-بەشی باکوری خۆرئاوا، بەشێوەیەکی گشتی لەچەند زنجیرەیەکی کورتو نزمو پەرتەوازە پێکدێت کە زۆرتر: لەگردو تەپۆڵکە دەچێت وەك لەوەی لەچیا بچن. چیاکانی ئەم بەشە بریتین لە: چیای مەقلوب (١٠٥م)و چیای

باشیقە (٦٨٥م) کە دەکەونە خۆرهەلاتی شاری موسلەوە، پاشان چیای عێن زالەو تەل موسلو تەلەعەوینات کەدەکەونە باکوری خۆرئاوای شاری ناوبراوەوە.

-کۆمەلەی سێیەم: لەچەند زنجیرە چیایەکی دابڕاو پێکدێت کە دەکەونە نزیك سنوری نێوان هەرێمی نیمچە شاخاوی‌و هەرێمی شاخاوییەوە. گرنگترین چیاکانی ئەم کۆمەلەیە چیای باسکی زەنوێرو عومەر ئاولیاو داوەلان‌و خالخالانە.

بەشێوەیەکی گشتی، هەرێمی نیمچە شاخاوی هەرێمێکە دەکەوێتە نێوان دوو هەرێمی سروشتی جیاواز کە ئەوانیش هەرێمی شاخاوی‌و هەرێمی رەشە خاکەکانە، بۆیە ئەم هەرێمە بەهەرێمێکی گوازراوە دەژمێرێت کە دەشێت مۆرکی هەردوو هەرێمەکە لەخۆبگرێت. گرنگی ئەم هەرێمە لەوەدایە کەیەکێك لەدرێژترین‌و گەورەترین چالگە نەوتەکانی جیهانی تێدەکەوێت کەچالگەی نەوتی کەرکوکە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی کەشارێ گرنگەکانی نێوان بانی ئێران‌و موسل‌و خۆرهەلاتی دەریای ناوەڕاستی پێدا دەڕوات‌و، رەشە خاکەکانی عێراق‌و بەغدای پایتەختی عێراق، بەموسل‌و باقی بەشەکانی تری کوردستانەوە گرێ دەدات.

## دووەم: پێدەشتەکان

سێ دەشتی سەرەکی دەگرێتەوە کەبریتین لە:-

-دەشتی حەمرین

ئەم دەشتە لەپێچێکی رووچالْ پێکهاتووە کە دەکەوێتە نێوان دوو پێچی قۆقزەوەو بەلێواری لاپالەکانی خۆرهەلاتی چیای حەمریندا لەنێوان چیای قەرەچوغ لەباکورو چیای حەمرین لەباشورو بانی کەرکوك‌و توزخورماتودا کشاوە.

جگە لەبەشەکانی باشوری کە بەرزاییەکانی گمارو جبەداغ‌و دارەوشکەو گەلاباتی تێدەکەوێت، ئیتر بەشەکانی باکوری هیچ بەرزاییەکی تێناکەوێت‌و روویەکی تەختی هەیە.

بەرزی ئەم دەشتە لەنێوان (٢٢٥م) لەباکورداو، (١٨٠م) لەباشوردایە، پانایی بەشەکانی ناوەڕاستی دەگاتە (٣٢کم)، لەباشورو باکوردا پانایییەکەی خۆی لە (٦٤-٨٠کم) دەداتو درێژاییەکەی (٣٠٠کم) دەبێت.

٢-دەشتی دیبەگە

دەکەوێتە نێوان چیاکانی ئاوانەو قەرەچوغەوە، لەپێچێکی رووچاڵ پێکهاتووە کە پانایییەکەی بە (١٦کم)و درێژاییەکەی بە (٨٠کم) مەزەنە دەکرێت. تێکڕای بەرزی رووەکەشی دەگاتە (٢٧٥م).

ئاوەڕۆکانی بەشی باکوری خۆرئاوای کە بەدەشتی شەمامك ناودەبرێت دەرژێنەوە زێی گەورەوەو، ئاوەڕۆکانی بەشی باشوری خۆرهەڵاتی کەبە دەشتی کەندێناوە ناسراوە دەرژێنە زێی بچوکەوە.

٣-دەشتی هەولێر

لەشێوەی سێگۆشەیەکدایەو لەبەشەکانی خۆرهەڵاتو خۆرئاواوە بەچەند بانێكو، لەباشورەوە بەچیای ئاوانە دەورەدراوە. کلکەیەکیشی بەئاقاری باشوری خۆرهەڵات دەگاتە چیای کانی دۆڵانو شاری کەرکوك. لەخۆرهەڵاتەوە بەرزییەکەی دەگاتە (٤٨٠-٥٥٠)م لای خۆرئاواوە دەگاتە (٣٠٠م).

دەشتی هەولێر یەکێکە لەدەشتە بەپیتەکانی کوردستانی باشور کە بەپشت بەستن بەباران گەنمو جۆی تێدا دەچێنرێت.

## سێیەم: بانەکان

بانەکان لەدەشتەکان بەرزترو بەگرێو گۆڵ ترن، ئاوەڕۆی رووبارەکان ئەم بانانەی بۆ ناوچەی گەورە گەورە کەرت کردوونو، دۆڵو شیوی قوڵی تێدا هەڵکەندون.

گرنگترین دووبانی هەرێمی نیمچە شاخاوییەکان، هەردوو بانی کەرکوكو موسڵن، کەرکوك کەدەکەوێتە نێوان هەرێمی شاخاوی لەباکوری خۆرهەڵاتەوەو، پێدەشتو زنجیرە چیاکان لەباشوری خۆرئاواوە، لەخاڵی سنوری ئێستای عێراق- ئێران نزیکی چۆمی سیروان تادەشتی هەولێر دەکشێت. تێکڕای بەرزییەکەی لەنێوان (٦٠٠-١٠٠٠م)و، (٥٠٠م) لەزەوییەکانی خۆرئاوایو (٣٠٠م) لەزەوییەکەی خۆرهەڵاتی بەرزترە.

بانی موسـڵیش کـە دەکەوێتـە بەشـی بـاکوری خۆرئـاوای هـەرێمی نیمچـە شـاخاوییەوە لەخۆرهەڵاتیـەوە زێـی گـەورەو لـەخۆرئاواوە زنجـیرە چیاکـانی شنگارو ئیبراهیم دەورەیان داوە. تێکرای بەرزییەکەی لەنێوان (٣٠٠-٤٥٠م)و (٣٠٠م) لەزەوییـەکانی دەوروبـەری بـەرزترە. رووبـاری دیجلـە بەناوەڕاسـتیدا تێپـەڕدەبێتو بانەکە دەکاتە دوو بەش، بەشـی خۆرئـاواو بەشـی خۆرهـەڵات. بەشێوەیەکی گشتی بەشی خۆرهـەڵاتی لـەڕووی جیومۆرفۆلۆجیاوە هەمـەجۆر ترە لەبەشی خۆرئاوای.

| هەرێم | رووبەر/ کچگ | رێژەی سەدی |
| --- | --- | --- |
| شاخاوی | ٢٣,٣٧٠ | ٪٢٧,٤٩ |
| نیمچە شاخاوی | ٦١,٦٣ | ٪٧٢,٥١ |

خشتەی ژمارە (١)

رووبەرو رێژەی سەدی هەرێمە جوگرافییەکانی کوردستانی باشور لەڕووی جیۆمۆرفۆلۆجیاوە




**نەخشەی ژمارە (٣)**
**جیۆمۆرفۆلۆجیای کوردستانی باشور**

## فەسلی چوارەم

# کەشوهەوای کوردستانی باشور

### (٢-٤-١): کارتێکەرە گشتییەکانی کەشوهەوای کوردستانی باشور

بۆ تێگەیشتن لە کەشوهەوای هەر هەرێمێك، واپێویست دەکات کۆڵینکاری لە هۆکارەکانی وەکو بازنەکانی پانیو هەڵکەوتەی هەرێمەکە بەنسبەت رووبەرە ئاوییەکانو جیۆمۆرفۆلۆجیاو خەسڵەتی بارستە هەواکانو کارتێکەرەکانی تری کەشوهەوا بکرێت.

کوردستانی باشور دەکەوێتە نێوان بازنەکانی پانی (٣٣-٣٧) پلەی باکورەوە،ئەم هەڵکەوتەیەی کوردستانی باشور وایکردووە لەهاویناندا بەتایبەتیش لەمانگی حوزەیراندا تێکڕای ماوەی تیشکی خۆری رۆژانە بگاتە زۆرتر لە (١٤,٢٤ سەعات)و، زستانان لەمانگی کانونی یەکەم بەدواوە ئەم بڕە نزیکەی پێنج سەعات کەم بکاتو تێکڕای ئەو بڕە لە کانونی دووەمدا تەنیا (٩,٥ سەعات)بێت.

کوردستانی باشور بەچەند رووبەرێکی ئاویی دەورەدراوە، لەکاتێکدا دەریای ناوەڕست نزیکترین روبەری ئاویی پێکدەهێنێت، رووبەرە ئاوییەکانی تری وەکو کەنداوی عەرەب- فارسو دەریای سورو دەریای قەزوینو دەریای رەش چەند رووبەرێکی ئاویی دوور لەکوردستانی باشور پێکدەهێنێت کە جگە لە کاریگەرییەکی کەمی کەنداوی عەرەب- فارس نەبێت بۆسەر بەشەکانی خواروی کوردستانی باشور، ئیتر باقی ئەو رووبەرە ئاوییانە کاریگەرییەکی ئەوتۆیان لەسەر کەشوهەوای هەرێمەکەی ئێمە نابێت[٥٧]

جیۆمۆرفۆلۆجیای کوردستانی باشور ئەوەمان بۆ دەردەخات کە جیاوازی گەورە لەشێوەو جۆری خاکەکەیدا هەیە. لەکاتێکدا بەرزایی هێندێك ناوچە لەچیا بەرزکان دەگاتە زۆرتر لە (٣٦٠٠م)، کەچی ئەم بەرزاییە لەپێدەشتەکاندا لەچەند مەترێك لەئاستی رووی دەریاوە زۆرتر تێناپەڕێت. جیۆمۆرفۆلۆجیا رۆڵی گەورە لەجیاوازی کەشوهەوادا وازی دەکات، کوردستانی باشور لەڕووی جیۆمۆرفۆلۆجیاوە لەدوو هەرێمی جیاواز پێکدێت (بڕوانە بەشی دووەم- فەسڵی سێیەم) ئەوانیش:-

١-هەرێمی شاخاوی: ئەم هەرێمە هەموو ئەو ناوچانە دەگرێتەوە کە چیاکانی لەباکوری خۆرئاواوە بەرەو باشوری خۆرهەڵات بەپانایی (١٠٠میل)و بەرزایی (١٠٠٠-٣٦٠٠م) لەنێوان بانی ئەنادۆڵ لە باکورو باکوری خۆرئاواوەو، بانی ئێران و چیاکانی زاگرۆس لەخۆرهەڵات درێژبوونەتەوە. ئەم چیایانە رووبەڕووی ئەو تووندەبایانە دەبنەوە کە لەخۆرئاواوە لەمانگی ئەیلول بەدواوە تا مانگی مایس هەڵدەکەن.

بڕی بارانی ساڵانەی ئەم ناوچەیە دەگاتە (٤٠٠ملم)و بەدرێژایی مانگەکانی ساڵ بەفرو بەستەڵەك ئەو چیایانەی گرتۆتەوە.

٢-هەرێمی نیمچە شاخاوی: ئەم هەرێمە بەدرێژایی روباری دیجلە بەئاقاری باکوری خۆرئاواو باشوری خۆرهەڵات دەکشێت. لەخۆرئاواوە بەخۆرهەڵاتی کەنارەکانی دیجلەو، لەخۆرهەڵاتەوە بەگەوەکانی زاگرۆس دەورەدراوە.

بارودۆخی کەشوهەوای ئەم هەرێمە هەمان بارودۆخی کەشوهەوای دەریای ناوەڕاستە[٥٨]

بەرزی‌و نزمی خاك پێوەندی گەورەی بەجۆری کەشوهەواوە هەیە. خاکی کوردستانی باشور وا هەڵکەوتووە تا بەرەو باکورو باکوری خۆرهەڵات هەڵکشێین، زەوییەکەی روو لەبەرزبوونەوەیەو بەوپێیەش بڕی بارانی ساڵانە روو لەزیادبوون دەبێت. بەپێچەوانەشەوە تابەرەو باشورو باشوری خۆرئاوا بچین، خاکی کوردستانی باشور روو لەنزمبوونەوەیەو بڕی بارانی ساڵانەش روو لەکەمبوونەوە دەبێت. بۆیە بارانی باکورو باکوری خۆرهەڵاتی کوردستانی باشور بارانێکی مۆرفۆلۆجی ئۆرۆگرافییە، ئەوەندەی بارانێکی زریاناوی بێت.

پەستانی هەوا کەتوخمێکی گرنگی کەشوهەوایە، دابەشبوونی پێوەندی گەورەی بەخێرایی‌و ئاقاری تووندەباوە هەیە. زستانان بەشێوەیەکی گشتی

پەستانی بەرز لەسەر بانی ئەنادۆڵو بانی ئێرانو بانی عەرەبستان پەیدادەبن. هاوینان بنکەکانی پەستانی بەرز نامێننو بنکەکانی پەستانی نزم جێگەیان دەگرنەوە، ئەمە جگە لەهێندێك ناوچەی بەرزی وەکو چیاکانی زاگرۆسو ئاسیای بچوکە[٥٩]

ئەو بارستە هەواییانەی روو لەکوردستانی باشورن دوو جۆرن:-

یەکەمیان بارستە هەوای خولگەیی وشکانییە، دووەمیشیان بارستە هەوای دەریاییە کە هەردوو بارستە هەوای دەریایی قوتبی mPو دەریایی خولگەیی mT لەخۆدەگرێت. لەهاویندا کوردستانی باشور دەکەوێتە ژێر کاریگەری بارستە هەوای وشکانییەوە، لەم وەرزەدا کەشوهەوا وشكو ئاسمانە بێباران دەبێت. بەڵام زستانان کوردستانی باشور کە لەژێر کاریگەریی هەردوو بارستە هەواییە دەریاییەکەدایە، پلەکانی گەرما روو لەدابەزینو باران دەست بەبارین دەکات[٦٠]

(با)ی عێراق بەشێوەیەکی گشتیو کوردستانی باشور بەشێوەیەکی تایبەتی، (با)ی خۆرئاواو باکوری خۆرئاوایە... ئەمەش راستەوخۆ پێوەندی بەشێوەی درێژبوونەوەی چیاکانی کوردستانەوە هەیە بەئاقاری باکوری خۆرئاوا -باشوری خۆرهەڵات، کەوادەکات توونده با هەڵکردووەکان بەشێوەیەکی تەریب لەگەڵ ئاقاری چیاکاندا بنو، هەروەها تاڕادەیەکیش پێوەندی بەجیاوازی ناوچەکانی پەستانی هەواوە هەیە.

(با)ی خۆرئاواو باکوری خۆرئاوا لەبانەکانی ئەنادۆڵو ئەرمینیاوە هەڵدەکاتو کەشوهەوایەکی ساردو بەدوای خۆیدا دەهێنێت ئەم بایە لەمانگی شوبات بەدواوەو هەتا ئەیلول، کوردستانی باشور دەگرێتەوەو لەحوزەیران بەدواوەو تاکۆتایی ئاب، ناوچەی سلێمانیو دەوروبەرەکەی جیا لەهەرشوێنێکی تر دەخاتە ژێر کاریگەریی خۆیەوە.

جیا لەم (با)یە، سالانە (با)ی خۆرهەڵاتو باکوری خۆرهەڵاتیش کە کەشوهەوایەکی وشكو برنگ بەدوای خۆیدا دەهێنێتو، (با)ی خۆرهەڵاتو باشوری خۆرهەڵات کە (با)یەکی ساردو شێدارەو هەورو باران بەدوای خۆیدا دەهێنێت، روو لەناوچەکەی ئێمە دەبن.

بەشێوەیەکی گشتی دەریای سپی ناوەڕاست نەك بەتەنیا بۆ کوردستانی باشور، بەڵکو بۆ هەموو ناوچەکانی باشوری خۆرئاوای ئاسیا، بەگرنگترین

کارتێکەری گەرمی دادەنرێت. گەرداوەکانی هەوای ئەم دەریایە کە لەبەشی باکوری زەریای ناوەڕاستدا دەکشێن و، هەرپاش داهاتنی وەرزی پاییز بەماوەیەك و تاکۆتایی بەهار، کوردستانی باشور رووبەڕووی گۆڕانکارییەکانی ئەو گەرداوە هەواییانە دەبێتەوە.

ئەم گەردوانە بەرەو خۆرهەلاتی دەریای سپی لەرێی سێ دەروازەوە دەگەنە ناوچەکانی ژێر کاریگەرییان... گەرداوەکانی گروپی یەکەمیان بەرەو باکور بەسەر دەریاچەی ئیجەو دەریای رەشدا تێپەڕ دەبێت. گروپی دووەم بەرەو خۆرهەلات ناوچەکانی سوریاو کوردستانی باشورو بەشێکی عێراق و بەشێکی باشوری بانی ئەنادۆڵ دەخاتە ژێر کاریگەری خۆیەوە. بەلام گروپی سێیەمیان دەکەوێتە باشوری دەریای ناوبراوەو بەرەو خۆرهەلات بە ئاقاری ئیسرائیل و فەلەستین و ئەردەن و بەشێکی عێراقدا رەت دەبێت.

سەرەڕای بوونی چیاکانی لوبنان لەنێوان دەریای سپی ناوەڕاست و کوردستانی باشوردا، لەکاتی هەلکردنی تووندە باو زریاندا گەرووەکانی ئەو چیایانە رێگە بەتێپەڕبوونی بای شێدار دەدەن، گرنگترین دیاردەکانی ئەو باو گەرداوانەش هێنانی هەوای ساردو گەواڵە هەورو بارانی زۆرو هێندێك جاریش زریان و گێژەلوکەیە[٦١]

بەهۆی باران بڕان لەدوای مانگی مایسەوەو هەلکردنی گێژەلوکەی لماوی لەبیابانەکانی خۆرئاوای عێراق و هێندێك ناوچەی سەر بەجزیرە، هاوینان کوردستانی باشور لەژێر کاریگەری ئەو توونده بایانەدا دەبێت. ئەگەرچی بەشی زۆری ناوچەکانی کوردستانی باشور رووبەڕووی ئەو گێژەلوکانە دەبنەوە، بەلام بەهۆی بوونی تارایەکی رووەکی خۆڕسك و پتەویی خاکی کوردستان، هێندێك ناوچە بەتایبەتیش ناوچەکانی سەر بەهەرێمی شاخاوی جیا لەهەر جێگەیەکیتر، بەرگری ئەو جۆرە کەشوهەوایە دەکەن و ناچنە ژێر کاریگەرییەوە[٦٢]

## (٢-٤-٢): مەوداکانی گەرماو بارانی کوردستانی باشور

بۆ ئەوەی پلەکانی گەرماو رادەی شێ و وشکی و تێکڕای بڕی بەفرو بارانی سالانە بزانرێت، دەبێت تۆمار بکرێن، مەبەست لەتۆمارکردنی ئەو زانیارانەش ئەم خالانەی لای خوارەوەن:-

١-پیوانی پلەكانی گەرماو رادەی شێو زانینی ئاقاری هەلكردنی توونده باو خیرایی رادەی وشكیو شیداری توونده باكان، توانای زانینی كاتەكانی شین بوونی دەغلودانو درونەوەیو پاراستنی بەروبومە كشتوكالییەكان لەمەترسی بەستەلەكو بەفرو وشكیو مەترسی لافاومان دەداتیت.

٢-زانینی كاتەكانی باران بارینو جۆرو چری بارانی سالانەو وەرزەكانی كشتوكاڵو ئەو بەروبوومانەی پێ دەستنیشان دەكریت، كەسالانە دەچینرین.

٣-زانیارییە كەشناسییەكان توخمیكی سەرەكی نەخشە كیشان پیكدەهینیت.

٤-لەبواری عەسكەریدا رۆلی گرنگ وازی دەكات[٦٣]

بەشیوەیەكی گشتی كوردستانی باشور دوو ماوەی دیاری گەرمای مامناوەندی هەیە، ئەوانیش دەكەونە وەرزەكانی پایزو بەهارەوە. مانگەكانی نیسانو مایس ئەو دوو مانگەن كەتییاندا وردە وردە پلەكانی گەرما روو لە بەرزبوونەوە دەبیت. لەحوزەیراندا ئیتر خەسلەتەكانی هاوین خۆ دەنوینن. پاشان لەمانگی ئەیلول بەدواوە، پلەكانی گەرما روو لەنزمبوونەوە دەبیت، دەتوانریت مانگی تشرینی یەكەم لەزۆربەی ناوچەكانی سەر بەهەریمەكەدا بەماوەی نیوان هاوینیو زستان دابنریت.

فاكتەرەكانی خاك رۆلیكی بەرچاو لەتیكرای گەرمی ناوچە جیاجیاكاندا وازی دەكەن... جیاوازی لەپلەكانی گەرمای سالدا بەئاقاری باكورو باكوری خۆرهەلات بەئاشكرا خۆ دەنوینن، ئەوەتا لەكاتیكدا تیكرای پلەكانی گەرمای مانگی تەمموز كەدوا مانگی هاوین دەگەیەنیت. لەهەریەكە لەرەواندزو پیرمامو دوكانو هەلەبجەو ئاكریدا (٢٦,٦س)و (٣٠,٤س)و (٣٠,٤س)و (٢٨,٣س)و (٢٩,٤س) دەبیت كەچی تیكرای پلەكانی گەرمای ئەم مانگە لەهەریەكە لەموسڵو شنگارو كەركوكو خانەقیندا لە (٣٤س)و (٣٣.٥س)و (٣٥,٢س)، (٣٤,٨س) دەدات.

گەر عیراق وەكو نمونە وەربگرین، ئەوا دەبینین هاوینان جیاوازییەكی گەورە لەنیوان پلەكانی گەرمای كوردستانی باشورو ناوچەكانی تری عیرقدا نییە. جیاوازی لەناوەندی گەرمای تەمموز لەنیوان بەسرە لەوپەری باشوری عیراقو، زاخۆ لەوپەری باكوری كوردستانی باشور تەنیا (٢,٥ف)ە. بەلام زستانان بەپیچەوانەوە... بەهۆی كزی تیشكی خۆرو رۆژكورتبوونو

بەرزبوونەوەی رادەی بەهەوربوون لەسەرتاسەری هەریمەکەدا، جیاوازی ناوەندی گەرمای مانگی کانوونی دووەم لەنیوان کوردستانی باشوورو ناوچەکانی عیراقدا بە (٥٠ف) دادەنریت. (بروانە خشتەی ژمارە "٢") هەروەها (خشتەی ژمارە "٣").

| ویسگەی کەشناسی | بازنەی پانی باکور | بەرزایی مەتر | بەرزایی پێ | ناوەندی پلەی گەرما تەمموز "ف" | ناوەندی پلەی گەرما کانونی دووەم "ف" |
|---|---|---|---|---|---|
| زاخۆ | ٣٧,٠٨ | ٤٤٢ | ١,٤٥٠ | ٩٠,١ | ٤٠ |
| موسڵ | ٣٦,١٩ | ٢٢٣ | ٧٣٢ | ٩٢,٥ | ٤٣ |
| کەرکوک | ٣٥.٢٨ | ٣٤٠ | ١,١١٥ | ٩٥,٥ | ٤٦,٨ |
| سلێمانی | ٣٥,٣٣ | ٨٥٣ | ٢,٧٩٨ | ٩٢,٥ | ٣٧ |
| خانەقین | ٣٤,١٨ | ٢٠١ | ٦٥٩ | ٩٥,٤ | ٤٩,١ |
| بەغدا | ٣٢,٣٠ | ٤٣ | ١١٢ | ٩٤ | ٤٨,٨ |

خشتەی ژمارە (٢)

تێکرای گەرمای مانگی تەممووزو مانگی کانونی دووەم لەهێندێك ویستگەی کەشناسیی هەڵبژاردەدا[٦٤]

| ویستگەی کەشناسی | مانگەکانی زستان | | | مانگەکانی هاوین | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | کانونی یەکەم | کانونی دووەم | شوبات | حوزەیران | تەمموز | ئاب |
| زاخۆ | ٣٥,٧ | ٤٠ | | ٨٣,٧ | ٩٠,١ | ٨٨,٤ |
| ئامێدی | ٣٧,٧ | ٣٣ | ٤٥ | ٧٥,٧ | ٨٢,١ | ٨٠,٤ |
| موسڵ | ٤٧,٤ | ٤٣ | ٣٧ | ٨٥,٧ | ٩٢,٥ | ٩٠,٤ |
| کەرکوک | ٥١,٥ | ٤٦,٨ | ٤٧ | ٩٠,٥ | ٩٥,٥ | ٩٤,٨ |
| خانەقین | ٥٢,٩ | ٤٩,١ | ٤٨,٦ | ٩١ | ٩٥,٤ | ٩٤,٢ |
| بەغدا | ٥١.٨ | ٤٨,٨ | ٥٢,٧ | ٩٠,٥ | ٩٤ | ٩٣,٩ |

خشتەی ژمارە (٣)

تێکرای گەرمای سێ مانگی زستانو سێ مانگی هاوین لەهێندێك وێستگەی کەشناسیی هەڵبژاردەدا بەپلەکانی (ف[٦٥])

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| بەغدا | ٥١.٨ | ٤٨,٨ | ٥٢,٧ | ٩٠,٥ | ٩٤ | ٩٣,٩ |

**خشتەی ژمارە (٣)**

**تێکڕای گەرمای سێ مانگی زستان‌و سێ مانگی هاوین لەهێندێك وێستگەی کەشناسیی هەڵبژاردەدا بەپلەکانی (ف°)**

هەورەکو پێشان باسکرا فاکتەرەکانی زەوی واتە دیاردە جیۆمۆرفۆلۆجییەکان، پێوەندییەکی راستەوخۆیان بەبڕی باران بارینەوە هەیە. پێ‌بەپێی بەرزبوونەوەی خاك بەرادەیەکی دیاریکراو (٣٠٠٠-٦٠٠٠پێ)، بڕی بارانیش زیاد دەکات. بۆیە هەرێمی شاخاوی بە برشتترین هەرێمی باران بارینی ساڵانە دادەنرێت‌و دوای ئەو هەرێمی نیمچە شاخاوی‌و پاشانیش هەرێمی رەشەخاك دێت.

لەمانگی تشرینی یەکەم بەدواوە، گەرداوەکانی هەوای دەریای ناوەڕست چالاك دەبن. بەشێوەیەکی گشتی لەنیوەی دووەمی ئەو مانگەوە وردە وردە کاریگەرییەکانی ئەو گەرداوانە دەگەنە هەرێمەکەی ئێمەو باران بەدوای خۆیاندا دەهێنن.

ئەو هەرێمەی ساڵانە بەفر دەیگرێتەوە بەپلەی یەکەم هەرێمی چیا بەرزەکانە پاشان هەرێمی شاخاوی‌و ناوچە نزمەکان‌و هێندێك ساڵیش چەند ناوچەیەکی هەرێمی شاخاویش دەگرێتەوە.

بەداهاتنی بەهارو تامانگی مایس، کوردستانی باشور لەژێر کاریگەریی هەمان گەرداوەکانی دەریای سپیدا دەبێت.. مانگەکانی مارت‌و نیسان‌و مایس وەرزی بارانی بەخوڕی بەهارەیە. تا لەباکورو باکوری خۆرئاواشەوە بەرەو باشورو باشوری خۆرهەڵات بچین بڕی بارانی بەهارەش کەم دەبێتەوە. مانگی حوزیران مانگی سنورکردی نێوان وەرزی باران‌و وەرزی باران برانی کوردستانی باشورە. هاوینان لەچەند بارودۆخێکی ناوازەدا نەبێت ئیتر تا پایز باران داناکات.

جیاوازی لەنێوان بڕی بارانی ساڵانە لەنێوان کوردستانی باشورو عێراقدا، جیاوازییەکی ئێجگار گەورەیەو بیست ئەوەندە دەبێت. لەکاتێکدا بڕی بارانی ساڵانە لەوپەڕی باشوری عێراقدا تەنیا (٥سم) دەبێت، کەچی ئەوبڕە لەهەرێمی شاخاوی کوردستانی باشوردا دەگاتە (١٠٠سم).

زستانان کەوەرزی باران بارینە بەنسبەت هەر دوو وڵاتەوە، تێکڕای بڕی ئەو بارانە لەبیابانەکانی خۆرئاوای عێراقدا دەوروبەری (٦٤ ملم"٢,٥ئینج")و، لەرەشەخاکاندا (٨٩ملم "٣,٥ئینج)و، لەهەرێمی جزیرەی سەر بەعێراقدا

(١٥٥ملم "٦,١ئینچ") دەبێت، بەڵام لەکوردستانی باشوردا تێکڕای ئەو بڕە لەهەرێمی نیمچە شاخاویدا (٢٠٨ملم "٨,٢ئینچ")و، لەهەرێمی شاخاویدا (٥٠٤ملم "١٩,٨ئینچ") دەبێت[٦٦]

وەنەبێت لەکوردستانیشدا بەیەك ڕێژە باران ببارێت.. لەکاتێکدا هەرێمی شاخاوی بەناوچەی بارانی زۆر ناسراوەو تێکڕای ساڵانەی بەزۆرتر لە (٧٥٠ملم "٢٩,٥ئینچ") دادەنرێت، هەرێمی نیمچە شاخاوی نیوەی ئەوبڕەی بەردەکەوێت‌و، هەرێمی ڕەشە خاك نیوەی هەرێمەکەی پێش خۆی. بڕوانە خشتەی ژمارە (٤)ی.

بەشێوەیەکی گشتی ڕادەی بەرزی باران بارینە وایکردووە بەشی زۆری کشتوکاڵی کوردستانی باشور کشتوکاڵێکی دێمی بێت‌و، ئەو ناوچانەی هەرێمەکە کەتێیاندا بڕی باران لەنێوان (٣٠-٤٠سم)دایە، سنوری سروشتیی کشتوکاڵی ناوبراو پێکدەهێنن.

| ویستگەی کەشناسی | کانون ٢ | شوبات | مارت | نیسان | مایس | تشرینی ١ | تشرینی ٢ | کانونی ١ | سەرجەم |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| زاخۆ | ١٤٦,٥ | ١٨,٨ | ١٢٢,٦ | ٩٦,٩ | ٣٥,٥ | ٢٠,٣ | ٧١,٢ | ١١٩ | ٧٢٠,٨ |
| ئاکرێ | ١٨٥,٥ | ١٩٠,٢ | ١٧١,٦ | ١٢٨,٢ | ٤٤ | ٢٤,٤ | ٩٨,٢ | ١٤٣,٣ | ٩٨٥,٤ |
| ڕواندوز | ١٣٩,٩ | ٢٦٢,٥ | ١٦٣,٤ | ١٣٦,٦ | ٥٢,٣ | ٣٥,٧ | ٩١,٢ | ١٢٦,١ | ١٠٠٧,٧ |
| پیرمام | ١١٥,٧ | ١٠٦,٥ | ١٠١,٤ | ٩٢,٧ | ٤٠,٤ | ١٤,٨ | ٨١,٤ | ١١١,٩ | ٦٦٤,٨ |
| شنگار | ٧١,١ | ٦٥,٢ | ٦١,٩ | ٥٣,٩ | ٢٨,٦ | ٧,٩ | ٣٠,١ | ٧١,٩ | ٣٩٠,٦ |
| موسڵ | ٦٥,٢ | ٦٦,٨ | ٦٨,٤ | ٥٢,٨ | ٢١,٨ | ٨,٨ | ٣٥,٥ | ٦٤,٧ | ٣٨٤ |
| هەولێر | ٨٥,٧ | ٨٧,٧ | ٨٢,٤ | ٥٨,٥ | ٢٨ | ٩,٢ | ٣٤,٧ | ٧٤,٦ | ٤٥١,٨ |
| دوکان | ١٤٤,٢ | ١٤٧,١ | ١٣٢ | ١١٩ | ٤٨,٤ | ١٠,٦ | ٨٤,٧ | ١١٩,٧ | ٨٠٥,٧ |
| سلێمانی | ١١٣,٧ | ١٠٩ | ١٢٧,٧ | ١٠٥,٩ | ٤٧,٩ | ١٣,٧ | ٦٨,٨ | ١٠٨,١ | ٦٩٣,٩ |
| کەرکوك | ٦١,٢ | ٦٤,٣ | ٧٦ | ٥٠,٩ | ٢٠ | ٥,٥ | ٣٦,٢ | ٦٠,٢ | ٣٧٤,٢ |
| هەڵەبجە | ١١٨,٣ | ٩٩,٧ | ١٢٥,٧ | ٨٥,١ | ٢٩,٤ | ١٤,٦ | ٦٤,٢ | ١٠١ | ٦٣٦,٨ |
| خانەقین | ٦١,٨ | ٤٧,٦ | ٦٤,٣ | ٣٦,٧ | ١٦ | ٦,٢ | ٢٩.٤ | ٥١,٨ | ٣١٤,٢ |

خشتەی ژمارە (٤) تێکڕای بڕی مانگانە لەچەند وێستگەیەکی کەشناسی کوردستانی باشور (ملم)لەنێوان ساڵەکانی (١٩٤٠-١٩٨٠[٦٧])

ناکرێت کەشوهەوای کوردستانی باشور بۆیەك جۆر کەشوهەوا بگێڕینەوە. چونکە لەسەرێکەوە جیۆمۆرفۆلۆجیای کوردستانی باشور جیۆمۆرفۆلۆجیایەکی ناجۆرە، هەر بەو پێیەو لەو سەرەکەی ترەوە جیاوازی لەنێوان ناوچە جیاجیاکانی هەرێمەکەدا لەڕووی پلەکانی گەرماو رادەی باران بارینی ساڵانەو بارودۆخەکانی تری کەشوهەوادا بەئاشکرا دەبینرێن.

کەشوهەوای کوردستانی باشور سیفەتەکانی هەرسێ جۆری کەشوهەوای خولگەییو وشکانیو سیفەتی نیمچە دەریای ناوەڕاستی بەپلەی جیاجیا لەخۆدا کۆکردۆتەوە.. ئەگەرچی لەڕووی بڕی بارانی ساڵانەو وەرزەکانی باران بارینەوە ناچێتەوە سەر جۆری خولگەیی، بەڵام لەڕووی گەرماوە لەو دەچێت. بەهۆی ماوەی کورتی وەرزەکانی پایزو زستانو درێژی مەودای رۆژانەو ساڵانەی گەرماشەوە، کەشوهەوای کوردستانی باشور بە کەشوهەوای وشکانی دەچێت. خۆ وەرزەکانی باران بارینو جۆری باران لەکوردستانی باشوردا رێك دەچێتەوە سەر جۆی کەشوهەوای دەریای ناوەڕاست.

بەم پێیە دەکرێت کەشوهەوای کوردستانی باشور بۆ دووجۆری سەرەکی پۆلێن بکرێت[٦٨]، ئەوانیش:-

١-کەشوهەوای دەریای سپی ناوەڕاست (Csb- Csb)

ئەم کەشوهەوایە بەشەکانی باکورو باکوری خۆرهەڵاتی کوردستانی باشور واتە ناوچە شاخاوییەکان دەگرێتەوە، ئەمیش بۆ دوو جۆر دابەش دەکرێت؛ یەکەمیان ئەو کەشوهەوایەیە کە بەهاوینی وشكو گەرم ناسراوە (Csa)و ناوچەکانی ناوەڕاستو خوارووی نزیکی هەرێمی شاخاوی دەگرێتەوە. دووەمیشیان ئەو کەشوهەوایەیە کە بەهاوینی وشکی مامناوەندی ناسراوە (Csb)و ناوچەکانی ئەوپەڕی باکوری خۆرهەڵاتی کوردستانی باشور واتە هەرێمی چیا بەرزەکان دەگرێتەوە.

جیاوازی ئەم دوو جۆرەی کەشوهەوا، جیاوازییە لەپلەکانی گەرمای هاوینو بڕی بارانی ساڵانەی زستان. لەکاتێکدا پلەکانی گەرمای گەرمترین مانگەکانی

ساڵ لەجۆری (Csa) لە (١٢س) زۆرترە، کەچی لە جۆری دووەمدا لەوپلەیە زۆرتر تێناپەڕێت. هەروەکو بڕی باران بارین لە (Csb)دا لە (٨٠سم) تێدەپەڕێتو ساڵانە ڕێژەیەکی زۆر بەفر دەبارێت، بەڵام ئەم بڕە لەناوچەکانی (Csa)دا لەنێوان (٦٠-٨٠سم)دا دەبێت.

٢-کەشوهەوای ئستێپس

ئەم کەشوهەوایە هەرێمی نیمچە شاخاویو دەشتە گردۆڵکەییەکانی باشورو خۆرئاوای هەرێمی یەکەم دەگرێتەوە لەشێوەی پشتێنەیەکدا لە باکوری خۆرئاواوە بەرەو باشوری خۆرهەڵات درێژدەبێتەوە.

ئەم کەشوهەوایە کەشوهەوایەکی گواستراوەی نێوان کەشوهەوای دەریای سپیو بیابانە گەرمەکانە. هەرێمەکە بەبەرزی پلەکانی گەرما ناسراوەو تێکڕای ساڵانەی لە (٤-١٤ف) نایەتە خوار. ئەگەرچی ئەم هەرێمە لەژێر کاریگەریی هەمان کەشوهەوای هەرێمی پێشوودایە، بەڵام بەهۆی نزمی خاکەکەیەوە بڕێکی کەمتر باران وەردەگرێتو ساڵانە لە (٤٠-٦٠سم) تێناپەڕێتو هەمان سیفەتەکانی کەشوهەوای جۆری (Csa)ی هەیە[٦٩]

دواجار وەکو بەرئەنجامی فەسڵەکە، دەتوانین سیفەتەکانی کەشوهەوای کوردستانی باشور لەم چوار خاڵەدا کۆبەند بکەین:-

١-کوردستانی باشور هاوینی گەرمو زستانی ساردە، هەردوو وەرزی پایزو بەهار دوو وەرزی فێنکو بە بەراورد لەگەڵ دوو وەرزەکەی تردا، کورت ماوەن.

٢-مەوداکانی گەرمای کوردستانی باشور، ساڵانەو وەرزانەو ڕۆژانە، مەودای گەورەن.

٣-سەرەڕای وەرزەبا، (با)ی باکوری خۆرئاوا، (با)ی باوی کوردستانی باشورە.

٤-بارانی کوردستانی باشور بارانێکی وەرزییە، زستانان زۆرترین بڕی باران دەبارێتو هاوینان لەسەرتاسەری هەرێمەکەدا وەرزی باران بڕانە.




**نەخشەی ژمارە (٤)**
**هەرێمەکانی کەش و هەوا لەکوردستانی باشوردا**




**نەخشەی ژمارە (٥)**

**خێرایی توونده با لەکوردستانی باشوردا**




**نەخشەی ژمارە (٦)**

**ژمارەی سالآنەی گەردەلولە خۆڵ بارانەکان لەکوردستانی باشوردا**




**نەخشەی ژمارە (٧)**
**تێکڕای گەرمای ساڵانە لەکوردستانی باشوردا**




نەخشەی ژمارە (٨)
رەهاترین پلەی بەرزی گەرما لەکوردستانی باشوردا




**نەخشەی ژمارە (٩)**
**ڕەهاترین پلەکانی سەرما لەکوردستانی باشووردا**




**نەخشەی ژمارە (١٠)**
**تیشکی خۆر لەکوردستانی باشوردا**




**نەخشەی ژمارە (١١)**

**تیکرای تیشکاویژی خۆر لەکوردستانی باشوردا / بۆ هەر سعاتیک**




**نەخشەی ژمارە (١٢)**
**تیکرای سالانەی باران لەکوردستانی باشوردا**




**نەخشەی ژمارە (١٣)**
**تیکرای ساڵانەی رۆژە بارانەکان لەکوردستانی باشوردا**




نەخشەی ژمارە (١٤)
ناوەندی سالانەی شێی ڕیژەیی لەکوردستانی باشوردا




نەخشەی ژمارە (١٥)
تیکرای ساڵانەی رۆژە هەورەکان لەکوردستانی باشوردا

## فەسلی پێنجەم

# ڕووەکی خۆڕسك

## پێشەکی:

ڕووەکی خۆرسك یان سروشتی ڕەنگدانەوەی کارتێکەرەکانی کەشوهەواو جیۆمۆرلۆجیایە. کەشوهەوا فاکتەری گرنگ و بڕیاردەری جۆرەکانی ڕووەکی خۆرسکە.

جابەهۆی ناجۆری کە شوهەوای کوردستانی باشور لە سەرێکەوەو، ناجۆری شێوەکانی خاکی کوردستان، ڕووەکی خۆرسکیش لەناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر دەگۆڕێت.

دەستنیشانکردن و پۆلێنکردنی هەرێمەکانی ڕووەکی خۆرسك پێوەندییان بەدەستنیشانکردنی هەرێمەکانی کە شوهەواوە هەیە. ئەگەرچی سنورێکی ئاشکرا لە نێوان ناوچەی ڕووەکییە جیاجیاکاندا نییەوسالانە پێ بەپێی بڕی باران بارین سنورەکانی ئەو ناوچانەش لەگەورەبوون و چوونەوە یەکدان، بەلام لەبەرئەوەی ئاو فاکتەری بنچینەیی گەشەی ڕووەکی خۆڕسکە، بۆیە بەشێوەیەکی گشتی تا لەباشورەوە بەرەو باکورو، لەخۆرئاواوە بەرەو خۆرهەلاتی کوردستانی باشور بچین، چڕی ڕووەکی خۆرسکیش ڕوو لەزۆر بوون و، جۆری ڕووەکەکانیش ڕوو لە گۆڕانن. بۆنموونە لەکاتێکدا گژوگیا ڕووەکی باوی ناوچەی ئستێبسی کوردستانی باشور پێکدەهێنێت، کەچی داری بەڕوو زۆرینەی درەختی ئەو دارستانانە پێکدەهێنێت کەبەدرێژایی چیاکان کشاون. پشتێنەی داری بەڕوو هەموو ناوچەکانی نزیك دەریای ناوەڕاست لەو بەرزاییانەی کەلە (١٠٠٠م) تێناپەڕێت و زستانەکەی مامناوەندییە دەگرێتەوە. شان بەشانی داری بەڕوو، درەختەکانی سنەوبەرو عەرعەریش لەشوێنە بەرزەکانی ئەو دارستانانەدا دەبینرێن. ئەو درەختانەش

کە لەبەرزایی(٢٠٠٠م)دا دەڕوێن، هەمووقەدباڵی زنجیرە چیاکانی کەوانەی تۆرۆس- زاگرۆس، هەرلەدەریای ناوەڕاستەوە تا ئەوپەڕی زنجیرەکەی لەکوردستان گرتۆتەوە. لەسەروو ئەم پێشینەیەشەوەو لەناوچە زۆر بەرزەکاندا، گژوگیاو درەختە کورتەباڵاکان بەچڕی دەبینرێن.

کەشوهەوای کوردستانی باشور یارمەتی گەشەی درەختە باڵا بەرزو گەورەکان نادات، ئەویش بەهۆی ئەوجیاوازی گەورەیەی کەلە ناوەندی ئاستی گەرمای هاوین‌و زستاندا هەیە، ئەمە جگە لەهێندێك ناوچەی چیا بەرزەکان‌و، هەروەها بەهۆی چڕبوونەوەی باران بارین هەر بەتەنیا لەدوو وەرزی ساڵدا زستان‌و بەهار، بۆیە تەنانەت هەرێمە شاخاوییەکانیش کەبڕێکی زۆر بارانیان لێدەبارێت، درەختەکانی لەجۆری گەورەکان نین‌و، دارستانەکانیشی چڕوپڕنین.

بەشێوەیەکی گشتی، دەکرێت رووەکی خۆڕسکی کوردستانی باشور بۆ سێ هەرێمی جیاجیا پۆلێن بکرێن، کەهەر یەکێکیان خەسڵەتی تایبەتی خۆی هەیە، هەرێمەکانیش، یەکەمیان هەرێمی دارستانە شاخاوییەکان‌و، دووەمیان هەرێمی ئستێپس‌و، سێیەمیشیان هەرێمی گوێ چۆم‌و رووبارەکانە[٧٠]

## (٢-٥-١): رووەکی هەرێمی دارستانە شاخاوییەکان

رووەکی ئەم هەرێمە لەناوچە شاخاوییەکانی باکورو باکوری خۆرهەڵات، لەنێوان سنورەکانی ئێستای عێراق- ئێران- تورکیاو، بەهێڵێك کە لە زنجیرەی چیای بێخێرەوە دەست پێدەکات‌و بەچیای ئاکرێ‌و پیرمام‌و کۆیەدا رەت دەبێت‌و، تائەوپەڕی سنوری ئێستای عێراق- ئێران دەکشێت، بڵاوبۆتەوە.

دارستانە سروشتییەکانی ئەم هەرێمە (٦٠٪)ی تێکڕای روپێوی هەرێمی شاخاوی گرتۆتەوەو دەکەوێتە سنوری هەرێمی کەشوهەوای دەریاری سپی ناوەڕاستەوە.

قەوارەی دارستان‌و چڕییەکەی، پێوەندییان بەچەند فاکتەرێکەوە هەیە، لەوانە هەڵکەوتی ئەو دارستانانە بەنسبەت ئەو توندە بایانەی بارانیان پێوەیە، هەربۆ نمونە لاپاڵەکانی خۆرئاواو باشوری خۆرئاوای ئەم هەرێمە چڕترو، لاپاڵەکانی باکوری خۆرهەڵات کەڕاستەوخۆ لەژێر باراندان، چڕییان کەمترە، هەرچەندە خاکی ئەم هەرێمە بەهۆی لێژییەوە ئاوو ئاوەڕۆی زۆر لەبارە بەڵام دیسانەوە ئاوو ئاوەڕۆی جۆگەلەو کانیاوەکانیش کاریگەرییان لەسەر چڕی‌و

چۆنێتی دابەشبونی درەختی ئەو دارستانانە، بۆیە بەهۆی ئاوەڕۆی لافاوو بەفراوەوە کەخاکەکەی ژێری توشی راماڵین دەکات، لە لاپاڵە زۆر لێژەکاندا چڕی درەختەکانیش کەم دەبنەوە.
ئەم هەرێمەش- هەرێمی دارستانە شاخاوییەکان _ بەپێی بەرزیو نزمی خاك. دەکرێت بۆسێ ناوچەی تر دابەش بکرێت، کەبریتیین لە:-
١-ناوچەی چیا بەرزەکان، کە بەشێکە لەهەرێمی نیمچە ئەلپی، ئەو چیایانە دەگرێتەوە کەلە (٦٠٠٠پێ) نزیك دەبێتەوە. رووەکە باوەکانی ئەم ناوچەیە دەوەنە کورتە بالاّکانن. ئەم ناوچەیە لەوەڕگایەکی سروشتی لەبارە بۆ هاوین.
٢-ناوچەی دارستانەکان، ئەو چیایانە دەگرێتەوە کە بەرزاییەکانیان لەنێوان (٢٠٠٠-٦٠٠٠پێ)دایە، بەدارستانی بەڕوو داپۆشراون. ئەگەرچی هێندێك درەختی ئەم دارستانانە لەنمونەی درەختی چیاکانی حەوزی خۆرهەلاّتی دەریای ناوەڕاستە، بەلاّم لەڕووی ئاکیۆلۆجییەوە ئەم دراستانانە زیاتر بەدارستانە ئۆرۆپی- سیبریاییەکان دەچن وەك لەوەی لەدارستانەکانی دەریای ناوەڕاست بچن، چونکە ئەم دارستانانە درەختی هەمیشە سەوزیان نییە.
_دەتوانرێت ناوچەی دارستانەکان بۆ دوو ناوچەی تر پۆلێن بکرێن ئەوانیش:-
أ-دارستانی وشكو نزمە بەرزایی، کەزۆرتر درەختی فستەقو درەختی بەڕووی وشکی ئاسایی تێدایە.
ب-دارستانی شێدار، کەزۆرتر درەختی بەرزی تێدایە، ئەگەرچی بەڕووی وشکی ئاساییشی زۆرە).
٣-ناوچەی درەختە چیاییو درەختە زۆنگاوییەکان، ئەمیش کەناری ئەو رووبارو چۆمانە دەگرێتەوە کە بەدرێژایی ئاوەڕۆکانیان دارستانەکانی گژوگیا، بەتایبەتیش لەناوچەی ئستێبسدا دەکشێن. هێندێك لەو رووەکانە دەچنەوە سەر گروپە قامیشییەکانو، بەشێکیشیان درەختەکانی چنارو سورە چنارو مێون.
بەشێوەیەکی گشتی، زۆرترینی دارستانەکانی کوردستانی باشور، درەختی بەڕوونو (٨٥٪)ی ئەو درەختانە لەجۆری گەلاّرێزن. بەلاّم لەناو ئەو دارستانانەدا درەختەکانی قەزوانو گوێژو ترشو هەرمێ کێویلەو فستەقو

عەرعەریش بڵاوبوونەتەوە. هەروەها سنەوبەر بەشێکی تری درەختی دارستانەکانی کوردستانی باشور پێکدەهێنێت. ئەمە سەرەڕای درەختە دەستچێنەکانی وەکو زەیتون و ترێو هەنجیرو... هتد. کەلێرەو لەوێ لەهەرێمی ناوبراودا دەبینرێن.

| جۆر | دیالە | تەئمیم | سلێمانی | ئەربیل | نەینەوا | سەرجەم |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ڕوپێوی زەوییە بەرزە ڕووتەنەکان | – | – | ٣٧٦ | ١٨٤٤ | ٣٥٤ | ٢٥٧٤ |
| ڕوپێوی دارستانە چڕەکانی بەڕوو (ڕەنیونەهێنراو) | | | ٩٩٩ | ٢٣١٣ | ٣١٤٠ | ٦٤٥٢ |
| ڕوپێوی دارستانە چڕەکانی بەڕوو (ڕەنیوهێنراو) | | ١٨ | ٦٣٠ | ٩٧٦ | ١٢٥٨ | ٢٨٨٢ |
| ڕوپێوی دارستانە چڕی تەنکەکانی بەڕوو | ٤٩ | ١١٥ | ٢٢١٠ | ١٨١٦ | ١٦٧٨ | ٥٨٦٨ |
| کۆی ڕوپێوی دارستانە شاخاوییەکان | ٤٩ | ١١٣ | ٤٢١٥ | ٦٩٤٩ | ٦٤٣٠ | ١٧٧٧٦ |

**خشتەی ژمارە (٥)**

**ڕوپێوی دارستانە شاخاوییەکان (بەکیلۆمەتری چوارگۆشە- کچگ[٧١])**

## (٢-٥-٢): ڕووەکی هەرێمی ئستێبس

ئەم هەرێمە سنوری ئەو ناوچەیە دەگرێتەوە کە بەنیمچە شاخاوی ناسراوەو، کەشوهەوای ئستێبسی بەسەردا زاڵە.

گژوگیا زۆرینەی ڕووەکە خۆڕسکەکانی ئەم هەرێمە پێکدەهێنێت، ئەوەی کەدەمێنێتەوە ڕووەکە دڕکاوییەکانە.

ڕاستیەکەی هیچ سنورێکی ئاشکرا لەنێوان ئەم هەرێمەو هەرێمی بیابانە وشکەکاندا نییە، هەروەکو پێکداچوون و تێکەڵبوونێکی روو لەگۆڕان لەنێوان ئەم هەرێمەو هەرێمە شاخاوییەکاندا هەیە ئەمەش لەبەشێکی زۆریدا

دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازی بارانی ساڵانە، هەرئەمەش وایکردووە کەڕووەکەکانی هەرێمەکە ناجۆرو جیاوازبن.

بەشێوەیەکی گشتی، دەتوانرێت دوو جۆر رووەکی سەرەکی لەم هەرێمەدا دەستنیشان بکرێت، ئەوانیش بریتین لە:-

١-رووەکە شێدارەکانی ئستێبس، کە لەهی ناوچەی دووەم چڕترن‌و دەکەونە سنوری هێڵی بارانی (٣٠-٥٠سم).

٢-رووەکە وشکەکانی ئستێبس، کەلەهەمان رووەکەکانی ناوچە بیاباناوییەکان دەچن لەڕووی خۆگونجاندنیان لەوەرزەکانی وشکی‌و بێبارانیدا. ئەم رووەکانە دەکەونە سنوری هێڵی بارانی (٢٠-٣٠سم) لەخواروی ناوچەی رووەکە شێدارەکانی هەمان هەرێمەوە.

سەرەڕای ئەم دوو جۆرە سەرەکییەی رووەکی خۆڕسك، هێندێك جۆری درەخت دەکەونە سنوری هەرێمەکەوە کە لەبنەڕەتدا سەربە ناوچەی دارستانەکانەو بەشوێنە بەرزەکانی هەرێمەکەوە، بەچیا گردۆڵکەکانەوە دەبینرێن.

## (٢-٥-٣): رووەکی هەرێمی گوێ چۆم‌و رووبارەکان

ئەم هەرێمە سنورێکی دیاریکراوی نییەو هەموو ئەو رووەکانە دەگرێتەوە کەلە کەناری ئاوی گۆل‌و چۆم‌و رووبارەکاندا دەڕوێن. چنارو سورە چنارو قۆخ‌و گوێزو ژاڵەو توو، بەشی زۆری ئەو درەختانە پێکدەهێنن کە بەشێوەیەی خۆڕسك‌و، دەستنێژ، رووان‌و دەڕوێنرێن.




**نەخشەی ژمارە (١٦)**

**رووەکی خۆڕسك لەکوردستانی باشوردا**

فەسلی شەشەم

# سەرچاوەکانی ئاوی کوردستانی باشور

## پێشەکی:

سەرچاوەکانی ئاو جیاوازو هەمەجۆرن... سەرچاوەکانی ئاوی کوردستانی باشور لەناوچە جیاجیاکانی سەرزەمینی کوردستان خۆیەوە هەڵدەقوڵێن. سەرچاوەی هەموو جۆرەکانی ئاوی کوردستانیش ئەو بەفرو بارانەیە کە ساڵانە لەناوچە جیاجیاکاندا دادەکەن.

بەهۆی هەڵکەوتەو کەشوهەواو شێوەی خاکی کوردستانەوە، ساڵانە بڕێکی گەورە باران و بەفر دەبارێن و شێوەو جۆری خاکی کوردستان یارمەتی ئەوەی داوە جۆگەو ئاوەڕۆی بەفرو باران، ژمارەیەك چۆم و رووبار پێك بهێنن و بڕێکی زۆریش ئاو لەژێر زەوییەکەیدا کۆببێتەوەو لەشێوەی کانیاوو کارێزدا بتەقنەوە.

کوردستانی باشور کەساڵانە بڕی (٢٥-١٠٠سم) بارانی لێ دەبارێت، لەسەرێکەوە ئاودێری بەشی گەورەی کشتوکاڵ دابین دەکات و لەوسەرەکەی تریشەوە چۆم و رووبارو کانیاوەکان دەژێنێتەوەو، بەڕادەیەکی بەرچاو ئاوڕۆکانیان زیاد دەکات.

بەفری هەرێمی چیا بەرزەکانیش کەلە هێندێکیاندا مانەوەی دوانزە مانگی ساڵ درێژەی دەبێت، سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندی تری ئاوی کوردستانی باشورە بەتایبەتیش لەهاویناندا کەسەرتاسەری کوردستانی باشور وەرزی باران بڕانە.

بەشێوەیەکی گشتیش ئاوی کوردستانی باشور کەم خوێ و سازگارە، بۆ خواردنەوەو کشتوکاڵ بەکاردێت و ساڵانە زیاد لەپێویستی دانیشتوانە.

ئاوی کوردستانی باشور لەچوار سەرچاوەی سەرەکییەوە، ئەوانیش:-

١-بەفروباران.

٢-ئاوی ژێر زەوی.
٣-روبارو چۆمەکان.
٤-عەماراوو بەنداوەکان.

لەبەرئەوەی لەفەسڵی پێنجەمی ئەم بەشەدا بەدوورو درێژی دەربارەی بارانی کوردستانی باشور، بڕی ساڵانەی بەپێی هەرێمە جیاجیاکان، هۆکارەکانی کەمیو زۆری باران.. هتد. دواوین، بۆیە راستەوخۆ دەچینە سەر باسکردنی سەرچاوەی دووەمی ئاوی کوردستان کەئەویش ئاوی ژێرزەوییە.

## (٢-٦-١): ئاوی ژێر زەوی

بڕی بەفرو بارانی زۆری ساڵانەو جۆری پێکهاتەی بەردەکانی خاکی کوردستانی باشور کە بە بەردە کونیلە دارەکان ناسراوەو، هەروەها لێژایی گەوە شاخەکانو پاشانیش لەئەنجامی هۆکارەکانی روتانەوە کەچینەکانی سەرەوەی رووی خاك رادەماڵێت، بەشێکی زۆری ئاوی بارانو ئاوەڕۆی جۆگەو چۆمەکان بەناخی زەویداو جارێکیتر لەشێوەی کانیدا دەڕژێنەوە سەر زەویو، لەهێندێك شوێنی نیشتەنیشدا کارێزو بیری جیاجیا بەمەستی سوودوەرگرتن لێ دەدرێن.

هەروەکو چۆن ئاوەڕۆی چۆمو رووبارەکان پێوەندییان بەبڕی بەفرو بارانەوە هەیە، ئاوەهاش بڕی ئاوی ژێر زەوی پێوەندی راستەوخۆی بەبڕی بارانی ساڵانەوە هەیە. زۆربەی هەرەزۆری کانیاوەکانی کوردستانی باشور بەشێوەیەکی چڕو بەربڵاو دەکەونە هەرێمی شاخاوییەوە، لەم هەرێمەشدا تا بەرەو ناوچەی چیا بەرزەکان بڕۆین، بڕی کانیاوەکان لەزیادبووونداو بڕی ئاوی ئەو کانیاوانە زۆرترو سازگارتر دەبن. هەر بۆ نمونە ئاوی ناوچەکانی سەر بەپارێزگای سلێمانی لەئاوی ناوچەکانی سەر بەهەولێر سازگارترو، هی ئەمیشیان لەهی کەرکوك باشترە (لە سلێمانی، لەبیرەکانی دەشتی قەڵادزێ بڕی کانزای تواوە ٣٤٥ بەشە بۆ هەر ملیۆنێكو لەرانیە لەنێوان ٢٤٥-٣٠٥ بەشە بۆ هەر ملیۆنێكو ئەم بڕە لەهەولێر دەگاتە ٣٧٥ بەش بۆ هەر ملیۆنێك[٧٢]). (ژمارەی کانیاوەکانی بەتەنیا ناوچەی زێی بچوك خۆیان لە ٤٠٠ دانە دەدەن[٧٣]) بەپێچەوانەوەشەوە، تابەرەو باشورو باشوری خۆرئاوا بچین، کانیاوەکان کەم

دەبنەوەو بۆ سوود وەرگرتن لەئاوی کۆبۆوەی ژێر زەوی بەقوڵایی جیاجیا بیر لێدەدرێت.

| شوێن | ئاوەڕۆ گالۆن/ خولەك |
| --- | --- |
| بنگرد | ٢٠٠ |
| چوارتا | ٢٠ |
| کانی شابان | ٤٠ |
| ماماندوا | ٤٠ |
| میرگە | ٥٠ |
| قەڵادزێ | ٥٠ |
| قەرەچەتان | ١٠ |
| قزلجە | ٥ |
| سەروچاوە | ٤٠ |
| سەروچاوە (ئەستێل) | ٧٨٠ |
| زۆیفا | ١ |
| زۆنگ | ٤ |

خشتەی ژمارە (٦)

بری ئاوی هیندیك کانیو سەرچاوەی چەند ناوچەیەکی جیاجیای سەر بەپارێزگای سلیمانی کەدەکەونە ناوچەی زێی بچوکەوە[٧٤]

## (٢-٦-٢): روبارو چۆمەکان

لانی کەم شەش دانە رووبارو چۆمی جیاجیا دەکەونە کوردستانی باشورەوە، دیجلە درێژترینو گەورەترین رووباری کوردستانی باشورە. درێژی دیجلە لەسەرچاوەکەیەوە تا بەرێزگەکەی دەگات (١٧١٨کم)ە. جگە لەو بەشەی کە دەکەوێتە نیوان گوندی خاپورو شاری موسلەوەو درێژییەکەی (١٧٣کم)ەو راستەوخۆ بەکوردستانی باشوردا تیپەر دەبێت، ئیتر باقی بەشەکەی تری لەخواروی موسلەوە تا شارۆچکەی فەتحە (٣١٥کم) سنوری سروشتی نیوان کوردستانی باشورو عیراق پیکدەهێنیت.

بەوپییە دریژی دیجلە لەخاپور -خالی هاتنەناوەوەی دیجلە بۆ کوردستانی باشور تا شارۆچکەی فەتحە- خالی چوونە دەرەوەی لەکوردستانی باشور (٤٨٨کم)ە[٧٥]

سەرچاوەکانی رووباری دیجلە دەکەونە ناوچەی دەریاچەی هازاری باکوری کویستانەکانی مەعدەن‌و چیاکانی هەکاری لەکوردستانی باکور. پیش ئەوەی بەکوردستانی باشوردا تیپەریت بەدریژایی (٣٠٠کم) بە کوردستانی باکوردا بەشارەکان وەکو ئیرغانی، دیاربەکر، حەسەن کیفی‌و جزیرەدا تیپەردەبیت‌و چەندین چۆمی وەکو باتمان‌و خیرزان‌و بۆتانی تیدەرژیت[٧٦] لەنزیك گوندی خاپور دیجلە داخلی کوردستانی باشور دەبیت. لیرە بەدواوەو تا گەیشتنی بەریژگەکەی لەشەتولعەرەب، لەبەری چەپەوە پینج چۆمی سەرەکی تیدەرژیت کە هەر پینجیان کەوتونەتە کوردستانی باشورەوەو تیکرای ئەم چۆمانە (٦٥,٧٧٪)ی بری ئاوی سالانەی رووبارەکە پیکدەهینیت. لەنیو ئەوانەدا بری ئاوی زیی گەورە بەتەنیا هیندەی هەرچوار چۆمەکەی ترە. (بروانە خشتەی ژمارە "٧").

(ناوەندی هاوردەی سالانەی ئاوی رووباری دیجلە لەماوەی نیوان سالی ١٩٣٠ تاسالی ١٩٥٨ "کەلە سامەرا پیوراوە"، لە دەوروبەری (٤٩) ملیار مەترسیجا دا بووە. ئەوپەری بری هاوردە لەکاتی لافاوەی سالی ١٩٥٤ی شاری بەغدادا (١٤) هەزار مەترسیجا بووە بۆ چرکەیەك‌و، کەمتری ئەوبرە (کە لە شارۆچکەی فەتحە پیوراوە) لەهەمان سالدا(٢٠٠)مەتر سی جا بۆ هەرچرکەیەك. تیکرای نزمترینی بری هاوردە (١) ملیار مەتر سیجا بووە لەسالیکداو، ئەوپەری ئەوبرە (٦٢) ملیار مەتر سی جا بووە لە هەردوو سالی ١٩٤٦و ١٩٤٧دا[٧٧]

هەموو لقەکانی دیجلە هەر لەخالی هاتنە ناوەوەی بۆ کوردستانی باشور تا گەیشتنی بەریژگەکەی لەشەتولعەرەب لەوپەری خواروی عیراقدا، دەکەونە کوردستانی باشورەوە، ئەو لقانەش یەك بەدوای‌یەك لەباکورەوە بۆ باشور بەم شیوەیەیە[٧٨] :-

١-چۆمی خاپور

ئەم چۆمە لەگەڵ روباری هیزلدا لەکوردستانی باکور هەڵدەقولین. لەسنوری (٢٠٠کم)ی باکوری شاری موسڵ لەبەری چەپەوە (لەخۆرهەڵاتەوە) دەرژێتە دیجلەوە.

ئەم چۆمە لەگەڵ دیجلەدا حەوزێك پێکدەهێنن کەبرەکەی دەگاتە (٢٨٪)ی سەرجەم ئاوی روباری ناوبراو.

٢-چۆمی زێی گەورە

ئەم چۆمە لەچیاکانی کوردستانی باکور لەکێوەکانی مەرگەنەداغی نیوان هەردوو دەریاچەی وان و ورمێ و ناوچەی باشقەڵاو دەوروبەری جۆلەمێرگ هەڵدەقولێت. ناوچەکانی زێبارو بەرزان ئاوەدەدات و چۆمەکانی شەمدینان و حاجی بەگ و رەواندزو دیلمانی لێدەبێتەوەو، چۆمی خازەر کە لەدەوربەری ئامێدی هەڵدەقولێت لەخۆرئاوای شارۆچکەی گوێرەوە دەرژێنە ناویەو، لە (٤٥کم)ی باشوری موسڵدا لەنیوان شاری موسڵ و شرگاتدا لەبەری چەپەوە دەرژێنە روباری دیجلەوە.

٣-چۆمی زێی بچوك

ئەم چۆمە لەکوردستانی خۆرهەڵات لەنزیك ناوچەی لاهیجان و ناوچە سنورییەکانی ئێستای عیراق- ئێرانەوە هەڵدەقولێت و چۆمەکانی گۆمەو کۆیەو کەندیناوای تێدەرژێت و بەنداوەکانی دوکان و دبسی لەسەر رۆنراوە. لە نزیك شارۆچکەی فەتحەوە لەبەری دەرژێتەوە روباری دیجلەوە.

٤-چۆمی خاسە (عوزیم)

لەناوچەی بازیان و دەوروبەری شارۆچکەی چەمچەماڵەوە هەڵدەقولێت و سیلاوەکانی داقوق و واقسوی تێدەرژێت و ناوچەکانی کەرکوك و داقوق و توزخورماتوو ئاودەدات. زۆربەی وەرزەکانی هاوین ئەم چۆمە وشك دەکات، لەنزیك شارۆچکەی بەلەدەوە دەرژێتە بەری چەپی رووباری دیجلەوە.

٥-چۆمی سیروان

ئەم چۆمە لەکوردستانی خۆرهەڵات و دەوروبەری چیاکانی هەورامان و چوارتاو پینجوین و خورماڵ و ماوەت هەڵدەقولێت و سیلاوەکانی تانجەرۆو چۆمەکانی ئەلوەن و دیوانەی تێدەرژێت. چۆمی تانجەرۆ سەرچاوەی بنەرەتی چۆمی سیروانە لەکوردستانی باشوردا. بەنداوەکانی دەربەندیخان و حەمرینی

لەسەر رۆنراوەو لە (٣٠كم)ی خواروی بەغدادا لەبەری چەپەوە دەرژێتە دیجلەوە[٧٩]

| ریژەی سەدی لە تیکرای ئاوی دیجلە | تیکرای بری ئاوەکەی ملیار/ م٣ | تیکرای ئاوەرۆ م٣ /چرکە | دریژی/ کم (لەکوردستانی باشوردا) | دریژی/ کم (سەرجەم) | روبارو چۆم |
|---|---|---|---|---|---|
| ١٠٠ | ٤٤,٤٢ | ١٤٠٠ | ٤٨٨ | ١٧١٨ | دیجلە |
| ٢,٢١ | ٩٨و٠ | ٣١ | (-) | ١٦٠ | خاپور |
| ٣٢,٦٤ | ١٢,٦٥ | ٤٠٢,٨ | ٢٣٠ | ٣٩٢ | زیی گەورە |
| ١٦,٧١ | ٧,١٤ | ٢٢٦ | ٢٥٠ | ٤٠٠ | زیی بچوك |
| ١,٦٤ | ٨٦و٠ | ٢٧,٦ | ١٥٠ | ١٥٠ | خاسە (عوزیم) |
| ١٣,٥٧ | ٥,٠٣ | ١٦٠,٦ | ٣٠٠ | ٣٨٦ | سیروان |
| ٦٥,٧٧ | ٢٦,٦٦ | ٨٤٨ | | | تیکرای ئاوەرۆی لقەکانی دیجلە |

**خشتەی ژمارە (٧)**
**رووباری دیجلەو لقەکانی[٨٠]**

## (٢-٦-٣): عەماراوو بەنداوەکان[٨١]

### ١-عەماراوو بەنداوی دوکان لەسەر زێی بچوک

ئەم بەنداوە کە لەساڵی ١٩٥٩دا دروستکرا، دەوروبەری (٦٠کم) لەباکوری خۆرئاوای شاری سلێمانیو (٨٠کم) لەباکوری خۆرهەڵاتی شارۆچکەی پردێو نزیکەی (١٠٠کم) لەکەرکوکو (٣٥٠کم) لەبەغداوە دوورە. بەنداوی دوکان بڕی (١٣٠٠م[٣]/چرکە) لەئاوەڕۆی ئەو لافاوە دەگرێتەوە کە لەڕێی زێی بچوکەوە دەڕژێتە دیجلەوە.

دیواری بەنداوەکە لەشێوەی کەوانێکدا لە خەرەسانە بنیات نراوە. درێژییەکەی لەسەرەوە (٣٢٥م)و بنکەی خوارووی (٥٠م)و بەرزییەکەی (١٠٨م)و پانایی سەرەوەی (٩م) ئەستورە درێژی عەماراوەکەش لەناو ئاوەڕۆی زێیەکەدا (٤٠کم)و پانایییەکەی (٢٠کم)ە. بەرزی ئاوەکە لەبەردەم دیواری بەنداوەکەدا (١٠٠م)و لەئاستی دەریاوە (٥١١م)ە.

بەنداوی دوکان بڕی (٦,٨)ملیار مەترسێجا ئاو دەگرێتو پێوانەی رووی دەریاچەکە (٢٧٠ کچگ- کیلۆمەتری چوارگۆشە) دەبێت.

جگە لەو وزە کارەبایەی کە بە (١٢٠,٠٠٠ کیلۆوات/ سەعات) دادەنرێتو لەقەڵبەزەکانی بەنداوەکەوە راستەوخۆ بەرهەم دەهێنرێت، ئەم بەنداوە لە ئاودێری ناوچەکانی دەوروبەری زێی بچوکو زێی خاسە کە هاوینان وشک دەکاتو بەشێکی ئەو زەوییانەی کە دەکەونە پارێزگاکانی کەرکوکو هەولێرو دیالەوەو بە (١,٣٠٠,٠٠٠دۆنم) دادەنرێت، رۆڵی گرنگ وازی دەکات. ئەمەجگە لەنەهێشتنی مەترسی لافاوی بەهارانی زێی بچوک لەسەر شارو ناوچەکانی خوار فەتحە کە دیجلەیان پێدا رەت دەبێت.

### ٢-عەماراوو بەنداوی دەربەندیخان لەسەر زێی سیروان

بەنداوی دەربەندیخان لەساڵی ١٩٦١دا لە (٦٠كم)ی خواروی خۆرهەڵاتی شاری سلێمانیو لەسەر زێی سیروان دامەزرێنرا.
ئەم بەنداوە رۆڵی سەرەكی لەكۆكردنەوەی ئەو ئاوەدا دەبینێت كەساڵانە مەترسی لافاو لەدیجلەو سیروان خۆیدا دەخوڵقێنێت.
دیواری بەنداوەكە لەتێكەڵەی گڵو بەردو خەرەسانە داڕێژراوە بنكەی دیوارەكە (٥٠م)و رووی سەرەوەی (٩م) ئەستورە. درێژی دیواری بەنداوەكە (٥٣٥م)و بەرزییەكەی (١٢٨م)ە.
بەنداوی دەربەندیخان نزیكەی (٣)ملیار مەترسێجار ئاو دەگرێتو بەوپێیەش رووی دەریاچەكە دەگاتە (١٢٠كچگ).
بڕی ئەو وزە كارەبایەی لەقەڵبەزەكانی بەنداوەكەوە بەرهەم دەهێنرێت بە (٣٧,٥٠٠ كیلۆ وات/ سەعات) دادەنرێت.

### ٣-عەماراوو بەنداوی دبس لەسەر زێی بچوك

ئەم بەنداوە كە دەكەوێتە (٨كم)ی خۆرئاوای شارۆچكەی پردێ، لەسەر زێی بچوك بنیات نراوە.
بەنداوی دبس لەدیوارێكی خەرسانە بەبەرزی (١٥م) دروستكراوەو توانای كۆكردنەوەی (٣)ملیار مەترسێجا ئاوی هەیە. درێژی دەریاچەكە دەوروبەری (١٣كم)و ناوەندی پانی دەوروبەری (٢كم) دەبێت.
ئەم بەنداوە شان بەشانی بەنداوی دوكان یارمەتی نەهێشتنی مەترسی لافاو دەداتو لەئاودێری ناوچەكانی خوار خۆیدا رۆڵی گەورە دەبینێتو بڕی (١٥٠٠٠ كلیۆ وات/ سەعات) وزەی كارۆئاوی بەرهەم دەهێنێت.

### ٤-عەماراوو بەنداوی حەمرین لەسەر زێی سیروان

جگە لەوبەشەی زێی سیروان كە دەكەوێتە سەروی بەنداوی دەربەندیخانەوە، ئیتر بەنداوەكە ناتوانێت مەترسی بڕی ئەو لافاوەی كەزێی سیروان لەخواروی بەنداوەكەوە دروستی دەكات، نەهێڵێت.
روپێوی حەوزی سیروان كە (٣٠,٦٦٠كچگ)یە، (١٢,٧٦٠ كچگ)ی ئەو روپێوە دەكەوێتە نێوان بەنداوی دەربەندیخانو چیای حەمرینەوە، جا بۆئەو

مەبەستەو لەساڵی ١٩٨٢دا لە (١٠کم)ی باکوری بەنداوی دیالەو (١٢٠کم)ی باکوری خۆرهەڵاتی بەغدادا، بەنداوی حەمرین لە کەنارەکانی زنجیرە چیای حەمرین دروستکرا.

بەشی سەرەکی دیواری بەنداوەکە تێکەڵەی ناواخن قورو روپۆشی چەورپێژە. درێژییەکەی (٣٣٦٠م)و بەرزییەکەی (٤٠م)ە.

لەتەنیشت بەنداوی ناوبراوەوە بەنداوێکی بچوك بەمەبەستی رێگەگرتن لە دزەکردنی ئاوەکۆکراوەکە بۆ دۆڵەکەی خوار گوندی (الطویلة)، دروستکراوە.

بەنداوی حەمرین توانای کۆکردنەوەی (٣,٩٥)ملیار مەترسیجا ئاوی هەیەو پێوانەی رووی دەریاچەکە (٣٧٤ کچگ) دەبێت.

جگە لەنەهێشتنی مەترسییەکانی لافاوو سوود وەرگرتن لێی بۆ کاروبارەکانی ئاودێری بەنداوەکە توانای بەرهەمهێنانی (٥٠)میگاوات وزەی کارەبای هەیە.

**٥-عەماراوو بەنداوی موسڵ لەسەر روباری دیجلە**

بیرۆکەی دامەزراندنی ئەم بەنداوە بۆ ساڵەکانی یەکەمی ئەم سەدەیە دەگەڕێتەوە بەڵام تا ساڵی ١٩٨٠ دەست بەکارکردن بۆ دروستکردنی نەکرا. بەنداوی موسڵ کەڕاستەوخۆ لەسەر روباری دیجلەو لەنێوان هەردوو گوندی (دێرج)و (ضوء القمر)دا رۆنراوە، بەدووری (٥٥کم) دەکەوێتە باکوری شاری موسڵەوە.

نەخشەی بەنداوەکە واکێشراوە کە بەرزییەکەی (١٢٥م)و درێژییەکەی (٣٥٠٠م)و درێژی دەریاچەکە دەوروبەری (١٤٠کم)و پانییەکەی لەدەوروبەری (٤٠کم)دا بێت. بەم پێیە پێوانەی رووی دەریاچەکە دەوروبەری (٣٧٠کچگ)و توانای کۆکردنەوەی (١٣,٧٣)ملیار مەترسێجا ئاوی دەبێت.

بەنداوی موسڵ توانای بەرهەمهێنانی بڕی (١٠٣٤) میگاوات کارەبای هەیەو زەوییەکی بەرفراوان ئاودەدات و مەترسی لافاوی دیجلە لەسەر شاری موسڵ و بەغدا بەرێژەیەکی زۆر، کەم دەکاتەوە[٨٢]

| عەماراوو بەنداو | فراوانی (ملیار/م٣) | تێبینی |
| --- | --- | --- |
| ئاسکی موسڵ | ١٣,٢ | تەواونەکراوە |
| دوکان | ٦,٨ | تەواوکراوە |
| دەربەندیخان | ٣ | تەواوکراوە |
| دبس | ٣ | تەواوکراوە |
| حەمرین | ٣,٩٥ | تەواوکراوە |
| بەخمە | ٨,٣ | پەك خرا |
| عوزێم | ٢,٧٥ | لەژێر لێکۆڵینەوەدایە |
| فەتحە | ٨ | لەژێر لێکۆڵینەوەدایە |
| ئەڵوەن | ١٠ (ملیۆن/م$^{3}$) | تەواونەکراوە |
| کەوڵۆس | ٧٠ (ملیۆن/م$^{3}$) | تەواونەکراوە |
| دهۆك | (-) | تەواونەکراوە |

خشتەی ژمارە (٨)

عەماراوو بەنداوەکانی کوردستانی باشور[٨٣]




**نەخشەی ژمارە (١٧)**
**هایدرۆلۆجیای کوردستانی باشور**

## سەرچاوەو پەراوێزەکانی بەشی دووەم

[١]-طه باقر (الدكتور)، مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة، الجزء الأول بغداد، مطبعة دارالشؤون الثقافية العامة، ١٩٨٦ ل٢٠٧.

[٢]-هەمان سەرچاوە، ل٢٠٩.

[٣]-ميريلا غاليتي، "التراث الكردي في مؤلفات الأيطاليين"، تعريب وتعليق وايضاحات: الدكتور يوسف صبح، گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق- دەستەی کورد، (بەرگی هەشتەم، ١٩٨١). ل٢٢٥، ٣٠٠

[٤]-هەمان سەرچاوە، ل٢٢٥، ٣٠٠.

[٥]-فەتاحی قازی، کورد لەئینسکلۆپیدیای ئیسلامدا، وەرگێڕانی حەمەکریم عارف، دەستخەت. ل١٧

[٦]-هەمان سەرچاوە. ل١٩

[٧]-عبدالرحمن قاسملۆ (دکتۆر)، کوردستان و کورد، وەرگێڕانی عبدالله حسن زادە، لەبلاوکراوەکانی بنکەی پێشەوا، ١٩٧٣، ل٤٠.

[٨]-هەمان سەرچاوە، ل٤١.

[٩]-فەتاحی قازی، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٧

جی، ار، درایڤر، "انتشار الكرد في العصور القديمة" ترجمة فؤاد حەمە خورشيد، مجلة شمس كردستان، (العدد٥٩، ايارو حزيران ١٩٨٠)، ل١٧، ٢٠.

[١١]-فەتاحی قازی، هەمان سەرچاوەی پێشو، ل١٨

[١٢]-وشەکانی ناو کتێبەکەمان وەکو خۆی نوسیووەتەوە، تەنیا دەستکاری ڕێنوسەکەیمان کردووە.

[١٣]-محمد أمين زکی، کوردو کوردستان، جلدا، بەغدا، چاپخانەی دارالسلام، ١٩٣١ ل٨، ٩.

[14]- هەمان سەرچاوە، ل١٠

[15]- هەمان سەرچاوە، ل١٠

[16]- دکتۆر عەبدولڕەحمان قاسملۆ لەکتێبەکەی خۆیدا (کوردستان و کورد) نوسیوە: (وشەی کوردستان بۆ یەکەم جار لەسەدەی چوارەدە لە رۆژگاری فەرمانڕەوایی سەلجوقییەکان دا بەکارهێنراوە). واپێدەچێت نووسەر ئەو سەدەی چواردەیەی لەو مێژووەوە هێنابێت کە کتێبی (نزهة القلوب)ەکەی (حمدالله مستوفی) تێیدا لەسالانی (١٣٣٥-١٣٤٠ز)، واتە لە سەدەی چواردەدا نووسراوەو هەرهەمان مێژووشی بەهەڵە کردبێتە ئەو مێژووی کەتێیدا بۆیەکەمجار وشەی (کوردستان)ی پێناسراوە.

[17]-لەشرۆڤەکردنی ئەم زانیارییە مێژوویيانەدا ئەم سەرچاوانە کراونەتە بنەما: عبدالعزيز سليمان نوار، تأريخ العراق الحديث، القاهرة، المؤسسة المصرية العامة للتأليف والنشر، ١٩٦٨ هەروەها- مجموعة مؤلفين، العراق في التأريخ، بغداد، دار الحرية للطباعة، ١٩٨٣، هەروەها- فەتاحی قازی، هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[18]-سلمان الدركزلي (العقيد الركن)، جغرافية العراق العسكرية، بغداد مطبعة البرهان، ١٩٥٦ ل١٨٧

[19]-هەمان سەرچاوە، ل ١٨٨

[20]-الجمهوريه العراق، وزارة الدفاع، الجغرافية العسكرية، بغداد، مطبعة الكلية العسكرية، ١٩٧٥ ل١٩٠

[21]-هەمان سەرچاوە، ل١٩٢

[22]- فاضل حسين (الدكتور)، مشكلة الموصل، بغداد، مطبعة الرابطة، ١٩٥٥ ل٧٨

[23]-رۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە ٤٥٧، هەولێر، ١٩٩٣/٨/٩ ل٣.

[24]- لسترنج، جغرافياى تأريخي سرزمينهاى خلافت شرقى، ترجمة محمود عرفان، چاپ سوم، شركت انتشارات علمي و فرهنگى، ١٣٦٧، ل٩٥.

[٢٥]-تاڤرنييه، العراق في القرن السابع عشر كما راه الرحالة الفرنسي تاڤرنييه، نقله الى العربية وعلق عليه و وضع ملاحقه: بشير فرنسيس و كوركيس عواد، بغداد، مطبعة المعارف، ١٩٤٤ ل١٤٢

[٢٦]-فەتاحی قازی، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢.

[٢٧]- محمد امین زەکی، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٨.

[٢٨]- شاكر خصباك (الدكتور)، الأكراد، مطبعة شفيق، بغداد، ١٩٧٢، ل٧.

[٢٩]-دبليو، ار، هي، سنتان في كردستان، ترجمة فؤاد جميل، الجزء الأول، بغداد، ١٩٧٣ ل٥٨.

[٣٠]- باسل نيكيتين، الأكراد، بيروت، دار الروائع، ١٩٦٧ ل٢٨

[٣١]-زرار محمدشواني، "الكرد في العصر العباسي حتى مجيء البويهيين"، (رساله ماجستر غير منشوره، جامعه صلاح الدين ، كلية الأداب، ١٩٩٤). ل٢٩.

[٣٢]- س. جى. أدموندز، كرد و ترك و عرب، ترجمة جرجيس فتح الله، بغداد مطبعة التايمس، ١٩٧١ ل٧

[٣٣]- ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، هەمان سەرچاوەی پێشوو. ل٣.

[٣٤]- هەمان سەرچاوە. ل٣.

[٣٥]- چیا، ئەمنی ستراتیجی عێراق و سێ کوچکەی بەعسییان: تەرحیل، تەعریب، تەبعیس، لەبڵاوکراوەکانی دەزگای ناوەندی ڕۆشنبیری کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان، ١٩٨٧ ل١٥٤

[٣٦]- عبدالرحمن قاسملو (دکتۆر)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لە١٢

[٣٧]-م.س. لازارێڤ، کێشەی کورد، وەرگێڕانی دکتور کاوس قەفتان، بەغدا، ١٩٨٩ ل٣٧

[٣٨]-فەتاحی قازی، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٧

[٣٩]- ابراهيم شريف (الدكتور)، الموقع الجغرافي للعراق، الجزء الأول، بغداد، مطبعة، سنة (بلا)، ل ٢٥٧.

[٤٠]- ب.م. دانتسيغ، الرحالة الروس في الشرق الأوسط، ترجمة وتعليق الدكتور معروف خەزنەدار، بغداد، ١٩٨١ ل١٧٧

[٤١]- جێگەی تێرامانە لەکاتێکدا نووسەری عەرەب دکتۆر شاکر خەصباك بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ رووبەری کوردستانی باشور کەئەو بە (العراق الشمالی) ناوی بردووە بە (٩٢٠٩٩کچگ) داناوە، کەچی بەشی گەورەی نووسەران و خاوەن بڕوانامە کوردەکان لەترسا، یا بۆ ئەوەی بە نەتەوەپەرست تاوانبار نەکرێن هەمیشە ئەو رووبەرەیان لەوە کەمتر داناوە کەهەیە. بۆ نمونە سیاسەتمەداری کورد دکتۆر عەبدولڕەحمان قاسملۆ لە دکتۆرانامەکەی خۆیدا روبەری کوردستانی باشوری بەتەنیا (٧٢٠٠٠کچگ) داناوە. بۆ زۆرتر زانیاری بڕوانە شاکر خصباك (الدكتور)، العراق الشمالی ، بغداد، مطبعة شفيق ١٩٧٣ هەروەها- عبدالرحمن قاسملو (دکتۆر)، هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[٤٢]- مەڵبەندی قەزاکانیش بەناحیەیەك حساب کراون.

[٤٣]- لەدانانەوەی ناوی پارێزگاو شارو شارۆچکەکاندا، زۆربەی ناوە نارەسمییەکانمان داناوەتەوە.

[٤٤]- لەدابەشبوونی ئیداری- سیاسی ناوچەکانی سەربەکوردستانی باشوردا ئەگەرچی تاساڵی ١٩٩٠ لەبەردەستدا بوو، بەڵام لەبەر ئیعتباراتی لێکۆڵینەوەکە ئەوەکەی ساڵی ١٩٨٥ کراوەتە بنەما. بڕوانە:

الجمهورية العراقية، وزارة التخطيط، الجهاز المركزي للأحصاء المجموعة الاحصائية السنوية لسنة ١٩٨٥. بغداد.

[٤٥]- جاسم محمد الخلف (الدكتور)، محاضرات في جغرافية العراق الطبيعية والأقتصادية والبشرية، مطبعة لجنة البيان العربي، ١٩٦١ ل١٨ هەروەها- شاكر خصباك (الدكتور)، العراق الشمالي، سەرچاوەیەكی پێشووتر، ل٩-١٦

[٤٦]- جاسم محمد الخلف (الدكتور)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٣٠.

[٤٧]- هەمان سەرچاوە، ل٣٠-٣٤.

[٤٨]- هەمان سەرچاوە، ل١٤٠-١٤٥

[٤٩]- شاكر خصباك (الدكتور)، العراق الشمالي، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٣.

[٥٠]- هەمان سەرچاوە، ل١٤٣-١٤٥

[٥١]- هەمان سەرچاوە، ل١٤٦

[٥٢]- هەمان سەرچاوە، ل١٤٥-١٥٣

[٥٣]- هەمان سەرچاوە، ل ٢٥

[٥٤]- هەمان سەرچاوە.

[٥٥]- زانیارییەكانی ئەم چەند لاپەڕەیە لەم دووسەرچاوەیەوە تاووتوێ كراون:

-شاكر خصباك (الدكتور)، العراق الشمالی، هەمان سەرچاوەی پێشوو. هەروەها

-جاسم محمد الخلف (الدكتور)، هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[٥٦]- بەهەمان شێوە زانیارییەكانی ئەم چەند لاپەڕەیەش لەهەردوو سەرچاوەی پێشووەوە شرۆڤەكراون.

[٥٧]- بڕوانە: صباح محمود الراوی (الدكتور)، المناخ الزراعي في شمال العراق. مجله كاروان هەروەها- محمد أزهر سعيد لسماك (الدكتور) وأخرون، العراق- دراسة اقليمية، ج١ جامعة الموصل مديرية مطبعة جامعة الموصل، ١٩٨٥ ل٣٦،٣٧.

هەروەها- جاسم محمد الخلف (الدكتور)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١١٣-١١٤

[58]- ئەمە جگە لەبوونی شریتێکی بچوکی خاك لەدەشتە لیتەییەکان لەوپەڕی باشوری خۆرهەلاتی کوردستانی باشوردا.

[59]- علی حسین الشلش، مناخ العراق، مطبعة جامعة البصرة، ١٩٨٨، البصرة.

[60]- هەمان سەرچاوە

[61]- هەمان سەرچاوە

[62]- هەمان سەرچاوە

[63]- محمود شوقي الحمداني، لمحات من تطور الري في العراق، مطبعة السعدون ١٩٨٤/ بغداد، ل ٥٣.

[64]- علی حسین الشلش، هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[65]- بۆ ئامادەکردنی ئەم خشتەیە سود لەم دوو سەرچاوەیە وەرگیراوە:

-علی حسین الشلش، هەمان سەرچا وە پێشوو. هەروەها- الجمهورية العراقية، الهيئة العامة للأنواء الجوية العراقية، قسم ال موارد المائية، معلومات غير منشورة.

[66]- هەمان سەرچاوە.

[67]- صباح محمود الراوی (الدکتور)، هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[68]- بۆ ئامادەکردنی ئەم خشتەیە سوود لەم دوو سەرچاوەیە وەرگیراوە:

-علی حسین الشلش، هەمان سەرچاوەی پێشوو، هەروەها الجمهورية العراقية، الهيئة العامة للأنواء الجوية العراقية، هەمان سەرچاوەی پێشو

[69]- ناوچەیەکی بچوکی رەشەخاکەکان لەوپەڕی باشوری خۆرهەلاتی کوردستانی باشور دەکەوێتە ژێر کاریگەریی کەشوهەوای وشکی بیاباناوییەوە.

[70]- بڕوانە محمد سعید السماك (الدکتور) واخرون، سەرچاوەیەکە پێشووتر، هەروەها جاسم الخلف (الدکتور)، هەمان سەرچاوەی پێشوو

[71]- بەشی گەورەی زانیارییەکانی ئەم فەسڵە لەم سەرچاوەیە تاووتوێ کراوە:

شاكر حصباك (الدكتور)، الأكراد، سەرچاوەیەكی پێشووتر.

٧٢- الجمهوريـة العراقيـة، وزارة التخطيـط، الجـهاز المركـزي للأحصـاء المجموعـة الأخصائية السنوية لسنة ١٩٧١، بغدا. ل ١١٢

٧٣- عباس فاضل السعدي (الدكتور)، منطقة الزاب الصغير في العراق، بغداد، مطبعة، اسعد، ١٩٧٦ ل٢٤٧، ١٤٨

٧٤- هەمان سەرچاوە. ل٢٥٢

٧٥- هەمان سەرچاوە. ل٢٥١.

٧٦- محمد أزهر سعيد السماك (الدكتور) واخرون، العراق- دراستة اقليمية، ج٢، جامعة الموصل، مديرية مطبعة جامعة الموصل، ١٩٨٥ ل٥٨٣،٥٨٤.

٧٧- بڕوانە: فەتاحی قازی، سەرچاوەیەكی پێشووتر. هەروەها- جاسم محمد الخلف، سەرچاوەیەكی پێشووتر. ل١٧٦،١٧٧

٧٨- محمود شوقی الحمدانی، لمحات من تطور الری في العراق. هەمان سەرچاوەی پێشوو. ل١٥،١٦

٧٩- بۆ شرۆڤەكردنی ئەم زانیارییانە سود لەم دوو سەرچاوەیە كراوە:

-شاكر خصباك (الدكتور)، العراق الشمالی، سەرچاوەیەكە پێشوتر.

-جاسم محمد الخلف (الدكتور)، هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٨٠- جگە لەم رووبارو چۆمە سەرەكییانە، چەند رووبارو چۆمێكی بچوكیش لە كوردستانەوە تێكەڵ بەم چۆمانە دەبنو دەرژێنەوە دیجلە. لەوانە چۆمی (خەوصەر) كە لەدامێنی چیاكانی مەقلوبو بەرزاییەكانی جەومەلو دەوریەری (وادی الحلم)و خەرصاباتو باشیقەو شێخانەوە هەڵدەقوڵێتو لەبەری چەپەوە بەرامبەر شاری موسڵ دەرژێتە ناو دیجلەوە

[٨١]- بڕوانە شاكر خصباك (الدكتور)، العراق الشمالي، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٩٧. هەروەها- الجمهوريه العراقية وزارة اتلخطيط، الجهاز المركزي للأحصاء، المجموعه الأحصائية لسنة ١٩٩١، بغدا. ل٦

[٨٢]- ئەم زانیارییانە لەم دوو سەرچاوەیەوە تاووتوێ کراون:

-جاسم محمد الخلف (الدكتور)، هەمان سەرچاوەی پێشوو. ل٢٠٤-٢١٢

-محمود شوقي الحمداني، لمحات من تطور الري في العراق، هەمان سەرچاوەی پێشوو. ل٣٠٧-٣١٥

[٨٣]- جگە لەم بەنداوانە، بەنداوی بەخمە لەسەر زێی گەورە یەکێك بوو لەو پرۆژە گەورانەی کە لەهەشتاکانەوەو لەسەردەستی حکومەتی عێراقی کاری جدی بۆ جێبەجێکردنو بەئەنجام گەیاندنی کرا.

ئەو پرۆژەیە کە بەهۆی راپەرینی خەڵکی کوردستانەوە کارکردن تێیدا وەستاو لەو قۆناغەیدا پەکی خرا، نیازوابوو دواقۆناغی کارکردن لە لە ساڵی ١٩٩٥دا کۆتایی پێبهێنرێتو پرۆژەکە تەواو بکرێت.

بیرکردنەوەو پلان دانان بۆ دامەزراندنی بەنداوی بەخمە بۆ پەنجاکانی ئەم سەدەیە دەگەڕێتەوە، مەبەست لەدامەزراندنیشی بەپلەی یەکەم نەهێشتنی یا کەمکردنەوەی مەترسی لافاوبووە لەدیجلەدا. ئەمە گەر زانیمان کەساڵانە بڕی ٢٨٪ی ئاوی دیجلە لەزێی ناوبراوەوە دەیگاتێتو، دواجاریش کۆکردنەوەی بڕێکی ئاوی پێویست بووە بۆ کشتوکاڵو ئاودێری لەناوچەکانی ناوەڕاستو باشوری عێراقدا.

بەنداوی بەخمە دەکەوێتە دەربەندی بەخمە لەزنجیرە چیای بەرات لە خۆرهەڵاتی شارۆچکەی ئاکرێ. بەرزی دیواری بەنداوەکە (٢٦٥م)و درێژییەکەی (٨٤٠م)و پێوانەی ڕووی ئاوی دەریاچەکە (١٤٠ کچگ)و بڕی ئاوی کۆکراوە لەعەماراوەکەدا دەگەیشتە (٨,٣) ملیار مەتر سێجا. واش چاوەڕان دەکرا کەبڕی کارەبایەی

لەقەڵبەزەکانی ئەم بەنداوە بەرهەم بهێنرێت (٢,٥٠٠) میگاوات بێت. (بۆ زۆرتر زانیاری بڕوانە:- محمودشوقی الحمدانی، لمحات من تطور الری فی العراق، هەمان سەرچاوەی پێشوو. ل ٣٢٨،٣٢٩).

حکومەتی بەعس جیا لەو مەبەستانەی کەپێشتر بڕیاری دامەزراندنی بەنداوەکەی بۆ درابوو، گەرەکی بوو لەرێی عەماراوی بەنداوەکەوە، ناوچەیەکی فراوانی دانیشتوان لەنێوان هەردوو هەرێمی سۆران و بادینانادا بکات بەژێر ئاوەوەو، بەمە دابڕێکی سروشتیی بخاتە نێوان هەردوو هەرێمی ناوبراوەو.

دوای راپەڕینی ساڵی ١٩٩١، هەموو مومتەلەکاتە بەبەهاکانی پرۆژەکە کە دەکرا هەموو کوردستانی باشوری پێ ئاوەدان بکرایەتەوە، لەلایەن هەردوو حیزبی دەسەڵاتدارانی باشورەوە تاڵان و بڕۆکران و بەتەنیا چوار ملیۆن دیناری تەزویر فرۆشتیانە ئێران.

## فەسلی یەکەم

# عێراقو تەوەرە ستراتیجییەکانی بەرگریکردن / دەرەوە

### پێشەکی:

عێراق-بەکوردستانەوە- دەکەوێتە باشوری خۆرئاوای کیشوەری ئاسیاوە. لە باکورەوە تورکیا، لە باشورەوە کەنداوی عەرەب-فارسو کوەیتو بەشێکی سعودیە، لە خۆرهەلاتەوە ئێران، لەخۆرئاواوە سوریا وئوردونو بەشێکی تری سعودیە دەورەی دەدەن.

عێراق دەکەوێتە نێوان بازنەکانی (٢٦٥°-٢٢´ ٣٧°)ی باکورو هێڵەکانی درێژەی (٤٨´ ٤٥°- ٤٥´ ٣٨°)ی خۆرئاواوە. بەم پێیە درێژی عێراق لەزاخۆ لەوپەڕی باکورەوە: تافاو لەوپەڕی باشورەوە (١١٧٤کم)ە وپانی عێراق لە خانەقین لەوپەڕی خۆرهەلاتەوەو تارەتبە لەوپەڕی خۆرئاواوە(٤٩٨کم)ە

لە کاتێکدا درێژی سنورە وشکاییەکانی عێراق دەگاتە (٣٥٠٠کم)، جگە لە کەنارێکی(٦٥کم)ی سەرکەنداو لەوپەڕی باشورەوە، ئیتر عێراق هیچ کەنارێکی ترشك نابات بەدەریاوەی ببەستێتەوە. ئەمەش وایکردووە عێراق ولاتێکی نیمچەداخراوی وشکایی بێت.

ئەگەرچی لەڕووی بازرگانیەوە مەوقعی عێراق لە سەردەمە کۆنەکانداو بەتایبەتیش کە هۆکارەکانی گواستنەوەی دەریایی سەرەتایی بوون، گرنگی گەوهەری هەبووە، بەلام بەپێشکەوتنی ئەو هۆکارانە و بەتایبەتیش پاش

کردنەوەی کەناڵی سویس، لەڕووی بازرگانیەوە مەوقعی عێراق گرنگییە کلاسیکییەکەی خۆی لەدەست دا

لەڕوی‌عەسکەرییەوە مەوقعی عێراق گرنگی گەورەی هەیە. عێراق رووپێوێکی لەبەرچاوی ناوچەی خۆرهەلاتی ناوەڕاستو دراوسێی ولاتە خاوەن نەوتەکانی ناوچەکەو بۆ خۆیشی یەکێکە لەولاتە بەرهەمهێنە گەورەکانی نەوت لەجیهاندا.

تەوەرەکانی جموجۆڵی عەسکەریی هەر دەوڵەتێك، پێش مەبەستی هێرشبەرانە بەنیازی بەرگریکردن لە هێرشو پەلاماری دەوڵەتی تر دادەڕێژرێت. بۆ داراشتنی ئەو تەوەرانەش، ستراتیجی عەسکەری دەوڵەت هەرچۆنێك بێت، هێرشبەرانە بێت یان بەرگریکەرانە، ئاسایشی نەتەوەیی ولات دەکرێتە بنەما. بەشێوەیەکی گشتی تەوەرەکانی جموجۆڵی عەسکەریی کەپێشیان دەوترێت تەوەرەکانی بەرگریکردن یان تەوەرە ستراتیجییەکان، ئەو رێگەوبان‌ومەڵبەندو ناوچانەن کەسوپایەك دژ بەسوپایەکی‌تر لەکاتی هەلایسانی جەنگ بەمەبەستی بەرگریکردن یان هێرشکردنە سەر نیشانێکی ستراتیجی دەیگرنەبەر.

فیزیۆگرافیاو تۆبۆگرافیای هەرێمو ناوچەیەك پێوەندییەکی راستەوخۆو ماکی داڕشتنی تەوەرەکانی جموجۆڵە.. سروشتی خاك، کەشوهەوا، کاریتەو بەربەستە سروشتیو دەستکردەکان، سەرچاوەکانی ئاوو ئاوەڕۆی دەریاچەو رووبارو چۆمەکان، بەرزیو نزمی خاكو چیاو گردۆڵکەو رەشەخاكو بیابانەکان، تێکرا ئەو هۆکارانەن کە زانستی جوگرافیای عەسکەری لەداڕشتنی تەوەرەکانی جموجۆڵدا دەیانکاتە کەرەستەکانی لێکۆڵینەوە. جیا لەوانەش چڕی دانیشتوانی گردبوونەوەیانو مەڵبەندە ئابوریو سیاسیو هەرێمە ئەتنیکییە گرنگەکان، نیشانی ستراتیجیو ئەو تەوەرانە دەبن.

لەبەرئەوەی عێراق بەتایبەتیش لەسەردەمی دەسەلاتداریتی بەعسدا هەرگیز لەباری ئاشتیدا نەبووەو هەمیشە لەباری پشێویو شەڕدا بووە... شەڕ دژی کورد، دژی گەلانی عێراق، دژی دراوسێکانی، بۆیە عێراق لەدیدێکی فراوانخوازانەوە هەموو دەوڵەتانی دراوسێ بەدوژمنی خۆی داناوەو هەر لەسەر ئەو بنچینەیەش تەوەرەکانی جموجۆڵی عەسکەریی خۆی دژ بەولاتانی دراوسێ ئاراستەو شرۆڤەکردووەو بەو پێیەش خاکی ولاتانی دراوسێی بەنیشانی دوورمەودای هێرشو پەلاماری سوپای عێراق داناوە.

عێراق لەسەر بنچینەی (مەترسیەكانی دەرەوە) تەوەرەكانی بەرگریكردنی خۆی بەشێوەیەك دارشتووە كەڕوو لەپاراستنی ئەم شوێنانە بن :-
(١-بەغدا: كەپایتەختی عێراق و شوێنی كۆبوونەوەو جێگیربوونی داوودەزگاكانی دەوڵەت و ناوەندی حوكمڕانی سەرانسەری وڵاتە، واتە: دڵی دەوڵەتەكەیە.
٢-كەركوك: كەسەرچاوەو شادەماری ئابوری عێراق و گرنگترین شوێنی ستراتیجی باكوری عێراقە. گرتنی كەركوك یانی دەست گرتن بەسەر سەرچاوەی پەترۆڵی عێراقداو بێبەشكردنی دەوڵەتی عێراق لەو سامانە زۆرەی نەوتی كەركوك.
٣-بەسرە: كە تاكە دەروازەی عێراقە بەسەر دەریاوەو بینەقاقایەتی[٢].)
دیاریكردنی تەوەرەكانی بەرگریكردن لەعێراق لەسەر بنچینەی مەترسییەكانی دەرەوە، واتە دیاریكردنی تەوەرەكانی جموجۆڵی عەسكەریی نێوان عێراق و هەریەكە لە دەوڵەتەكانی ئێران، توركیا، سوریا، ئوردون، سعودیەو، كوەیت.
ئەوەی مەبەستی لێكۆڵینەوەكەی ئێمەیە، ئەو تەوەرانەن كەڕاستەوخۆ خاكی كوردستان دەكەنە بەشێك لەگۆڕەپانی جموجۆڵ. بۆیە لەدیاریكردنی ئەو تەوەرانەدا تەنیا ئەوانەیان دەخەینەڕوو كە بەكوردستاندا تێپەڕدەبن. ئەوانیش: تەوەرەكانی جموجۆڵی نێوان عێراق و هەریەكە لەتوركیا، بەشێكی ئێران و، بەشی باكوری سوریایە[٣]

## (٣-١-١): تەوەرەكانی جموجۆڵی عەسكەریی نێوان عێراق- ئێران

### یەكەم: گۆڕەپانی جموجۆڵ

گۆڕەپانی جموجۆڵی عەسكەریی بەنسبەت ئێرانەوە، ئەم شارانە دەگرێتەوە: ورمێ (رەزائیە)، تەورێز، كرماشان (بەختەران)، ئەهواز.
بەڵام بەنسبەت عێراقەوە ئەم پارێزگایانە لەخۆدەگرێت: ئەربیل، سلێمانی دیالە، واست، میسان، بەسرە.
بەشێوەیەكی گشتی گۆڕەپانی جموجۆڵی عەسكەریی نێوان عێراق- ئێران دەكرێتە سێ بەشی سەرەكی، بەم شێوەیە:

## بەشی باکور

ئەم بەشە دەکەوێتە نێوان خاڵی بەیەکگەیشتنی سنوری عێراق- ئێران- تورکیاو رووباری سیروان لەنزیك هەڵەبجە. لەم بەشەدا هێڵی سنوری بەنسبەت ئێرانەوە قۆقزو بەنسبەت عێراقەوە رووچاڵە. ئەم لەزنجیرە چیای سەخت لەهەردوو دیوی سنورەوە پێکهاتووە. گرنگی ئەم بەشە بەم شێوەیەیە:-

١-هەردوو گرێی هاتوچۆی: موسڵ لەباکوری عێراق و تەورێز لەباکوری خۆرئاوای ئێران دەکەونە ئەم بەشەوە. سەرەڕای ئەوەش تێپەڕبوونی گرنگترین تەوەرە کە تەوەرەی هەولێر- تەورێزەو هەموو بەشەکە پێکەوە گرێ دەدات، لەگرنگی ناوچەکەی زۆرتر کردووە.

٢-ئەم ناوچەیە گرنگترین مەڵبەندەکانی بەرهەمهێنانی نەوتی عێراقی تێدەکەوێت، بەڵام بەنسبەت ئێرانەوە هیچ نیشانێکی ستراتیجی مەترسیدار نییە.

لێرەوە دەتوانرێت دەرئەنجامی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکرێن:

*تێپەڕینی هێڵی سنوری بەناوچە شاخاوییەکاندا هەمان کاریگەریی بۆ هەردوولا دەبێت.

*بەنسبەت عێراقەوە چیاکان دیوارێکی سروشتییان دروستکردووە دژی هەر پێشڕەوییەك کەلە خۆرهەڵاتەوە بکرێت.

*کەمی ڕێگاوبان و بێکەڵکی ڕێگاوبانەکانی ئەم ناوچەیە لەوەرزی زستاندا، خستنەگەڕی کەرتی فراوان و گەورەی عەسکەریی گەلێك دژوار دەکات.

*ناوچەکە زۆرتر بەکەڵکی جموجۆڵی بەرگریکەرانە دێت وەك لەهێرشکردن و دەتوانرێت بەهێزی کەم و لەڕێی سابوتاژەوە لەمیانەی ڕێگاوبانە سەرەکییەکاندا بەرگری بکرێت.

## بەشی ناوەڕاست

ئەم بەشەی گۆڕەپانەکە دەکەوێتە نێوان رووباری سیروان و شاری کوتەوە. هێڵی سنوری لەم بەشە دا بەنسبەت عێراقەوە قۆقزو بەنسبەت ئێرانەوە رووچاڵە. گرنگی ئەم بەشە بەم شێوەیەیە:

١-ئەم بەشە دوو نیشانی ستراتیجی تێدەکەوێت. ئەوانیش: بەغداو تارانە.
٢-مەترسیدارترین و گرنگترین تەوەرەکانی جموجۆڵ بەم بەشەدا رەت دەبن.
٣-نزیکبوونەوەی هێڵی سنور لەبەغدا بەدووری (٩٠میل)، لەکاتێکدا ئەم دوورییە بۆ تاران پێنج ئەوەندەیە.
٤-کاریتە سروشتییەکان دەکەونە دیوی ئێرانەوەو زنجیرە چیاکان ناوچەیەکی سەخت پێکدەهێنن کەئەرکی بەرگریکردن ئاسان دەکەن و گرنگترین کاریتەش دەربەندی (بای تاق)ە لەزنجیرەی کەرەند.
٥-تێپەڕینی هێڵی سنور بەبنارەکانی خۆرئاوای چیاکانی پشتکۆ وادەکات ناوچەیەکی شاخاوی بەنسبەت ئێران و ناوچەیەکی رووتەن و دەشتایی بەنسبەت عێراقەوە پێك بهێنێت.
لێرەوە دەتوانرێت دەرئەنجامی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکرێن:
*بوونی زنجیرەی چیا سەختەکان بەنسبەت ئێرانەوە کاری بەرگریکردن لەو ناوچەیە ئاسان و کاری هێرشبەرانە دژوار دەکات.
*نەبوونی کاریتەی گرنگ بەنسبەت عێراقەوە جگە لەگردۆڵکەکانی دارەوشکەو قزلربات و حەمرین کە لەقوڵی چەپیانەوە پشت بەڕووباری سیروان دەبەستن. بەڵام قوڵی راستیان مەترسی گرتنی لەسەر دەبێت.
*تێپەڕینی هێڵی سنوری بەرکەنارەکانی خۆرئاوای چیاکانی پشتکۆدا، لەهەردوو باری بەرگری و هێرشدا لەبەرژەوەندی ئێراندا دەبێت، چونکە هێڵەکە کۆنترۆڵی زەوییە دەشتاییەکانی عێراق دەکات.
*نزیکبوونەوەی هێڵی سنوری لەگرنگترین نیشانی ستراتیجی کە بەغدایە وادەکات بەگەیشتن بۆ ئەم ناوچەیە، عێراق بکاتە دوو کەرەتەوە، بەتایبەتیش کەڕێگاوبانە قیرتاوکراوەکانی ئەم ناوچەیە گرنگییەکەی زێدەتر دەکات.

**بەشی باشور**

لەبەرئەوەی تەوەرەکانی ئەم بەشە بەخاکی کوردستاندا رەت نابن، وازی لێ دەهێنین.

## دووەم: تەوەرەکانی جموجۆڵ

لەگۆڕەپانی عێراقی- ئێرانیدا سێ تەوەری سەرەکی جموجۆڵی عەسکەری هەیە کەئەمانەن:-

١-تەوەرەی تەوریز- مهاباد- هەولێر.
٢-تەوەرەی تاران- کرماشان- بەغدا.
٣-تەوەرەی ئەهواز- بەسرە.

**١-تەوەرەی تەوریز- مهاباد- هەولێر**

أ-ئەم تەوەرەیە بەگرنگترین تەوەرە ستراتیجییەکانی ناوچەکە دادەنرێت: چونکە ناوچە پەترۆڵییەکانی عێراق بەناوچەی ئازەربایجانی ئێران دەبەستێتەوەو تەوریز کەبۆ خۆیشی گرێی هاوتوچی باکوری خۆرئاوای ئێرانەو موسڵ کە گرێی هاتوچۆی باکوری عێراقە، لەڕێی هەمان تەوەرەوە پێکەوە دەبەسترێنەوە.
ب-ڕێگەکە کە درێژییەکەی لەهەولێرەوە بۆ تەوریز (٣٥٥میل)ە، بەشێوەیەکی باش قیرتاوکراوەو لەهەموو وەرزەکانی ساڵدا بۆ هەردوولا بەکەڵکی گواستنەوەو ڕۆیشتنی ماشێن دێت. زستانان بەفر هێندێك شوێنی ڕێگەکە کە بەناوچەیەکی شاخاوی سەختدا گوزەردەکات دەگرێت و ئەمەش جموجۆڵی بەرگری ئامێزانەی سوپای عێراق و شەڕی پەکخستنی بەرامبەر ئاسان دەکات، بەتایبەتی پاش داگیرکردنی دەربەندە جیاجیاکانی سەر ڕێگەکە، کە بریتین لە: دەربەندی حاجی ئۆمەران، دەربەندی رایات، دەربەندی رازانۆك، دەربەندی بەرسرینی، دەربەندی جوندیان، گەلی عەلی بەگ، دەربەندی سپیلك و دەربەندی میراوە.
پ-ناوچەکانی گردکردنەوەی هێزەکان و نیشانەکان:
بەنسبەت ئێرانەوە:
*ناوچەکانی گردکردنەوەی هێزەکان: تەوریز، مهاباد، مەراغە، میاندواو.
*نیشانەکان: ڕەواندز، هەولێر، کەرکوك، موسڵ.
*ناوچەکانی گردکردنەوەی هێزەکان: هەولێر، ڕەواندز،و هێزەکانی پێشەوەش لەڕایات.
*نیشانەکان: مهاباد، مەراغە، تەوریز.

## ٢-تەوەرەی تاران- کرماشان- بەغدا

أ-ئەم بەشە مەترسیدارترینی هەموو بەشەکانە بەنسبەت سوپای عێراقەوە، لەبەرئەم هۆیانە:-

*کورتترین ڕێگایە لەنێوان بەغداو تاراندا و بەشێوەیەکی چاك قیرتاوکراوە. هەروەها ناوچەکە بەکەڵکی جموجۆڵی عەسکەریی دێت و هێڵی سنوری لەبەغدای پایتەختی عێراق بەشێوەیەك نزیك دەبێتەوە کە دەگاتە (٩٠میل).

*سەرەڕای ئەو ئەنجامە ئەدەبییانەی کەبەهۆی گرتنی بەغدای پایتەختەوە دێتەکایە هێزی بەرامبەر دەتوانێت خۆی بگەیەنێتە ڕووباری فورات و بەهۆی نزیکبوونەوەی دیجلە لەفورات لەم ناوچەیەدا عێراق بکاتە دووپارچە.

*لەناوچەکەدا هیچ کۆسپێکی گرنگی وەها نییە کە جموجۆڵی عەسکەریی پەك بخات، چونکە هیچ کام لەگردۆڵکەو بەرزاییەکانی دارەوشکەو قزڵڕیات و حەمرین کۆسپی گەورە پێکناهێنن لەبەردەم پێشڕەوی سوپای هێرشکەردا.

*مەترسی بوونی هەڕەشەکردن لەقۆڵی ڕاستی سەنگەرە بەرگرییەکانی دارەوشکەو قزڵڕیات و حەمرین بەئاقاری (مەندەلی- بەلەدروز- بەعقوبە). جموجۆڵ بەم ناوچەیەدا تەواوکەری جموجۆڵە لەقۆڵەکەی تردا.

*بوونی چەند مەوقعێکی گرنگ لەناوچەکەدا وەکو چوار ڕێیانی جەلەولاو بەعقوبە.

*ناوچەکە ئاوی هەیەو ژیان تێیدا لەبارە.

*ناوچەکە بەکەڵکی بەکارهێنانی ماشێن دێت بەشێوەیەکی فراوان.

ب-ناوچەکانی گردکردنەوەی هێزەکان و نیشانەکان:

بەنسبەت ئێرانەوە:

*ناوچەکانی گردکردنەوەی هێزەکان: هەمەدان، کرماشان، هەروەها هێزەکانی پێشەوەش دەشێت لەقەسری شیرین بن.

*نیشانەکان: چوار ڕێیانی جەلەولا، بەعقوبە، بەغدا.

بەنسبەت عێراقەوە:

*ناوچەکانی گردکردنەوەی هێزەکان: سەعدیە، جەلەولا، بەعقوبەو هێزەکانی پێشەوەش لەخانەقین و مەندەلی.

*نیشانەکان: کرماشان، هەمەدان، تاران.
پ-سوپای عێراق دەتوانێت یەکێك لەم دوو پلانی بەرگرییە بگرێتەبەر:
یەکەمیان، پەلامارێکی خێرابدات‌و ناوچەی بای تاق بگرێت‌و لەوێوە بەرگری بکات.
دووەمیان، بەرگریکردن لای زنجیرەکانی دارەوشکەو قزڵرِبات‌و حەمرینەوە، ئینجا چاودێری کردنی دەروازەی مەندەلی بەهێزە بزۆکەکان.
*ت-ئەو رێگاوبانانەی هەردوولا لە کاتی پێشرِەویدا دەیگرنەبەر بریتین لە:
*رێگای بەغدا- بەعقوبە- خانەقین- قەسری شیرین- کرماشان- هەمەدان- تاران.
*رێگای بەغدا- بەعقوبە- مەندەلی- ئیلام.
*رێگاوبانەکانی باشوری خۆرهەڵاتی ناوچەی سلێمانی تەواوکەری جموجۆڵەکانی ئەم بەشەیە.
ج-جگە لەو دوو تەوەرە سەرەکیەی کەباسکران، دوو تەوەرەی ناسەرەکی تر هەن، بەم شێوەیە:
یەکەمیان، تەوەرەی کرماشان- سلێمانی
*بەبەراورد لەگەڵ تەوەرەکانی تر، ئەم تەوەرەیە بە تەوەرەیەکی ناسەرەکی دادەنرێت کەهەرِەشە لەناوچەی کشتوکاڵیی سلێمانی دەکات‌و لەوێشەوە هەرِەشە لەناوچە پەترۆڵییە مەترسیدارەکەی کەرکوك‌و ئاقاری بەغدای پایتەخت دەکات.
*رێگاوبانەکانی ناوچەکە لەدیوی عێراقدا بەکەڵکی هاتوچۆی ماشێن دێن بەڵام لەدیوی ئێراندا سەختترەو بوونی زنجیرە چیاکانی ئەم لاو ئەولای رێگاکەش یارمەتی بەرگریکردن بۆ هەردوولا دەدەن.
*گرنگترین رێگاکانی ئەم تەوەرەیە بریتین لە:-
-رێگای کرماشان- سنە- مەریوان- پێنجوێن- سەیدسادق- سلێمانی.
-رێگای کرماشان- سنە- سەقز- بانە- سەردەشت- قەڵادزێ- سلێمانی.
-رێگای کرماشان- سنە- سەقز- بانە- چوارتا- سلێمانی.
-رێگای کرماشان- نەوسود- هەڵەبجە- سلێمانی.
دووەمیان، تەوەرەی کوت- بەدرە- زرِباتیە- مەهران- ئیلام- ئیسلام ئاباد، کرماشان.

*ئەمەش تەوەرەیەکی ناسەرەکییە کەدەشێت هێزە ئێرانییەکان بۆ هەڕەشەکردن لەدیجلەو پێشڕەویکردن بەرەو حەوزی فورات لەرێگای (کوت- حەی- ناسریە)وە بەمەبەستی دووکەرتکردنی عێراق سوودی لێببینن.
*تاکە رێگایەك کەکوت بە مەهرانەوە دەبەستێتەوە رێگای (کوت-بەدرە- زرباتیە- مەهران- ئیلام- کرماشان)ە.
*لەکاتی روودانی جموجۆڵ لەبەشی ناوەڕاستی گۆڕەپانی سنوری عێراقیدا، دەشێت سوپای ئێران چەند گاردێکی ناسەرەکی بۆ یارمەتیدانی گاردە سەرەکیو پێشڕەوەکانی تەوەرە سەرەکییەکان بنێرێت، کەرێگای کوت وەکو گرێی هاتوچۆو پاشان بەغدا بکاتە نیشان. بەڵام بەنسبەت سوپای عێراقەوە مەهرانو دەلۆرانو گیلانو پاشانیش کرماشان دەکاتە نیشان.

## (٣-١-٢): تەوەرەکانی جموجۆڵی عەسکەریی نێوان عێراق- تورکیا

### یەکەم: گۆڕەپانی جموجۆڵ

گۆڕەپانی جموجۆڵی عەسکەریی عێراق- تورکیا، لەهەدوو دیوەوە دەکەونە خاکی کوردستانەوە. گۆڕەپانە دەکرێت بەدوو بەشەوە:-
بەشی خۆرهەڵات، کەدەکەوێتە نێوان خاڵی بەیەکگەیشتنی سنوری عێراق- ئێران- تورکیاو تەوەرەی ئامێدی- موسڵ.
بەشی خۆرئاوا، کە دەکەوێتە نێوان تەوەرەی ئامێدی- موسڵو خاڵی بەیەکگەیشتنی سنوری عێراق- تورکیا- سوریا.

### بەشی خۆرهەڵات

١-ئەم بەشە لەهەردوولاوە لەناوچەیەکی شاخاوی زۆر سەخت پێکهاتووە، کەبەهۆی سەختیو کەمی رێگاوبانەوە یارمەتی جموجۆڵی فراوان نادات. بەڵام بۆ جموجۆڵی بەرگریکەرانە لەبارە.
٢-بەهۆی نزیکی ئەم بەشە لەناوچەی ئازەربایجانی ئێرانو گرێدانەوەی بەمەترسیدارترین هێڵەکانی جموجۆڵەوە کە ئەویش رێگای (موسڵ- هەولێر- رەواندز- سەقز- مهاباد- تەورێز)ە، بۆتەهۆی ئەوەی لەم ئاقارەوە هەڕەشە لەم بەشە بکرێت، ئەگەر بێتو هێزەکانی خۆرهەڵات بەرەو پێش بێنو ئازەربایجانو

تەوریز داگیر بکەن و بەرەو تەوەرەی (تەوریز- رەواندز- هەولیر)و لەویشەوە بەگاردیکی ناسەرەکی بەرەو تەوەرەی (تەوریز- وان- باشقەلا- ئامیدی) پیشرەوی بکەن. بەمەش هەرەشە لەگۆرەپانی سنوری باکور دەکریت و موسڵ دەکەویتە مەترسییەوە.

ریگای (باشقەلا- دیزەکوار- نیری- جامە- رەواندز)ە، ریگاکە تا جامە لەسەر زیی رۆکچوک بەکەڵکی هاتوچۆی ماشین دیت و لەویوە دەشیت گاردە سەرەکییەکانی تر لەریگا سەرەکییەکانی ناوچەکەوە پیشرەوی بکەن، بەرگریکردن لەم بەشەدا بۆ هەردوولا لەبارە، عیراق دەتوانیت بە دریژایی زنجیرە چیاکان کەئەم ریگاوبانانەیان پیدارەت دەبیت، سەنگەری بەرگری لی‌بدات.

٣-نیشانەکان:

*بەنسبەت تورکیاوە لەقوڵی تەوریز- رایاتەوە هیزەکان بەرەو رەواندزو هەولیر وەکو دوو نیشانی پیشەوەو، پاشان بەرەو موسڵ وەکو نیشانە ستراتیجییەکە پیشرەوی دەکەن.

بەلام لەقوڵی وان- باشقەلا- ئامیدی- موسڵەوە هیزەکان بەرەو ئامیدی‌و دهۆك وەکو دوو نیشانی پیشەوەو، پاشان بەرەو موسڵ پیشرەوی دەکەن.

*بەنسبەت عیراقەوە نیشانە ستراتیجییەکانی لەقوڵی دووەمەوە (ئامیدی- وان) سوپای دوژمن‌و باشقەلایە وەکو دوو نیشانی پیشەوەو، پاشان بەرەو وان وەکو نیشانی ستراتیجی لەباشوری خۆرهەلاتی تورکیا.

**بەشی خۆرئاوا**

١-ئەم بەشە بەنسبەت عیراقەوە مەترسیدارترین بەشی گۆرەپانی باکورە، چونکە لەم بەشەدا شیوەی خاك دەشتیاییەو بەرگریکردن دژوار دەبیت.

٢-ئەم بەشە گرنگترین ئەو ریگایانەی پیدا دەرِوات کەیارمەتی پیشرەویکردنی بەرفراوانی ماشین دەدات لەزۆربەی وەرزەکانی ساڵدا لەباکورەوە بەرەو خۆرئاوا.

٣-دیسانەوە ئەم بەشە دوو مەترسیدارترین نیشانی ستراتیجی‌و گریی هاتوچۆی تیدەکەویت، کەئەوانیش موسڵ‌و دیاربەکرە.

٤-شێوەی زەوی بەنسبەت تورکیاوە کەنزیکی سنوری عێراق- سوریایە لەباکوردا، بەهۆی بوونی ئەو زنجیرە چیایانەی کۆنترۆڵی هەموو ڕێگاوبانەکانی کردووە، کاری بەرگریکردنی بۆ تورکیا ئاسانو بۆ عێراق دژوارکردووە. چونکە خاکی عێراق لەم بەشەدا رووتەنو دەشتیاییەو هیچ کۆسپێکی گرنگی وەها نییە کەپێشڕەوی سوپا لەباکورەوە پەك بخات.

٥-جگە لە ناوچە نزیکەکانی روباری دیجلە، ئیتر ناوچەکە وشكو بێئاوە.

٦-لەبەرئەوەی بەشێك لەڕێگاوبانەکانی جموجوڵ کەعێراق بەتورکیاوە گرێ دەدات بەخاکی سوریادا بەوناوچەیەی کە بە (دەنوکی مراوی) ناسراوە رەت دەبێت، هەڵوێستی سیاسی سوریا رۆڵی گەورە لەهەڵبژاردنی رێگاوبانەکانی جموجوڵدا دەکات.

## دووەم: تەوەرەکانی جموجۆڵ

لەگۆڕەپانی عێراق- تورکیادا سێ تەوەرەی سەرەکی جموجۆڵی عەسکەریی هەیە، کەئەمانەن:

١-تەوەرەی دیاربەکر- جزیرەی بن عومەر- موسڵ.

٢-تەوەرەی دیاربەکر- نوسەیبین- تەلکوچك- زاخۆ- موسڵ.

٣-تەوەرەی جزیرەی بن عەمەر- شەلەگییە- تەلئەبوزاهیر- زوممار- عێنزالە- موسڵ.

١-تەوەرەی دیاربەکر- جزیرەی بن عەمەر- زاخۆ- موسڵ

ا-ئەگەر تورکیا پەلاماری سوریا نەداتو سوریاش بێلایەن بمێنێتەوە ئەوا ئەم رێگایە لەم بەشەی گۆڕەپانی باکوردا تەوەرەی سەرەکی جموجوڵ دەبێت. چونکە ئەم رێگایە تاکە رێگایە لەهەموو وەرزەکاندا بەکەڵکی هاتوچۆی سەرجەم کەرتە جیاجیاکانی سوپا بێتو یارمەتی هەردوولاش دەدات کەهێزی گەورە بخەنە مەیدانەوە.

ب-گرنگترین سەنگەرەکانی بەرگریکردنی عێراق لەسەر ئەم رێگایە چۆمی خاپورو دەربەندی زاخۆو چیا سپییە، کە لەبەری خۆرهەڵاتەوە کۆنترۆڵی

ڕێگاکە دەکات و هەروەها مەوقعی فایدە پاش زامنکردنی پشتیوانی لە قۆڵەکانی سەنگەرەکانی سەرچیای دهۆك و سەنگەرەکانی پێچاوپێچەکانی روباری دیجلەوە. هەروەکو دەتوانرێت پردی ئالوکە بتەقێندرێتەوەو بکرێتە سەنگەرێکی خۆحەشاردان و دەشکرێت سود لەچۆمی ئەلخۆس وەربگیرێت. دواجار دەکرێت سەنگەرێك لەسەر رووباری دیجلە بۆ بەرگریکردن لەشاری موسڵ لێبدرێت.

پ-ناوچەکانی گردکردنەوەی هێزەکان و نیشانەکان:

بەنسبەت عێراقەوە:

*ناوچەکانی گردکردنەوەی هێزەکان: موسڵ، دهۆك و هێزەکانی پێشەوەش لەزاخۆو ئامێدی.

*نیشانەکان: سوپای تورکی و یەکەم هەنگاو جزیرەی بن عەمەر، ئینجا لەهەنگاوی دووەمدا شاری دیاربەکر.

بەنسبەت تورکیاوە:

*ناوچەکانی گردکردنەوەی هێزەکان: دیاربەکرو هێزەکانی پێشەوەش لەجزیرەی بن عەمەرو هەکاری (جۆڵە مێرگ).

*نیشانەکان: سوپای عێراق و لەهەنگاوی یەکەمدا زاخۆو هەنگاوی دووەمیش موسڵ و ئینجا نیشانە ستراتیجییە مەترسیدارەکە کەرکوك.

٢-تەوەرەی دیاربەکر- نوسەیبین- تەلکوچك- موسڵ

ا-ئەم ڕێگایە بەخاکی سوریادا دەڕوات، بۆیە ئەو لایەنەی نەیەوێت پەلاماری سوریا بدات، ناتوانێت سوود لەم ڕێگایە وەربگرێت.

ب-ڕێگاکە بەخاکێکی گردۆڵکەییدا دەڕوات کە یارمەتی هاتوچۆی ماشێن و شەڕی زرێپۆش دەدات. لایەنی عێراق هیچ کۆسپێکی نییە بۆ بەرگریکردن سوودی لێوەربگرێت جگە لەچیای شنگار کەدەکرێت وەکو سەنگەرێکی لاشان بەرامبەر سوپای باکور بەکاربهێنرێت. پاشانیش دەکرێت گردۆڵکەکانی نزیك موسڵ کە بەعەتشان ناسراون سەنگەری بەرگرییان تێدا لێبدرێت

پ-ئەم ڕێگایە لەگەڵ هێڵی ئاسنی ناوچەکەدا هاوتەریبە، ئەمەش کاری درێژەپێدانی کەرتە جیاجیاکان و گردبوونەوەیان ئاسان دەکات. هەروەها

دەکرێت سەرەڕای ئەو ڕێگایانەی تر کەعێراق بەسوریاوە دەبەستێتەوە، سود لەم ڕێگایە وەربگرێت بەمەبەستی گردکردنەوەی هێزەکان لەخاکی سوریادا ئەو دەمەی سوریا دووچاری مەترسی دەبێت.

ت-ناوچەکانی گردکردنەوەی هێزەکان و نیشانەکان:

بەنسبەت عێراقەوە:

*ناوچەکانی گردکردنەوەی هێزەکان: موسڵ و هێزەکانی پێشەوەش لەشنگار.

*نیشانەکان: سوپای تورکی و ماردین وەکو نیشانێکی پێشەوەو ئینجا لەهەنگاوی دووەمدا دیاربەکر وەکو نیشانە ستراتیجییە گرنگەکە.

بەنسبەت تورکیاوە:

*ناوچەکانی گردکردنەوەی هێزەکان: دیاربەکرو هێزەکانی پێشەوەش لەماردین و جزیرەی بن عومەر.

*نیشانەکان: سوپای عێراق و، ئینجا موسڵ وەکو نیشانە ستراتیجییە گرنگەکە.

٣-تەوەرەی جزیرە بن عومەر- شەلەگییە- تەلئەبوزاهیر- عێنزالە- موسڵ

ئەم ڕێگایە کەهاوتەریبی ڕووباری دیجلەو بەرێگایەکی ناسەرەکی دادەنرێت. هێزەکانی تورکیا بۆ پێشڕەویکردنی گاردێکی ناسەرەکی بەمەبەستی پەرتەوازەکردنی بەرگرییەکانی عێراق و یارمەتیدانی گاردە سەرەکییە پێشڕەوەکەی تەوەرەی (دیاربەکر- تەلکوچك- موسڵ)، سوود لەم ڕێگایە وەردەگرن.

## (٣-١-٣): تەوەرەکانی جموجۆڵی عەسکەریی نێوان عێراق- سوریا

### یەکەم: گۆڕەپانی جموجۆڵ

گۆڕەپانی جموجۆڵ لەنێوان عێراق و سوریادا بەشێوەیەکی گشتی لەیەک بەشی سەرلەبەر پێکدێت. بەنسبەت عێراقەوە گۆڕەپانەکە پارێزگاکانی نەینەواو ئەنبار دەگرێتەوەو، بەنسبەت سوریاوە پارێزگاکانی جزیرەو دێرلزور لەخۆدەگرێت.

سیفەتە گشتییەکانی گۆڕەپانەکە بەم شێوەیەیە:-

١-بەشی هەرەزۆری خاکی ئەم گۆڕەپانە دەشتایی و رووتەنەو هیچ کۆسپێکی سروشتیی گرنگی تێناکەوێت.

٢-خاکی عێراق لەم گۆڕەپانەدا بەشی هەرە گەورەی بریتیە لەخاکی جزیرە کەخاکێکی گردۆڵکەیەو چەند بەرزاییەکی ساکاری تێدەکەوێت و بەگشتی سیفەتەکانی خاکی بیاباناوی هەیە.

٣-بەهۆی وشکەڕۆیی و پتەوی خاکەوە گۆڕەپانەکە لەهەموو وەرزەکانی ساڵدا بەکەڵکی بەڕێوەچوونی جموجۆڵی هەمەچەشنە دێت.

٤-کەشوهەوای بەشی گەورەی ئەم ناوچەیەو بەتایبەتیش ئەو بەشانەی لەهێڵی سنوری عێراق- سوریا نزیکن، لەکەشوهەوای ناوچەی بیاباناوی دەچێت. هەر لەبەرئەوەشە ئەو جموجۆڵانەی لەم گۆڕەپانەدا بەڕێوەدەچن مۆرکی جەنگی بیاباناوییان دەبێت.

٥-لەرێگای سوریاوە ئەم گۆڕەپانە عێراق بەئیسرائیلەوە دەبەستێتەوە، چونکە ئەو تەوەرانەی عێراق بەسوریاوە دەبەستێتەوە دەچنەوە سەر نیشانە ستراتیجییەکانی ئیسرائیل.

٦-گرنگی ئەم گۆڕەپانە لەوکاتەدا دەردەکەوێت کەهێزەکانی باکور بۆ داگیرکردنی سوریا پێشڕەوی بکەن، ئیتر ئەو دەمە گۆڕەپانەکە دەبێتە گۆڕەپانێکی هاوبەش لەنێوان هێزە شەڕکەرەکانی عێراق و سوریا لەلایەک و، هێزەکانی باکوریش لەولاکەی ترەوە.

## دووەم: تەوەرەکانی جموجوڵ

لەگۆڕەپانی عێراق- سوریا سێ تەوەرەی سەرەکی جموجوڵی عەسکەریی هەیە، کەئەمانەن:

١-تەوەرەی موسڵ- حەڵەب.

٢-تەوەرەی بەغدا- روباری- ئەلبۆکەمال- دێرلزور- حەڵەب.

٣-تەوەرەی بەغدا- فەلوجە- رەتبە- دیمەشق.

تەوەرەی موسڵ- حەڵەب

ا-ئەم تەوەرەیە لەتەوەرە گرنگەکانی گۆڕەپانی جموجوڵی عێراق- سوریایە چونکە بەنسبەت هەردوولاوە مەترسیدارترین دوو نیشانی ستراتیجی کە گرێی هاتوچۆی باکوری عێراق واتە موسڵو گرێی هاتوچۆ سوریا کە حەڵەبە پێکەوە دەبەستێتەوە، سەرجەم رێگاوبانەکانو هێڵەکانی ئاسن بەرەو باکورو باشوری سوریا لەحەڵەبەوە سەرچاوە دەگرنو هەرلێرەشەوە بەهێڵە مەترسیدارەکانی جموجوڵی تورکیاوە دەبەسترێنەوە.

موسڵ لەرێی چەند تەوەرەیەکەوە بەحەڵەبەوە گرێ دەدرێت، کەئەمانەن:-

*تەوەرەی موسڵ- تەلەعفەر- شنگار- حەسەکە- شەدادی- دێرلزور- حەڵەب.

*تەوەرەی موسڵ- تەلەعفەر- ئەلبەدیع- دێرلزور- حەڵەب.

*تەوەرەی موسڵ- تەلکوچك- قامیشلی- حەڵەب.

ب-ناوچەکانی گردکردنەوەی هێزەکانو نیشانەکان:

بەنسبەت عێراقەوە:

*ناوچەکانی گردکردنەوەی هێزەکان: هێزەکانی پێشەوە لەموسڵو شنگارو تەلەعفەر گرددەبنەوە.

*نیشانەکان: حەسەکەو دێرلزور وەکو دوو نیشانی پێشەوە، پاشان بەرەو نیشانە ستراتجییە مەترسیدارەکە دیمەشق.

بەنسبەت سوریاوە:

*ناوچەکانی گردکردنەوەی هێزەکان: هێزەکانی پێشەوە لەحەڵەبو حەسەکە گرددەبنەوە.

*نیشانەکان: شنگارو تەلەعفەر وەکو دوو نیشانی پێشەوەو، پاشان موسڵو بەغدا وەکو دوونیشانی ستراتیجی مەترسیدار.

لەبەرئەوەی دوو تەوەرەکەی تری نێوان عێراق- سوریا؛ تەوەرەی بەغدا- رومادی- ئەلبۆکەمال- دێرلزور- دیمەش، هەروەها تەوەرەی بەغدا- فەلوجە- رەتبە- دیمەشق، بەکوردستاندا تێناپەڕن، باسیان ناکەین.

فەسڵی دووەم

# عێراقو تەوەر ستراتیجییەکانی بەرگریکردن / ناوەوە

## (٣-٢-١): چۆن کوردستانی باشور بەعێراقەوە لکێنرا؟

### یەکەم: زاراوای (عێراق) وعێراق لەمێژوودا

عێراق وەکو دەوڵەت، وەکو ئەم قەوارەیەی ئێستای ، هەشتا ساڵی تەمەنی تێنەپەڕاندووە. ئەگەرچی ناوی (عێراق) زۆرکۆنە، بەڵام پێش هەشتا ساڵو بە درێژایی مێژوو، دەوڵەتێك نەبووە ناوی عێراق بووبێت. پێش ئیسلامو لەکاتی سەرهەڵدانی ئیسلامدا، نەك قەوارەیەك نەبووە ناوی عێراق بووبێت، بەڵکو شتێك نەبووە ناوی(نیشتمانی عەرەب)یش بووبێت. کەئیسلام سەری هەڵدا، جگە لە بەشێکی جزیرەی عەرەب، ئیتر ئەم وڵاتانەی کە ئێستا بەنیشتمانی عەرەب ناسراون موڵکی چەند ئیمپراتۆریەتێکی گەورەی ئەوکاتەی دنیا بوون، بێزەنتیەکان هەموو وڵاتی شامو میسر مەغریبیان لەژێر دەستدا بوو، فارسە ساسانییەکانیش ئەو زەوییانەی باشورو ناوەڕاستی ئێستای عێراقو خاکی یەمەنو هەموو کەنداویان لەژێردەستدا بوو، تەنانەت تائەودەمەش کەعەرەبەکانی نەببوون بەموسڵمان، نیمچە دورگەی عەرەب بۆخۆی دەوڵەتێکی یەکگرتووی عەرەبەکانی پێك نەدەهێنا. دوای مردنی پێغەمبەری ئیسلامو لەسەردەمی دەسەڵاتی خەلیفە راشدینییەکانەوە فتوحانی عەرەبە موسڵمانەکان بەرەو شامو سەرزەمینەکانی ئێستای عێراق دەستی پێکرد. لەسەردەمی

خەلیفە عومەردا سوپای ئیسلام گەیشتە کوردستان، سەرەتا موسڵیان گرتو لەوێشەوە بەرەو باکورو خۆرهەڵات تاشارەزور پێشڕەوییان کرد.

سەرزەمینەکانی باشورو ناوەڕاستی عێراقی ئێستا بەراورد لەگەڵ نیمچە دورگەی عەرەبدا، یەکێك بوو لەو سەرزەمینە بەپیتو بەرەکەتانەی کەپاش فتوحات بەلێشاو عەرەبە کۆچەرەکانی نیمچە دورگەی عەرەبو موسڵمانە شەڕکەرەکان تێیدا نیشتەجێ بوونو جێیان نەهێشت.

بەڵام لەبەرئەوەی جگە لە عەرەب پێشتر ئەقوامی تری غەیرە عەرەبیش نیشتەجێی ئەو سەرزەمینانەبوون، بۆیە مێژوونووسانی عەرەب خۆیشیان زاراوەی (عێراقی عەرەبی)و زاراوەی (عێراقی عەجەمی)ییان بۆ ناوچە جیاجیاکانی ئەو سەرزەمینانە بەکارهێناوە. تەنانەت ئەو دەمەش (عێراقی عەرەبی) یا (عێراقی عەجەمی) هێمانەبوو بۆ قەوارەیەکی سەربەخۆو دیاریکراو یا دەوڵەتێکی خاوەن سنور، بەڵکو تەنیا وەکو زاراوەیەکی جوگرافیایی کەسنوری باکوری لە شاری (تکریت) سەری نەکردووە، بەکارهاتووە[٤].

ئەم مەوقیعەی ئێستای عێراق وایکرد، دوای نەمانی دەسەڵاتی خەلیفە راشدینییەکانو پوکانەوەی دەسەڵاتی ئەمەوییەکان، عەباسیەکان (بەغدا) بکەنە مەڵبەندی دەسەڵاتەکەیان، بەڵام عەباسییەکان عێراقیان نەکردە دەوڵەتێکی خاوەن سنور، بەڵکو عێراقی ئێستا بەشێکی بچوکی ئەو دەوڵەتە پانوپۆڕەبوو کەلە سەرووی ئەفەریقاوە تا هندستان دەکشا.

کەمەغۆلەکان بەسەرکردایەتی هۆلاکۆ لەساڵی (١٢٥٨ز)دا بەغدای پێتەختی عەباسییەکانیان گرت بەشی هەرەزۆری سەرزەمینەکانی عێراقی ئێستایان کردە ولایەتێك لەولایەتەکانی ئیمپراتۆریەتی ئێلخانی، بەڵام لەساڵی (١٣٣٧م)داو پاش ململانێی ناوخۆی ئێلخانیەکان بەغداو عێراقی ئێستاو نیمچە دورگەی عەرەبو ئازەربایجان کەوتنە ژێردەستی جەلائیرییە بەبنەچە مەغۆلییەکان، سەرۆکی جەلائیرییەکان شێخ حەسەن کوڕی حسێن کوڕی ئامتوغانی جەلائیری جیابوونەوەی خۆی لەئێلخانییەکان راگەیاند، لەساڵی (١٣٨٣ز)دا بەغدا کەوتە ژێر دەستی تەیمورلەنگو تاساڵی (١٥٠٨ز) کەشائیسماعیلی سەفەوی بەغدای لە دەستی مەغۆلەکان سەندەوە، عێراقی ئێستا هەر لەژێر دەستی مەغۆلەکاندا بوو[٥].

لەسەدەی شازدە بەدواوە، سەرزەمینەکانی عێراقی ئێستا بووە مەیدانی ململانێی توندی نێوان هەردوو ئیمپراتۆریەتی سەفەوی‌و عوسمانی.

ئیمپراتۆریەتی عوسمانی کە تادەمە دەمی جەنگی جیهانی یەکەم بەشی هەرەزۆری گەلی عەرەب‌و بەشی هەرەزۆری گەلی کوردی لەژێر دەسەلاتدابوو، کوردستانی بەسەرچەند ولایەتێکدا دابەشکردبوو، لەوانە ولایەتی شارەزوور کەپاشان خرایە سەر ولایەتی موسڵ، هەروەکو گەلی عەرەبیشی بەسەر ولایەتەکانی سوریاو بەغداو بەسرەو حیجازو بەیروت‌و میسری خدێوی‌و هی تردا دابەشکردبوو، بۆیە ئەوکاتەش‌و تادوای جەنگی جیهانی یەکەمیش، عێراقی ئێستا نەك هەر تەعبیر نەبووە لەقەوارەیەکی سەربەخۆی خاوەن پێناس، بەڵکو سەرزەمینەکانی ئێستای عێراق وەکو باقی رەعیەتەکانی تری دەوڵەتی عوسمانی تەخشان‌و پەخشانی چەند ولایەتێك کرابوون‌و تەنانەت ناوی عێراقیش لەئارادا نەبووەو بەشێکی ئەم خاکەی ئێستای عێراق هەر بەناوی میسۆپۆتامیا یا وڵاتی نێوان دوو رووبار، ناسرابوو[٦]

بۆیە عێراق وەکو دەوڵەت، یاسنورێکی جوگرافیایی دەست نیشانکراوو قەوارەیەکی یەککگرتوو، پێش بیستەکانی ئەم سەدەیە نەبووەو دەرنەکەوتوو.

## دووەم: تانۆپۆکانی دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق

لەمیانەی جەنگی جیهانی یەکەمدا پاش ئەوەی عوسمانییەکان پاڵیان دایە پاڵ ئەڵمانیا، تادەهات قەوارەکەیان بەرەو داوەشین دەچوو. دەوڵەتە ئیمپریالیستە گەورەکان؛ بەریتانیاو فەرەنسەو رووسیای تزاری لەسەر دابەشکردنی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی چەند رێکەوتنێکی نهێنی‌یان بەستبوو.. سەرەتا لەنیسانی ساڵی ١٩١٦ز دا پەیمانێکی نهێنی بەناوی پەیمانی (سۆزانۆف- بالیولۆچ) لەنێوان روسیای تزاری‌و فەرەنسەدا بەسترا، پاشانیش لەئاگاداری هەمان ساڵدا پەیمانێکی تر لەنێوان بەریتانیاو فەرەنسەو بەئاگاداری رووسیا، بەناوی پەیمانی (سایکس- پیکۆ) بەسترا کەبەپێی پەیمانی دواییان بەشی هەریەك لەو دەوڵەتانە لەمیراتییەکانی دەوڵەتی عوسمانی دەست نیشانکرا[٧]

جەنگی جیهانی یەکەم بەتێشکانی دەوڵەتانی میحوەر کۆتایی هات‌و ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لەبەریەك هەڵوەشا.. بەپێی رێکەوتنی ئاگر بەست

دەوڵەتانی سوێندخۆر بۆیان هەبوو هەر ناوچەیەك كەمەترسی دەخاتە سەر بەرژەوەندییەكانیان، داگیری بكەن. هەر لەسەر ئەو بنچینەیە دەوڵەتە ئیمپریالیستەكان و لەپێش هەمووشیانەوە بەریتانیاو فەرەنسە لەخۆرهەڵاتی ناوەڕاست بۆ بەشینەوەی میراتییەكانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، دەستكراوەبوون. بەریتانیا بەپێی رێكەوتنە نهێنیەكەی خۆی لەگەڵ فەرەنسەدا ولایەتەكانی بەغداو بەسرەی بەردەكەوت و پاشانیش بەپێی رێكەوتنە بەناوبانگەكەی (لوید جۆرج و كیلمانصۆ)، بەریتانیا ژیرانە لەگەمەیەكی دیبلۆماسیدا ولایەتی موسڵیشی خستە ناو سنوری منداتەكەی خۆیەوە[٨]

جەنگی جیهانی یەكەم تەواوببوو، بەڵام هێشتا كوردستانی باشور كەولایەتی موسڵ بەشی هەرەزۆری خاكەكەی دەگرتەوە، لەدەرەوەی چوارچێوەی داگیركردنی سوپای بەریتانیادا بوو. ئەمە لەكاتێكدا هەر لەسەرەتای جەنگداو لە٥/١١/١٩١٤دا سوپای بەریتانی شاری بەسرەی گرتبوو، پاش ساڵێك و لە ٣/٦/١٩١٥دا عەمارەو لە٢٥ی تەمموزی هەمان ساڵدا ناسریەشی گرت. دواجار لە ١١/٣/١٩١٧دا بەغدای گرت و لەشكری عوسمانی تاشاری موسڵ پاشەكشەی كرد[٩]

بەتەواوبوونی جەنگ هێزە سوپاییەكانی ئیستعماری بەریتانی گەیشتبوونە سنورەكانی كوردستانی باشورو ناوچەی شرگاتی نزیك موسڵ. بەریتانیا بۆ ئەوەی بتوانێ بەرەنگاری پاشماوەكانی سوپای عوسمانی ببێتەوەو بەرژەوەندییەكانی لە ناوچەی ستراتیژی كوردستانی باشوردا بپارێزێت و مسۆگەر بكات، سەرەتا ناچاربوو دان بەحاكمییەتی (شێخ مەحمود)دا بنێت كەپێشتر عوسمانییەكان بەحاكمی سلێمانییان دانابوو.

بەریتانیا لەسۆنگەی بەرژەوەندییە ستراتیژی و ئابوورییەكانیەوە دەمێك بوو لێك بەلا لمۆزیدا دەچۆڕا بۆ گرتنی ولایەتی موسڵ. كاتێكیش كەعوسمانییەكان لە ساڵی ١٩١٩ز دا بەیەكجاری ولایەتەكەیان چۆڵ كرد، بەریتانیا بێ سێ و دوو داگیری كرد.

بەپێی پەیمانی (سان ریمۆ)و پاش ئەوەی كە جەنگ پرۆزەی لەدەوڵەتە ئیمپریالیستەكان بڕیبوو، ئەو دەوڵەتانە بەمەبەستی سوك كردن و ئاسانكردنی داگیركردن و بەپاشكۆكردنی ناوچەكانی ژێر دەستیان و خەفەكردنی هەستی ناسیونالیستی عەرەبی بڕیاراندا چەند دەوڵەتێكی عەرەبی وەكو عێراق و

سوریاو ئوردون‌و لوبنان‌و سعودیەو.. هتد. دابمەزرێنن. پێشتر بەریتانیا بەپێی رێکەوتننامەی (مەکماهۆن- حسێن) پەیمانی دابوو بەعەرەبەکانی دەوڵەتێکی عەرەبی دابمەزرێنن کەسوریای سروشتی‌و عێراقی عەرەبی (بۆ کوردستانی باشور)و حیجاز، بەسەرکردایەتی (حسێن شەریفی مەکە) بگرێتەوەو نەخشەی دەوڵەتە چاوەڕوانکراوەکەش کوردستانی باشوری نەدەگرتەوە[١٠] لەهەمان کاتدا بەریتانیا بەرێکەوتن لەگەڵ دەوڵەتە سوێندخۆرەکان لە ١٩٢٠/٨/١٠داو لەچوارچێوەی پەیمانی (سیڤەر)دا، مافەکانی کوردو ئەرمەنیان سەلماندو پەیمانی ئەوەیاندا کەئەگەر لەماوەی ساڵێکدا کوردەکان نیازی جیابوونەوەو دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆیان هەبێت، دەبێت تورکیا بۆقەیدو شەرت بەوداوایە قایل بێت[١١]

هەڵایسانی ڕاپەڕینی بیست لەناوچەی جیاجیاکانی ئێستای عێراقدا دژی بەریتانیاو ئەو زیانانەی لەئەنجامی ئەو شۆڕشەدا بەر بەریتانیا کەوتن‌و ئەو ئەرکە دژوارانەی کەپاش تەواوبوونی جەنگ ڕووبەڕووی سەرجەم دەوڵەتە ئیمپریالیستە ماندووەکان‌و لەپێش هەمووشیانەوە بەریتانیا ببۆوە، هەموو ئەوانە وایانکرد لەچۆنێتی ئیستعمارکردنی عێراق‌و کوردستانی باشوردا، بەریتانیا چاو بەنەخشەکانی خۆیدا بگێڕێتەوەو پەلە لەپێکهێنانی قەوارەیەکی سیاسی بۆ ولایەتە جیاجیاکانی سەرخاکی عێراقی ئێستا بکاتەوە.

دوای ئەو ڕاپەڕینە، بەریتانیا ڕاستەوخۆ بڕیاری لەکارخستنی حاکمی پادشایەتی بەریتانی (ئارنۆڵد ویلسن)و دانانی (پێرسی کۆکس)ی لەشوێنی ئەودا. پاشان لە ١٩٢٠/٦/١٧دا حکومەتی خاوەن شکۆی بەریتانی لەبەیاننامەیەکیدا بڕیاری دامەزرانی حکومەتێکی عەرەبی دەرکرد بەناوی حکومەتی عێراقەوەو داوا لەپێرسی کۆکس کرا ئەرکی جێبەجێکردنی ئەو بڕیارە لەئەستۆ بگرێ.

بەشێوەیەکی ڕەسمیش لە ١٩٢١/٧/٢١دا بەپێی بڕیارەکانی (کۆنگرەی قاهیرە) (فەیسەڵ) بەیەکەمین شای عێراق دانرا[١٢]

## *لکاندنی زۆرەملێیانەی کوردستانی باشور بەعێراقەوە

سیاسەتەکانی بەریتانیا وەکو سیاسەتەکانی دوای هەرجەنگێک، ئاشکراو ڕوون نەبوو.. بەریتانیا سەبارەت بەئیستعمارکردنی کوردستانی باشور

شێوازێکی دیاریکراوی نەبوو، تائەوەدەمەش کە دەوڵەتی عێراق دامەزرا، کوردستانی باشور هەر لەدەرەوەی چوارچێوەی ئەو دەوڵەتە تازەپێکهێنراوەدا مایەوە.

لەمایسی ساڵی ١٩٢١داو لەژێر چاودێری (چەرچڵ)ی وەزیری موستەعمەراتی بەریتانیادا، (کۆنگرەی قاهیرە) بەسترا. دەربارەی عێراق چوار باسی سەرەکی کرانە تەوەر، ئەوانش:-

١/کەمکردنەوەی خەرجی بەریتانیای گەورە لەعێراق.
٢/باسی ئەو کەسانەی خۆیان بۆ تەختی پاشایەتی عێراق پاڵاوتبوو.
٣/مەسەلەی کورد.
٤/لەشکری داهاتووی عێراق[١٣]

سەبارەت بەکوردستانی باشور کۆنگرە دوو ئەلتەرناتیڤی خستەڕوو، کە بریتی بوون لە:-

١/ناوچە کوردییەکان بەشێك بن لەعێراق.
٢/هان بدرێن بۆ سەربەخۆیی.

بەڵام تای تەرازوو بەلای یەکەمیاندا لاربوو[١٤]

بۆ ئیستعمارکردنی کوردستانی باشور لەلایەن بەریتانیاوە، کۆنگرە دوو رای هەبوو، رای یەکەم کەڕای ئیدارەی بەریتانی بوو لەبەغدا، مەبەستی بوو کوردستانی باشور بەدەوڵەتە عەرەبییەکەی بەغداوە بلکێنێ، ئەوەش بەبیانووی پێویستی بوونی ناوچەیەکی شاخاوی سەوزو هێڵێکی بەرگری لەباکورو بەردەوام بوونی پێوەندییە بازرگانیو ئابورییەکانی نێوان کوردستانو عێراقو پاشان نەبوونی کەسێکی باوەڕپێکراوی سەر بەئینگلیز کەئیدارەی کوردستانی پێبسپێردرێ دواجاریش بۆ ئەوەی بڕی تێچوونی ئیستعمارکردنی کوردستان لەسەر شانی خۆی لابباتو بەحکومەتە بەکرێگیراوەکەی بەغدای بسپێرێت.

رای دووەمیش رای ونستۆن چەرچڵ خۆی بوو کەبیری لەرێگەی مسۆگەر کراوی ئیستعمارکردنی کوردستانی باشور دەکردەوە بەشێوەیەك کە بەرژەوەندییە نەوتی ئابوریو سیاسیو ستراتیژییەکانی بەریتانیا مسۆگەر بکاتو خەرجی بەریتانیا کەکار لەبودجەی کردبوو راست بکاتەوەو تورکیای کەمالیش لەسۆڤێتی تازەپێکهاتوو دووربخاتەوەو پاشان دەستەمۆی بکاتو

دواجار لەدوژمنایەتی کردنی عەرەبی بەدوور بگرێت. هەرئەم بیرکردنەوەیەی چەرچڵیش بوو کەوایکرد سات و سەودا لەگەڵ تورکیا بکرێ بەمەبەستی دروست نەکردنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردی بەو مەرجەی تورکیا دەست لەولایەتی موسڵ هەڵگرێت و دواجار بەعێراقەوە بلکێنرێت[١٥]

کورد ئەگەرچی کەم تازۆر لەپیلانی ئیمپریالیستیانەی بەریتانیا بێخەبەر بوو، بەڵام رازی نەبوو مل بدات بۆ باری ژێردەستەی ئینگلیزو ئیستعمارکردنی وڵاتەکەی. ئەنجامی ریفراندۆمەکەی کوردستانی باشور بۆ هەڵبژاردنی مەلیك فەیسەڵ، خۆی لەخۆیدا رەتکردنەوەی بێچەندو چۆنی سیاسەتەکانی بەریتانیابوو لەکوردستاندا.. لەو ریفراندۆمەدا بەشی هەرە زۆری لیوای کەرکوك کە ئەودەمە بەشێکی گەورەی لیوای هەولێریشی لەسەربوو، دژی مەلیك فەیسەڵ دەنگیان دا، لیوای موسڵیش ئەوەیان کردە مەرجی قایل بوون کەمافی کەمایەتییەکان بۆ دامەزراندنی ئەو ئیدارەیەی کەدەبوا لەناوچەکانی ولایەتی موسڵدا پێك بهێنرێت، مسۆگەر بکرێت، ئەمە لەکاتێکدا لیوای سلێمانی هەر لەبنەڕەتەوە بەشداری دەنگ دانیان نەکرد[١٦]

بەرگریکردنی کورد دژ بە ئینگلیز تادەهات لەپەرەسەندندا بوو.. بەریتانیا توانای ئەوەی نەمابوو بەهێزی گەورە پەلاماری کوردبدات، بۆیە لەتاکتیکێکی ژیرانەداو بۆ کپکردنی دەنگی ناڕەزایەتی کوردو خوڵقانی کەشوهەوایەکی هێمن بۆ مەیسەر بوونی پیلانەکانی لەکوردستانی باشوردا، لەساڵی ١٩٢٢دا بڕیاری هێنانەوەی (شێخ مەحمود)ی لەهندستانەوە بۆ کوردستان دا. شێخ مەحمود کەلە ساڵی ١٩١٨دا بۆ ماوەی (١٥٥) رۆژ حوکمدارێتی بەشێکی کوردستانی باشوری دەکرد، پاش هێرشی سوپایی بەریتانی بۆ گرتنی شاری سلێمانیو بەرگریکردن کورد لەوشارە، لەشەڕی دەربەندی بازیاندا بەبریندار یەخسیر کراو بۆ هندستان نەفی کرا.

دامەزراندنەوەی حکومەتی کوردستان لە ١٩٢٢/٩/٣٠دا بۆ جاری دووەم بەپلەی یەکەم بۆ بەرقەرابوونی هێمنو ئاسایش بوو لەناوچە کوردنشینەکانو نەهێشتنی دەسەڵاتی تورکەکان بوو لەکوردستانی باشوردا بۆ ئەوەی گەر بڕیاری ریفراندۆمێکی گشتی سەبارەت بەچارەنووسی ولایەتی موسڵ درا، بەریتانیا دەنگی کورد بەلای خۆیدا مسۆگەر بکات بۆیە بۆ پشتگیری کردنو

جێگیربوونی حکومەتی کوردستان، هەردوو حکومەتی عێراقیو بەریتانی لەبەیاننامەیەکدا بەشێوەیەکی ڕەسمی دانیان بەحکومەتەکەی شێخ مەحمودا، نا[17]

بەڵام ئەوەی نکوڵی لێناکرێت ئەوەیە کەئیدارەی ئیستعماری بەریتانی هەر لەسەرەتاوەو بەتایبەتیش لەسەردەستی (ئارنۆڵد ویلسن)، کاری بۆ پێکەوەنانی ئیدارەیەکی عەرەبی کردووە لەعێراقدا کەجگە لەهەردوو ولایەتی بەسرەو بەغدا، ولایەتی موسڵیش بگرێتەوەو ڕاستەوخۆ لەژێر سەرپەرشتی بەریتانیا خۆیدا بێت، ئەمە سەرەڕای ئەو هەموو گفتو بەڵێنانەی کەبەپێی کۆنگرەی ئاشتی لە پاریسو پەیماننامەی سیڤەر سەبارەت بەمافی کوردان، قسەی لێکرابوو.

"ئەدمۆندس، کەئەفسەری پێوەندی بوو لەو کۆمیتەیەدا کە کۆمەڵی نەتەوەکان بۆ لێکۆڵینەوە لەکێشەی موسڵ لەساڵی ١٩٢٥دا پێکیان هێنابوو، دەڵێت: هیچ کامێکمان گومان داینەگرتین کەئێمە ئێستا لەشەڕی مانو نەمان داین بەنسبەت عێراقەوە، چونکە بەدڵنیاییەوە، لەبەر هەندێ هۆی ئابوریو ستراتیژی، بەسرەو بەغدا ناتوانن بێ موسڵ دەوڵەتێکی ماقوڵ پێك بێنن[18]."

ڕووپێوی عێراق بێ لەکوردستان دەوروبەری (٣٥٠,٠٠٠ کچگ)یە، لەو ڕووپێوە (١٦٨,٥٥٢ کچگ) کەنزیکەی نیوەی خاکەکەی دەکات، بیابانەو هیچ سەرچاوەیەکی ژیانی نییە[19] ئەوەشی کەدەمێنێتەوە ڕووپێوێکی تێکەڵە لەخاکە گردۆڵکەییو دەشتە لیتەییەکان کەجگە لەڕەشە خاکەکانی کەناری هەردوو ڕوباری دیجلەو فورات نەبێ، ئیتر لەبەشێکی گەورەیدا، ڕووبەرە ئاوییەکانی زەلکاو و عەماراوەکان دایدەپۆشن بۆیە عێراق لەبژێوی خۆیدا پشتی تەواو بەکوردستان دەبەستێت.

لەو سۆنگەیەی کەنەدەکرا بەریتانیا واز لەبەرژەوەندییە ئابوریو ستراتیژییەکانی خۆی لەو بەشە گرنگەی عێراقی ئێستا، واتە کوردستانی باشور بهێنێت، بۆیە سەرەڕای هەموو ئەو سیاسەتە فریودەرانەیەی بەرامبەر کوردستانو گەلەکەی نواندی، لەساڵی ١٩٢٣دا سیاسەتەکانی خۆی ئاشکراتر کردو بەپێی ئەو ڕێکەوتنەی لەگەڵ تورکیای کەمالیستدا لەمیانەی

پەیماننامەی (لۆزان)دا ئەنجامی‌دا، بەرامبەر بەڕازی بوونی تورکیا بۆ سپاردنی کێشەی موسڵ بەکۆمەڵەی گەلان، بەریتانیاش هەموو بەندەکانی پەیماننامەی (سیڤەر)ی تایبەت بەکوردو کوردستان رەت کردەوە ئینکاری لێکردن.

ئیتر ئەو کاتەش کەئیستعماری بەریتانی رازی بوونی تورکیای کەمالیستی سەبارەت بەسپاردنی کێشەی موسڵی بەکۆمەڵەی گەلان‌و رەوینەوەی مەترسی تورکیاشی لەسەر بەرژەوەندییەکانی لەعێراق‌و کوردستاندا بەشێوەیەکی عەمەلی مسۆگەر کردو لەهەمان کاتیشدا مسۆگەری بەکرێگیراوی‌و گوێ رایەڵی مەلیك فەیسەڵ‌و حکومەتە عەرەبییەکەی بەغداو ئامادەبوونیان بۆ پاسەوانی کردنی بەرژەوەندییە نەوتی‌و ستراتیژییەکانی بەریتانیا کردوو، گومانیشی لەوەدا نەما کە کوردستانی باشوری (سەربەخۆ) بەکەڵکی پاسەوانی‌و پاراستنی ئەو بەرژەوەندییانە نایەت، ئەمە جگە لەوەی کەبوونی کوردستانی سەربەخۆ کەمالیستەکان‌و رەزاخانی ئەڵقە لەگوێی بەریتانیا لەوڵاتی فارسدا نیگەران دەکات ناسیونالیستە دەمارگیرەکانی عەرەب بێزاردەکات پاش ئەوەش کەبەریتانیا دڵنیابوو لەوەی کە "دەوڵەتی سەربەخۆی کوردی" کرێگرتەی بەریتانیا ناکات‌و پاش ئەو سات‌و سەودا نێودەوڵەتییەی سەبارەت بەڕەتکردنەوەی پەیمانی سیڤەرو گۆڕینی بەپەیمانی لۆزان کرا، ئیتر ئەو دەمە بۆ دواجار بەریتانیا پشتی کردە بڕیاردان‌و سەلماندنی مافەکانی گەلی کورد[٢٠]

دوابەدوای پەیمانی لۆزان‌و رام کردنی کەمالیستەکان، لەساڵی ١٩٢٤دا هەردوو حکومەتی بەریتانیاو عێراق لەدان پیانانەکەیان بۆ حکومەتی کوردستان پاشگەزبوونەوەو بۆ رووخان‌و لەبەین بردنی هێزی سوپای بەریتانیا هەڵیکوتایەسەر کوردستان‌و بەهێزی چەك‌و سەرەنێزەی سوپای بەریتانی‌و بەزۆرەملێ دوور لەخواستی خەڵکی کورد لەکوردستاندا، کوردستانی باشور هێدی هێدی لکێنرا بەعێراقی دەوڵەتە عەرەبییە داتاشراوو دەستنێژەکەی ئینگلیزەوەو هەر بەفیتی بەریتانیا لەڕۆژی ١٩٢٥/١٢/١٦دا کۆمەڵەی گەلان بەرەسمی ولایەتی موسڵ -کەبەشی هەرەگەورەی کوردستانی باشوری دەگرتەوە- بەعێراقەوە لکاندو لەو رۆژگارەشەوە دەوڵەتی ئێستای عێراق بەم قەوارەیەی ئێستایەوە پەیدابوو[٢١] لێرەوە دەگەینە ئەم ئەنجامانەی خوارەوە:-

١/دەوڵەتی عێراق، بەم قەوارەیەی ئێستایەوە دەوڵەتێکی تازەیەو تەمەنی هەشتا ساڵی تێنەپەڕاندووە.عێراق نەلە کۆنداو تەنانەت لەسەردەمی فەرمانڕەوایەتی عوسمانییەکانیشدا وەکو ولایەتێکی یەکگرتوو بەم قەوارەیەی ئێستایەوە بوونی نەبووە. عێراق وەکو دەوڵەت دەستکردی ئیمپریالیزمی بەریتانییەو لەدیدی بەرژەوەندییە ئابوریو ستراتیژییەکانی بەریتانیاو بەتایبەتیش بەهۆی بوونی سەرچاوە دەوڵەمەندەکانی نەوت لەکوردستانی باشوردا پێکهات.

٢/پێش دامەزراندنی دەوڵەتو حکومەتی عەرەبی عێراق، کورد لەم پارچەیەی کوردستاندا سەرەتا وەکو دوو ولایەتو پاشان وەکو ولایەتێك شان بەشانی هەموو ولایەتەکانی دەوڵەتی عوسمانیو لەوانەش ولایەتەکانی بەغداو بەسرە هەبووە پێش ئەوەی عێراق ببێتە حکومەت، کوردستانی باشور لە ١٩١٨دا حکومەت بووە، بەوپێیە کوردستان سێ ساڵ پێش دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق، بۆخۆی قەوارەیەکی سیاسی بووە ئەگەرچی سەربەخۆش نەبووە.

٣-کوردستانی باشور لەمیانەی بەرژەوەندییەکانی وڵاتە ئیمپریالیستەکانی جیهانو بەتایبەتیش ئیمپریالیزمی بەریتانیدا کرایە قوربانیو وەکو قەوارەیەکی لەبیرکراو حسابی بۆکرا. ئەگینا بەپێی هەموو رێکەوتنو پەیماننامەکانی دوای جەنگ دەبوا کوردستانیش وەکو قەوارەیەکی جیاو نەتەوەی کوردیش وەکو سەرجەم نەتەوە سەردەستەکانی ئێستای حسابی بۆبکرایە. راپەڕینە چەکداریو شەڕەکانی بەرگریکردنو لەکوردستانو ئینجا دەنگدانی کورد دژ بەمەلیك فەیسەڵ، هەموو ئەوانە خواستی کورد بۆ سەربەخۆییو رەتکردنەوەی داگیرکاری دەردەخەن.

٤-کوردستانی باشور بەزەبری چەكو هێزی سوپا داگیرکراوە. سوپای ئیمپریالیزمی بەریتانی بەزۆری زۆردارەکیو دوور لەخواستی گەلی کورد خۆی کوردستانی باشوری بەعێراقەوە لکاندووە. دەوڵەتی عێراق هەر لەسەرەتاوە وەکو دەوڵەتێکی عەرەبی هاتۆتە کایەوەو بەهیچ شێوەیەك خواستەکانی گەلی کوردی لەسەربەخۆییو ژیانی ئاسایی وەکو گەلانی ناوچەکەو جیهان فەراهەم نەکردووە.

## (٣-٢-٢) واقیعی بەکۆلۆنیکردنی کوردستانی باشور

### یەکەم / سەرهەڵدانی مێژوویی کۆلۆنیالیزم

زاراوەی کۆلۆنیال[٢٢] لەبنەڕەتدا لەوشەی (Colonus)ی لاتینی کەمانای چاندنی زەوی دەگرێتەوە، وەرگیراوە.

گریکە کۆنەکان هەر لەسەدەی هەشتەمی پێش زایینەوەو بەمەبەستی ئابوریو سیاسی جیاجیا، لەدەرەوەی سنوری دەوڵەتەکەیانو لەسەر خاکی وڵاتانی تر، دەستیان کرد بە مرومۆڵگە دروستکردنو نیشتەجێکردنی هاوڵاتیانی خۆیان لەو ناوچانەدا. لەمەدا رۆمانەکانیش چاویان لەگریکەکان کردو هەمان کاریان ئەنجامداو ئەو وڵاتە نوێیانەی دەرەوەی نیشتمان بە چەند پێوەندییەکی جۆراوجۆر بەنیشتمانی دایکەوە گرێدرانو ناویان لێنرا کۆلۆنی.

کۆلۆنییەکان دەوڵەتێکی نوێی جیاوازبوون، کەجگە لەیەکێتی باوەڕو هێندێك جاریش رایەڵەیەکی هاوسۆزی، ئیتر هیچ شتێکی تر بە وڵاتە ئەسڵییەکانیانەوە نەیدەبەستنەوە. هەربەوپێیە کۆلۆنییەکان بەشێکی جیاوازبوون لەگەڵ بنەڕەتیەکەو بەمەبەستی دامەزراندنی ژیانێکی نوێ بۆ کۆچبەرەکان لەخاکی وڵاتانی تردا چێنرابوون.

زۆروستەمی رژێمی دەرەبەگایەتی لەئەوروپای سەدەکانی ناوەڕاستدا مۆتیڤی کۆچو رەوێکی گەورە بوو بەتایبەتیش بۆ خەڵکی چەوساوەو کۆیلەکانی زەوی بەڵام هێشتاش ئەم کۆچو رەوو هەوڵدانانە بۆ نیشتەجێبوون لەدەرەوەی وڵاتی خۆدا، گیروگرفتی سیاسی دروست نەدەکرد، چونکە:-

١-ئەم کۆچکردنانە بەپلانی فەرمانڕەوایانو پلانی عەسکەری روویان نەدەدا.

٢-کۆچبەران بەئاسانی تێکەڵاوی خەڵکی ئەو ناوچانە دەبوون کە کۆچیان بۆ دەکردنو لەناویاندا دەتوانەوە.

٣-بەژمارەی کەمو دەستەی بچوكو دیاریکراو کۆچیان دەکرد.

٤-ئـەم كـۆچ و رەوانـە لەبەشـێكی زۆریـداو بەتایبـەتیش لەسـەردەمی دەرەبەگایەتیدا، بەمەبەستی خۆڕزگاركردن بوو لەدەست زۆرو ستەم لـەوڵاتانی خۆدا.

٥-ئەم كۆچ و رەوانە زۆرتر روویان دەكردە ئەو شوێنانەی چۆڵ بوون و پێشتر یـان خـەڵكی تێدا نیشـتەجێ نـەبوون، یـان دانیشـتوانیان كـەم بـوون. بـۆ نیشتەجێبوون كۆچبەران كەسیان لەشوێنەكانیان هەڵ نەدەكەند[٢٣]

سەدەی شانزە رێنیسانسی ئەورووپی پرشنگی دا.. رێنیسانس كە شۆڕشێكی تەكنیكی بەشوێن خۆیدا هێنا، سـەرەتای كاری فراوانخوازانـەی ئەوروپییـەكان بوو بەهێزی چەك و سەرباز بۆدەرەوەی سنورەكانی ئەورووپا.

هەڵپـەی دەوڵـەتە گـەورەكان بۆ دۆزینـەوەی بازاڕو بـەتاڵان بردنـی كەرەسـتەی خاوو هەوڵدان بۆ داگیركردنی عەسكەرییانەی وڵاتـانی تـر، تـا دەهـات لـەبرەودا بـوو. پورتوگـاڵ و ئێرلەندەییـەكان لـەڕێی دەسـت بەسـەراگرتنی هیندسـتان و دورگەكانی سۆندەوە، بازرگانییان بۆ خۆیـان كۆنترۆڵ كـرد. ئیسـپانییەكانیش ئەمریكایان داگیركرد. ئـەمریكا وای لێهات چەندین كۆڵۆنـی بـەناوی جیاجیای وەكو فەرەنسەی نوێ كە كەنەدای دەگرتەوە، ئینگلتەرەی نوێ كـە ولایەتـەكانی باكورو خۆرهەڵاتی دەگرتەوە، ئیسپانیای نـوێ كەمەكسیك و، كاستیلیای نـوێ كەپیرۆی دەگرتەوە، دامەزران. ململانێی كۆڵۆنیالیستە ئەورووپییـەكان تادەهـات گەورەتر دەبوو. سەدەی هـەژدە سـەدەی یەكلاییكردنـەوەی بەشێكی زۆری ئـەو ململانێ و ناكۆكییانـە بـوو. ئەگـەرچی ئینگلتـەرە هـەموو كۆڵۆنییـەكانی خـۆی لەئـەمریكادا لەدەسـت دا، بـەڵام بـووە گـەورەترین كۆڵۆنیالیسـتی جیـهان. فەرەنسەش پاش شەڕە یـەك لەدوایەكـەكانی ناپلیۆن، زۆربـەی كۆڵۆنییـەكانی تەخشـان و پەخشـان بوون و هـەردوو ئیمپراتۆریـەتی كۆڵۆنیالیسـتی هۆڵـەندەو ئیسپانیا زەبـری گـەورەیان بەركـەوت و هـەموو ئـەوەی ئیسـپانیا لەئـەمریكادا هەیبوو، لەدەستیدا.

هەرلەمیانـەی گـەرمبوونی ململانـێ و شـەڕی نێـوان هـێزە كۆڵۆنیالیسـتەكاندا ماناو چەمكی كۆڵۆنیش گۆڕانی گەورەی بەسەردا هات. ئیتر كۆڵۆنی ئـەو مانـا كۆنەی خۆی ون كرد كە بەوڵاتی كۆچبەرە هەڵاتووەكان بناسرێت.

تەنانەت خودی وڵاتەکانی ئەمریکاو کەنەداو ئەمریکای لاتین‌و ئوستralیاش کە کۆچەرییەکان ئاوەدانیان کردبوونەوە، پێناسە کۆنەکەی کۆلۆنی نەیدەگرتنەوە.

پیشکەوتنی تەکنیکی‌و پیشەسازی تادەهات سیستمە کۆلۆنیالیستەکانی هارترو دڕتر دەکرد، بەجۆرێك کەئیتر لەکۆتایی سەدەی نۆزدەو سەرەتاکانی سەدەی بیستداو پاش ڕوودانی چەندین شەڕی گەورەو خوێناوی نێوان دەوڵەتانی کۆلۆنیالیست، جیهان یەکپارچە کەوتە ژێر چەپۆکی چەند دەوڵەتێکی کۆلۆنیالیستی گەورەوە. بەمەبەستی دووبارە دابەشکردنەوەی کۆلۆنییەکان، جەنگی جیهانی یەکەم بەرپاکرا.

لەهەمان سۆنگەوە چەمکی کۆلۆنیالیزمیش لەچوارچێوە کلاسیکییەکەیدا نەمایەوە. کۆلۆنیالیزم لەچەرخی نوێدا یاخود لەقۆناغی سەرمایەداریدا، لەبنەڕەتەوە گۆڕاو چەمکی ئیمپریالزمی بەسەردابڕا.

ئەگەرچی دەرکەوتن‌و سەرهەڵدانی کۆلۆنیالیزم زۆر پێش ئیمپرایالیزمەو بەڕیشە لەوکۆنترەو تەنانەت هی سەردەمی پێش سەرمایەداریشە، بەڵام هەردووکیان یەك سروشتیان هەیەو ناکرێت لەیەکدی جیابکرێنەوە.

بەشێوەیەکی گشتی کۆلۆنیالیزم پرۆسێسێکی داگیرکارانەی دەست بەسەراگرتنی زەوی‌و زارە بەزەبری هێزو دوور لەخواستی دانیشتوانی وڵاتە داگیرکراوەکە، بەمەبەستی نیشتەجێبوون‌و نیشتەجێکردن‌و ڕەنیوهێنانی‌و بەتاڵان بردنی ئابوری‌و هێزە مرۆییەکەی.

کۆلۆنیالیزم لەپرۆسێسی کۆلۆنیکردنی گەلاندا پشت بەسێ بنەما دەبەستێت، ئەوانیش:-

١-تیۆری داگیرکارێتی: ئەویش لەڕێی بڵاوکردنەوەی بیری چەواشەکەرانەی وەکو بەشارستانیکردنی گەلان‌و بڵاوکردنەوەی ئایین‌و ڕۆشنبیری‌و ئەدەب‌و هەوڵدان بۆ پێشخستنی گەلانی دواکەوتوو.

٢-میلیتارێتی: ئەویش لەڕێی مل کەچ پێکردنی گەلان بەهەموو شێوەکانی کوشتوبڕ، ڕاوەدوونان‌و هەڵکەندن‌و نیشتەجێکردنی زۆرەملێیانەو سڕینەوەی سیمای نەتەوەیی‌و شارستانی‌و ڕۆشنبیری گەلی ژێردەست.

٣-پاشان بەپاشکۆکردنی وڵاتان لەڕووی ئابورییەوەو بەستنەوەیان بەبازاڕی دەوڵەتانی کۆلۆنیالیستەوە[٢٤]

## دووەم/ رەفتارە کۆلۆنالیستەکانی دەوڵەتی عێراق لەکوردستانی باشوردا.

هەموو رژێمە کۆلۆنیالیستەکانی جیهان لەدوو خەسڵەتی هاوبەشدا یەکدەگرنەوە، ئەوانیش، یەکەمیان لێدانی فاکتەری مرۆییە واتە دانیشتوان، دووەمیشیان بەتالان بردنی ئابورییە.
بۆ ئەوەی لەسیمای کۆلۆنیالیستانەی دەوڵەتی عێراق لەکوردستانی باشوردا تێبگەین، رەفتارەکانی ئەو دەوڵەتە لەو دوو رووەوە تاووتوێ دەکەین.

### یەك- لەڕووی دانیشتوانەوە

لەدەرەوەی سیاسەتی قڕکردندا، لێدانی فاکتەرە مرۆییەکان راگواستن دەگەیەنێت. راگوستن سێ شێوەی سەرەکی هەیە کەئەمانەن:-
١-بەزۆر کۆچ پێکردن و بەزۆر نیشتەجێکردن لەئۆردوگای زۆرە ملێدا ئەوەش هەروەکو نازییەکان لەولاتانی داگیرکراوداو، ئەمریکییەکانیش لە ڤێتنامدا جێبەجێیان دەکرد.
٢-بەزۆر کۆچ پێکردن لەولاتانی داگیرکراوەوە بۆ ناو سنوری ولاتانی سەردەست و کۆلۆنیالیست. ئەمەش هەروەکو هێندێك لەکۆلۆنیالیستە ئەوروپییەکان لەئەفریقادا بۆ بەکۆیلەکردنی دانیشتوانەکەی دەیانکرد.
٣-کۆچ پێکردن بۆ دەرەوەی سنوری ولاتانی داگیرکراو لەهەمان کاتیشدا بۆ دەرەوەی سنوری ولاتانی کۆلۆنیالیست و سەردەستە. ئەمەش بەو شێوەیەی کە ئیسرائیل دژ بە فەلەستینیەکان ئەنجامی دا[٢٥]
عێراق و حکومەتە عەرەبییەکانی تا بە بەعس دەگات، هەمیشە کوردیان بەمەترسییەکی گەورە لەسەر ئاسایشی دەوڵەتی عێراق داناوە. پێبەپێی ئەو ئیدەیە رژێمە جیاجیاکانی عێراق و لەسەروو هەموشیانەوە بەعس پەنایان بۆ هەموو شێوازەکانی تەفروتوناکردنی هێزی مرۆیی بەراگواستن و لەهەمان کاتیشدا تەعریبکردنی کوردستان بردووە.
سیاسەتی تەعریب داهێنانێکی بەعسیانە نییە، تەعریب رەگوڕیشەی کۆنی هەیە، دەتوانین ئاکارەکانی سیاسەتی تەعریب و راگواستن و بەزۆر نیشتەجێکردن لەکوردستانی باشوردا بۆ سێ قۆناغی سەرەکی دابەش بکەین. بەم شێوەیە:

١-قۆناغی پیش دامەزراندنی دەولەتی عیراق.
٢-قۆناغی پاش دامەزراندنی دەولەتی عیراق.
٣-قۆناغی دەسەلاتداریتی بەعس.

### ١-قۆناغی پیش دامەزراندنی دەولەتی عیراق

پیداچوونەوەیەكی خیرای میژووی دانیشتوانی سەرزەمینەكانی عیراق، ئەوە دەردەخەن كە لەكاتیكدا تا هەزار سالی پیش زایین هیچ بەلگەیەك بۆ نیشتەجیبوونی عەرەب لەعیراقدا نییە، كەچی هەشت هەزار سال پیش زایین لەناوچە شاخاوییەكەی سەروو میسۆپۆتامیادا، ژیان بەردەوام بوو.

ئەكەدییەكان یەكەم گروپی سامی گەورە بوون كە لەكۆتایی ٤٠٠٠سالی پیش زایین لەدورگەی عەرەبەوە بەرەو ناوچەكانی باشوورو ناوەراستی عیراقی ئیستاو ئاشورییەكانیش بەرەو باكور هەلكشان.

واپیدەچیت بۆ یەكەمجار چەند سەد سالیك پیش زایین ئاشورییەكان ناوی عەرەب یان ناویكی لەو بابەتەیان تیدا هەلكەوتبیت[٢٦]

فتوحاتی ئیسلام یەكەمین هۆكاری گەورەی هاتنی عەرەب و نیشتەجی بوونیانە لەدورگەی عەرەبەوە بەرەو عیراقی ئیستا. ئیسلامەكان هەر ناوچەیەكیان دەگرت خیلە عەرەبەكانیان تیدا نیشتەجی دەكرد. فتوحاتی ئیسلام لەكوردستانی باشوردا لیشاوی خیلە عەرەبەكانی بەدوای خۆیدا هینا. هەموو ئەو خیلە عەرەبانەی كە لەگرتنی شاری موسل و شنگاردا بەشداربوون، پاشان جییان نەهیشت و تییدا نیشتەجی بوون. موسل و دەوروبەرەكەی كەزۆربەی دانیشتوانەكەی كورد بوون، لەسەردەمی راشدینداو پاشانیش لەسەردەمی ئەمەوی و عەباسییەكاندا، چەندین خیلی عەرەب لەبەسرەو كوتەوە رژانە سەری و تاوای لیهات بەقسەی بەلازوری بووە یەكیك لەگەورەترین شارەكانی موسلمانان.

لیشاوی تەعریب لەسەردەمی عەباسییەكاندا گەیشتە ئەوپەری.. حەمەوی باس لەوەدەكات كەزۆربەی دانیشتوانە كوردەكەی شاری هەولیر لەژیر كاریگەری ئەو لیشاوە بەخورەدا بوونە عەرەب.

دواجار لەناوەراستی سەدەی حەقدەدا كۆچ و رەویكی گەورەی خیلەكیی لەناوچەی جزیرەی خۆرئاوای فوراتەوە رویدا، ئەو كۆچبارە بەشیكی زۆری

خێلی گەورەی شەمەری لەنەجدەوە ڕژانە سەر عێراق. ئیتر لەو دەمەو بەرەودوا، پێکهاتەی ڕەگەزی دانیشتوانی عێراق بەکوردستانی باشوریشەوە، بەتایبەتیش پاش سیاسەتی نیشتەجێکردنی ئەو ئیلە عەرەبانە لەسەر دەستی والیە عوسمانییەکاندا، ئالوگۆری گەورەی بەسەرداهاتو وای لیهات عەرەب بوونە زۆرینەی دانیشتوانی عێراق[٢٧]

٢-قۆناغی پاش دامەزراندنی دەولەتی عێراق

ئەگەرچی هەروەکو پێشتر باسی لیوەکرا، سیاسەتی تەعریب ڕەگوریشەی کۆنی هەیە، بەلام ئەم سیاسەتە بەشێوەیەکی گشتیو لەچوارچێوە سیستماتیکییەکەیدا بۆ سەرەتای دامەزراندنی دەولەتی عێراق دەگەڕێتەوە.

دەولەتی تازەپێکهاتووی عێراقو دەستنیژی ئینگلیز، هەر زوو دەیزانی کەبێ کوردستانی باشور توانای بەردەوامبوونو ژیانی نابیت. (فەیسەڵ لەوتاریکدا کە لەموسڵ خویندرایەوە وتی: حکومەتی بەغدا بەبێ کوردستانی باشورو موسڵ ڕۆژیك ناژی[٢٨] عێراق ئەوەشی دەزانی کە کوردستانی باشوری بەزۆرو بێگویدانە خواستی دانیشتوانەکەی بەعێراقەوە لکاندووە. بۆیە هەمیشە ترسی جیابوونەوەو یاخیبوونی ئەو ولاتە بەزۆر لکینراوەی لەبەرچاودا بوو، سلی لەهیچ هۆکاریك بۆ گەیشتن بەو ئامانجە نەکردۆتەوە.

ئەگەر ماوەی دەسەلاتداریتی پادشایەتی بەهۆی نەبوونی سەرژمێری وردی دانیشتوانو چۆنیتی نیشتەجێ بوونیان واز لیبهێنینو کۆلینکاری پاش ئەو ماوەیەو بەتایبەتیش لەمێژووی سەرژمێری دانیشتوان لەعێراقدا لەسالی ١٩٥٧دا بکەین، ئەوا بۆمان ڕوون دەبیتەوە کە تەنیا لەماوەی بیست سالی نیوان سەرژمێرییەکەی دانیشتوان لەسالی ١٩٥٧دا کە بەیەکەمین سەرژمێری ڕاستو دروست دادەنریتو سەرژمێری ١٩٧٧دا کەئیتر دەسپێکی تەعریبکردنی بەرنامە بۆ داریژراوی بەعس بوو، کۆچکردنی عەرەب بۆ پارێزگاکانی کوردستانی باشور بەشێوەیەك زیادی کردووە، کەهیچ گومانێك بۆ جێبەجێکردنی ئەو پلانە ناهێلیتەوە کە لەسەردەستی حکومەتە جیاجیا عەرەبیەکانی عێراقداو بەمەبەستی کەمکردنەوەی ژمارەی کوردو زۆرکردنی ژمارەی عەرەب لەکوردستاندا جێبەجێکراوە. ئەوەتا "لەکاتێکدا زیادبوونی ڕێژەی عەرەب لەماوەی نیوان ١٩٥٧-١٩٧٧دا لەپارێزگاکانی ناوەڕاستو باشوری عێراقدا دابەزیوەتە خوار، هەمان ڕێژە لەنیو دانیشتوانی پارێزگاکانی

کوردستاندا پەرەی‌سەندووە (.....)، ئەم زیادیە (زیادبوونی ژمارەی عەرەب) بەرێژەی ٤٠٠٪ لەپارێزگای سلێمانیدا پەرەی سەندو زیاتر لە ٩٠٪ لەپارێزگای کەرکوك‌و نزیکەی ٦٤٪ لەپارێزگای هەولێر. لەپارێزگای موسڵیش (بەدهۆکەوە) رێژەی زیادەکە لە ٣٠٪ رەت بوو."[29]

بەوپێیە (رێژەی عەرەب لەپارێزگای موسڵ لەماوەی ساڵانی نێوان ١٩٥٧-١٩٧٧دا لە ٥٦٪ەوە بۆتە ٧٤٪ی سەرجەمی دانیشتوان، رێژەی کوردیش لە ٣١٪ەوە دابەزیوەتە سەر ٢٥٪.. لەپارێزگای هەولێریش رێژەی دانیشتوانی عەرەب لە ٧٠٪ەوە بۆ لە١٠٪ی سەرجەمی دانیشتوانی پارێزگا زیادی کردووەو، لەسلێمانیدا لە ١٪ەوە بۆتە ٦٪ (٠٠٠)، کەچی رێژەی دانیشتوانی عەرەب لەپارێزگای کەرکوك لە ٢٨٪ەوە بۆ ٤٤٪ زیادی کردووەو، بەرامبەر بەمەش هی کورد لە ٤٨٪ەوە دابەزیوەتە سەر ٢٨٪.[30])

ئەم رێژانە ئەگەر شتێك بگەیەنن، ئەوە دەردەخەن کەئەم پرۆسێسە لەخۆوەڕا نەبووەو کارێکی پێشوەخت بەرنامەڕێژ بووەو کرۆکی سیاسەتی حکومەتە ناوەندییە جیاجیاکانی عێراق بووە بەمەبەستی زۆرتری نیشتەجێکردنی ئێلە عەرەبە خێوەتنشینەکان لەناوچە ئاوەدانەکانی کوردستانداو جێ‌پێ‌لێژکردنی دانیشتوانە کوردەکەی ئەو ناوچانەو تەنگ پێ‌هەڵچنیان بۆ کۆچکردن.

### ٣-قۆناغی دەسەڵاتداریتی بەعس

بەدرێژایی مێژوو پێش دامەزراندن‌و پاش دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق، هیچ رژێمێك هێندەی بەعس حسابی بۆ (مەترسی کورد) لەسەر پاشەڕۆژی عێراق‌و دەسەڵاتەکەی نەکردووە.

لەسۆنگەی ئاسایشی ناوخۆیی عێراقی بەعسەوە، کورد یەکەمین‌و گەورەترین مەترسیە لەسەر ئاستی ناوە وە. بۆ بەگژاداچوونەوەی ئەو مەترسییە، بەعس پلانی جەنگێکی بێ‌بڕانەوەی بۆ تەفروتوناکردنی هێزی مرۆیی کورد پیادە کردووەو دەیکات.

بەعس بەشێوەیەکی سیستماتیکی‌و قۆناغ بەقۆناغ کەوتە دەستنیشانکردن‌و سنور بۆکێشانی ژمارەی کورد، ئەویش بەسێ رێگەی جیاواز، یەکەمیان تەعریبکردن، دووەمیان راگواستن‌و، سێیەمیشیان قڕکردن بوو.

لەئیدەی بەعسەوە، کورد کەمینەیەکی نەتەوەیی‌و کوردستان بەشێکی خاکی عێراقە، کورد میوانی خاکی عەرەبەو بەوپێیەش جگە لەکۆمەڵێك مافی کلتوری‌و پێکەوە ژیانی هەمیشەیی لەگەڵ عەرەبدا، هیچ مافێکی تریان نییە. بەعس لەڕێی دەستکاریکردنی سەرژمێرییەکان‌و دەستێوەردانی ڕاستەوخۆ بۆ کەمکردنەوەی ژمارەی کورد، چەندین خێڵ‌و ئاین‌و ئایننراو تەریقەتی لەکورد دابڕی‌و (لەساڵی ۱۹۷۷دا بڕیارێکیان دەرکرد کەبە گوێرەی ئەو بڕیارە چەندین عەشیرەت‌و پەیڕەوکەرانی ئاینی جیاجیای کوردستان بەعەرەب لەقەڵەم دران‌و لەناونووسی گشتی ۱۷/۱۰/۱۹۷۷دا عەرەب نوسیان کردن[٣١])،لەوانەش (یەزیدییەکان، کیکان، گەرگەری، شەبەك، گێژ، بالانی، ساڵەیی، شێخ بزێنی، دیانەکانی کوردستان‌و شێخ‌و سەیدەکانی کوردستان[٣٢]).

ڕوپێوی خاکی کوردستانی باشور بەزۆرتر لە (۸۵۰۰۰ کچگ) دادەنرێت، لەو ڕووبەرەدا مەڵبەندی پێنج پارێزگا؛ سلێمانی، کەرکوك، هەولێر، موسڵ‌و دهۆك‌و سی‌و حەوت قەزاو سەدوسی ناحیەی تێدەکەوێت. ئەو ڕووبەرە بەشی هەرەگەورەی چڕی دانیشتوان‌و سەرچاوە بێشومارەکانی نەوت‌و ئاوو کانزاکانی هەموو عێراقی ئێستای تێدەکەوێت. بەپێی ئەو سنورەی کەلە ساڵی ۱۹۷٤دا بۆ ناوچەی ئۆتۆنۆمی دانراو بەعس بەکوردستانی لەقەڵەمدا، تەنیا (۳٦,۳٤۷ کچگ)ی لەو ڕوپێوە هێشتەوە کە مەڵبەندەکانی هەرسێ پارێزگای سلێمانی‌و هەولێرو دهۆك‌و بیست‌ویەك قەزاو، حەفتا ناحیەی لەخۆگرتووە. بەمەش زۆرتر لە (٤۸,٦٥۳ کچگ)ی لەخاکی کوردستانی باشور دابڕی‌و هەموو ناوچە ستراتیجییەکانی کەرکوك‌و موسڵ‌و خانەقین‌و دەوروبەریانی لەسنوری ناوچەی ئۆتۆنۆمی دەرهێنا و بەخاکی عەرەبی لەقەڵەم دان‌و بەکاوەخۆ کەوتە تەعریب کردنیان.

سیاسەتی تەعریب، ڕاگواستن‌و نیشتەجێکردنی زۆرەملێیانەی بەدوای خۆیدا هێنا.

هەر لەسۆنگەی ئاسایشی ناوخۆیی عێراقەوە، ڕاگواستنی کورد چەند هۆکارێکی بۆکراوەتە بنەما، کەبەپێی ئەو هۆکارانە چەندین ناوچەی جیاجیای سەر بەکوردستانی باشور لەخەڵکەکەی چۆڵکران‌و بەهێزی سوپاو دانیشتوانی عەرەب پڕکرانەوە.




**نەخشەی ژمارە (١٨)**

**ناوچەی ئۆتۆنۆمی بەنیسبەت کوردستانی باشورو عیراقەوە**

هۆکارەکانی راگواستن جیاوازن، گرنگترینیان ئەمانەن:-

١-راگواستن بەهۆی تەوەرە ستراتیجییەکانەوە: کەقەزاکانی بەدرەو مەندەلیو خانەقینو شێخانو تلکێفو تەلەعفەرو شنگارو بەشێك لە قەزاکانی تووزو زاخۆی گرتۆتەوە.

٢-راگواستن بەهۆی ناوچە نەوتاوییەکانەوە: قەزای کەرکوكو هەریەکە لەقەزاکانی دوبزو کۆیەی گرتۆتەوە.

٣-راگواستن بەهۆی ناوچە سنورییەکانەوە: قەزاکانی هەڵەبجەو پێنجوێنو شاربازێڕو دوکانو پشدەرو چۆمانو رەواندزو زێبارو ئامێدیو زاخۆی گرتۆتەوە

٤-راگواستن بەهۆی جەنگی کوردستانەوە: هەموو گوندو ئاوایییەکانی کوردستانی گرتۆتەوە کەهێزی سوپا ناتوانێت راستەوخۆ بیانخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە.

ئەنجامی ئەم سیاسەتە، لەنێوان ساڵانی ١٩٦٨-١٩٨٢دا پتر لە (٢٠٠٠٠٠) کوردی فەیلی لەشارەکانی بەغداو قەزاکانی بەدرەو مەندەلیو خانەقین دەرکرانو رەوانەی ئێران کرا. بەشی زۆری ناوچە راگوێزراوەکانی سنوری ناوچە نەوتاوییەکانیش بەرەو قوڵایی شارو شارۆچکەکانی سەر بەناوچەی ئۆتۆنۆمی کۆچیان پێکراو لەئۆردوگای زۆرەملێدا نیشتەجێکران بۆ ئەو مەبەستەش تەنیا لەپارێزگای سلێمانیدا، عێراق (٢٩) ئۆردوگاو، لەپارێزگای هەولێردا (١٦) ئۆردوگاو، لەپارێزگای دهۆکدا (١٤) ئۆردوگای زۆرەملێی دروستکردبوو

لەساڵی ١٩٨٥ بەدواوەو لەگەرمەی جەنگی عێراق- ئێرانو، عێراق- کوردستاندا، سیاسەتی سوتماککردنی کوردستان ئاقارێکی مەترسیداری گرتەبەر، ئەوسیاسەتە لەماوەی تەنیا چوارساڵدا تاکۆتایی هاوینی ١٩٨٨ کە پرۆسێسەکانی ئەنفال گەیشتنە ترۆپك، لەکۆی(٤٦٥٤) گوند سەر بەهەر سێ پارێزگای سلێمانیو هەولێرو دهۆك، (٤٠٠٦)گوندی لەگەڵ خاکدا تەختکرانو سوتێنران. لەکۆی (٢٠٣٥) گوندی تەنیا سەر بە پارێزگای سلێمانیدا، سەرجەم (١١٩٢) گوندی خاپورکران. لەپارێزگای هەولێریشدا لەکۆی (١٤٩٦) گوند، سەرجەم (١٢٠٥) گوندی خاپورکران. دواجار لەپارێزگای دهۆکدا لەکۆی (١١٢٣) گوند، سەرجەم (٨٠٩) گوندی خاپورکران. (بڕوانە خشتەی ژمارە "٩"). ئەمە سەرەڕای کاولکردنی سەدان گوندو دەیان قەزاو ناحیەی سەر بەناوچە کوردنشینەکانی دەرەوەی ناوچەی ئۆتۆنۆمی.




**خشتەی ژمارە (٩)**
**رادەی خاپور کردنی گوندەکانی سەر بەپارێزگاکانی ناوچەی ئۆتۆنۆمی/ ساڵی ١٩٨٨**

پێش پرۆسێسەکانی ئەنفال، بەشێکی زۆری دانیشتوانی ئەو ناوچانەی رادەگوێزران دەبرانە ئۆردوگاوە بەڵام ئەنفال لەدەرەوەی راگواستندا ئامانجە شاراوەکەی بەعسی لەپشتەوەبوو، ئامانجی کەمکردنەوەی ژمارەی کورد ئەگەرچی بەقڕکردن و قەلاچۆکردنیش بێت.

جینۆساید کە رەشەکوژیو قڕکردن دەگرێتەوە، یەکێکە لەو تاوانانەی کەبەپێی بڕیاری نەتەوەیەکگرتووەکان نەك هەر دژ بەو کەسانەیە کە کارەکە دەیانگرێتەوە، بەڵکو تاوانێکە دژ بەمرۆڤایەتی.

بەپێی ئەو کۆنڤێنشنەی کە نەتەوەیەکگرتووەکان بەتێکڕای دەنگ قبوڵی کردو لە (١٩٥١/١/١٢)ەوە کاری پێدەکرێت، پێناسەی قڕکردن بەیەکێك لەم هەڵسوکەوتانەی کە بەئەنقەست بۆ لەناوبردنی سەرجەم یان بەشێك لەگروپێکی نەتەوەیی یان نەژادی یان ئایینی ئەنجام دەدرێت، پێناسەکراوە[٣٥] :-

(ا-کوشتنی ئەندامەکانی گروپێك "نەتەوەیەك").

ب-زیانگەیاندن بەتەواوی ئەندامانی گروپەکە، چ لەڕووی فیزیکییەوە، چ لەڕووی عەقڵییەوە.

پ-دانانی گروپەکە لەژێر باودۆخێکی ئەوتۆ کەببێتە هۆی لەناوچوونی هەموو یان بەشێکی ئەندامەکانی.

ت-رێگاگرتن بەهەر شێوەیەك لەزاوزێو گەشەکردن لەناو گروپەکەدا.

ج-بەزۆر منداڵ گواستنەوە لەگروپێکەوە بۆ گروپێکی تر[٣٦]

بەپێی ئەم کۆنڤێنشنە بێت، عێراق پێش پرۆسێسی ئەنفالەکانیش لەساڵی ١٩٨٨دا، جینۆسایدی دژی کورد ئەنجامدراوە.

لەشاڵاوی فڕاندنی زۆرتر لە (٨٠٠٠) کەسی سەر بەبارزانییەکان لە تەمموزی ١٩٨٣دا، سەدام حسێن تەنیا دوو مانگ دوای ئەو کارە مەبەستی رژێمەکەی لەوکارە نەشاردەوەو بەئاشکرا لەدەزگاکانی میدیاوە وتی:

ئێمە سزای هەموو ئەو کەسانە دەدەین کەهاریکاری لەگەڵ کوڕەکانی بارزانیدا دەکەن.. ئەوانە بە توندی سزای خۆیان وەرگرتو فڕێدرانە جەهەنەمەوە. هەروەها لەسەرەتای ساڵی خوێندنی ١٩٨٥-١٩٨٦دا، عێراق (١٥٠٠) منداڵی کوردی تەمەن (٨-١٤) ساڵانی وەك بارمتە لەقوتابخانەکاندا فڕاند بەبیانوی تۆڵەکردنەوە لەدایك و باوك و خزم و کەس وکارەکانیان[٣٧]

پێش شالاوەکانی ئەنفال و لەدەرەوەی ئەو پرۆسێسەدا، لەچەندین شوێنی جیاجیای کوردستان. چەکی کیمیایی دژی دانیشتوانە سیڤیلەکەی کوردستان بەکارهێنرا. لەبۆردومانی شاری هەڵەبجە لە ١٩٨٨/٣/١٦دا، دەوروبەری (١٠٠٠٠)کەس کوژران و برینداربوون. پاش کوشتارەکە هەزاران ساوای بێدایك و باوك و بەشێکی دانیشتوانەکەی ئەوشارە، لەلایەن هێزەکانی عێراقەوە دەستگیرکران و راپێچی شوێنی نادیار کران.

لەمێژووی نوێی کوردا، هیچ پرۆسێسێکی عەسکەریی هێندەی پرۆسێسەکانی ئەنفال روو لەناوبردنی کورد نەبووە. لەدەرەوەی راگواستن و تەعریبدا، بەمەبەستی کەمکردنەوەی ژمارەی کورد، ئەنفال روو لەقڕکردن و قەلاچۆکردنی کوردبوو ئەنفال کاردانەوە نەبوو... پێش دەسپێکی ئەو پرۆسێسە، دەوڵەتی عێراق پێشتر پلانی کارەکەی دارشتبوو؛ ناوچەکانی قڕکردنی دیاریکردبوو، بەپێی بڕیارێکی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش لە ١٩٨٧/٦/٣٠دا، عێراق هەموو بەڕێوەبەرایەتییەکانی کشتوکاڵیی شارو دێهاتەکانی کوردستانی هەڵوەشاندەوەو هەموو کەرەسە کشتوکاڵییەکانیشی قەدەغەکرد[٣٨]

سەرجەم قوتابخانەو نەخۆشخانەو کارە خزمەتگوزارییەکانی کێشایەوەو زۆنێکی ئاسایشی دروستکرد. بەپێی چەند بڕیارێکی نهێنیتر کە (مەکتەبی تەنزیمی شیمال) دەریکرد، داواکرا وەکو ناوچەیەکی عەسکەری مامەڵە لەگەڵ ناوچەکانی ناو زۆنە قەدەغەکراوەکەدا بکرێت و هەر کەسێکی تەمەن ١٥ ساڵ بەبانەوە دەستگیرکرا، پاش وەرگرتنی زانیاری لێی، بکوژرێت.

کەهێرشەکانی ئەنفال دەستیان پێکرد، ئیتر زۆنە قەدەغەکراوەکە، کە روبەرەکەی دەیان هەزار کیلۆمەتری چوارگۆشەی خاك بوو، هەزاران گوندو ئاوایی و، سەدان هەزار کەسی سیڤیلی تێدا دەژیا، سەرلەبەر بووە یەك نیشانی عەسکەریی سوپای عێراق.

یەکێك لە رزگاربووانی ئەو پرۆسێسە کەخەڵکی گوندی (رەبات)ی سەربە ناوچەی گەرمیانەو لە ١٩٨٨/٤/٤ لەلایەن هێزەکانی سوپای عێراقەوە دەگیرێت، دەگێڕێتەوەو دەڵێت: "دوژمن زۆر بێ بەزەییانەو بێگوێدانە گریان و هاواری ژن و منداڵ، هەموومانی رەوانەی (قۆرەتوو)ی نزیك خانەقین کرد.

شەپۆلێکی زۆری تریشیان لەو دەوروبەرە هێنابووە ئەوێ، ئەو شەپۆلەی ئێمەی تێدابووین دەگەیشتە پەنجا هەزار کەس. دوو شەو بێ نان و ئاو ماینەوە. ئینجا لە ١٩٨٨/٤/٦دا ئێمەیان گواستەوە بۆ (تۆپزاوا)ی کەرکوك، لەوێ بەمجۆرە لەیەکتری جیاکراینەوە:

یەکەم: تەمەنی دوازدەساڵ تاچل وپێنج ساڵ.

دووەم: تەمەنی پەنجا ساڵ و سەرووتر.

سێیەم: کچ.

چوارەم: ژن و منداڵ.

(.....)، یەکەم هەنگاو بێسەرو شوێنکردنی مێردمنداڵ و گەنجەکان بوو. واتە ئەوبەشە لەدوازدە تاچل و پێنج ساڵ دەبوو. بەچاوی خۆم بینیم دوو دوو بەدەست و چاو بەستراوی سواری پاسی ئۆتۆمبیلی سەرگیراوکران. پاسەکان پەنجەرەکانیان بۆیەکرابوون و ناوەوەیان دیارنەبوون. لەدوای ئەوان نۆرەی ئێمەهات (.....)[٣٩]

دوای کیمیابارانکردنی گوندی شێخ وەسانان لە ١٩٨٧/٤/١٥دا، کەبووە هۆی کوشتنی (٢١٠)کەس و بریندار بوونی (٣٦٠)کەسی تر، لەسەرەتاوە بریندارەکان بۆ نەخۆشخانەی هەولێر رەوانەکران و پاشان بۆگرتوو خانەی دائیرەی ئەمن و لەوێش هەموویان گوللەباران کران.

گروپێکی تر کەژمارەیان (٤٠٠)کەس دەبوو، دوای بۆردومانێکی کیمیایی لە ناوچەی سلێمانی، بەرەو نەخۆشخانەی شارەکە کەوتنەرێ، بەڵام دەزگا ئەمنییەکانی عێراق دەستگیری کردن و، لەرۆژی ١٩٨٨/٤/٢ لەسەر بازگەی تانجەرۆ هەموویانی گوللەباران کردو بەکۆمەڵ لەگۆڕنران.

هەر لەدوا دوای شاڵاوەکانی ئەنفال و لەکۆتایی مانگی ئابی ١٩٨٨دا، هەزاران کوردی سیڤیل لەناوچەی ئامێدی لەلایەن هێزەکانی عێراقەوە دەستگیرکران و دواییتر هەموویان گوللەباران کران[٤٠]

ئەم پرۆسێسە کە لەمانگی شوباتەوە تاسەرەتاکانی ئەیلولی ١٩٨٨ درێژەی هەبوو، دەکرێت دوای (هۆلۆکۆست) بەگەورەترین تاوانی جینۆساید دابنرێت، کەتێیدا بەدەوربەری (١٨٢٠٠٠) کەس شوێن بزرکران.

## دوو- لەڕووی ئابورییەوە

روپێوی عێراق بێ لەکوردستان (٣٥٠,٠٥٢ کچگ)یە. لەو روپێوە (١٦٨,٥٥٢ کچگ) کە نزیکەی نیوەی خاکەکەی دەکات بیابانەو هیچ سەرچاوەیەکی ژیانی نییە[٤١] ئەوەشی کەدەمێنێتەوە روپێوێکی تێکەڵەی خاکە گردۆڵکەییو دەشتە لیتییەییەکانە، کەجگە لەڕەشە خاکەکانی کەنارەکانی هەردوو روباری دیجلەو فورات، ئیتر لەبەشێکی گەورەیدا روبەرە ئاوییەکانی زۆنگاوو عەماراو دایدەپۆشن. بۆیە عێراق لەبژێوی خۆیدا پشتی تەواو بەکوردستان دەبەستێت.

لەولاتانی کۆلۆنیو نیمچە کۆلۆنیدا شەڕی ئابوری دواشەڕی کۆلۆنیالیستەکان بووە دژی گەلانی کۆلۆنی. لەو شەڕەدا ئەوپەڕی هێزو توانا بەمەبەستی دزینو بەتالانبردنی سەرچاوەکانی ئابوری ولاتانی کۆلۆنی خراوەتە گەڕ.

لەکوردستانداو بەپێچەوانەی هەموو کۆلۆنییەکانی جیهانەوە، عێراق لە تایبەتمەندێتی بارودۆخی کۆلۆنی بوونی کوردستانەوە کە هەر لەسەرەتاوە کوردستانی باشور وەکو پارچەیەك لەخاکی عێراق حسابی بۆکراوە، شان بەشانی هەموو شێوازو ئامڕازە جۆراوجۆرەکانی رامکردنی کوردو داگیرکردنی خاکەکەی، دەوڵەتی عێراق بەئاسانترین شێوە شەڕی ئابوری بەرپاکردو درێژەی پێداو بەئەنجامی گەیاند.

خاکی کوردستان بەگشتیو کوردستانی باشور بەتایبەتی، سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندی هەمە جۆر کانزاو کانی ژێر زەویو نەوتو ئاوی سازگارە. ئەو سەرچاوە گەورەیە کە تادرەنگانێك دەستی مرۆڤی پێڕانەگەیشت، تا ئەمڕۆ مایەی چاوتێبڕینو هۆکاری داگیرکارییە.

عێراق وەکو عەمارێکی گەورە تەماشای کوردستانی کردووە، کەبەردەوام کەرەستەی پێویستی لێدەرهێناوە. بۆ ئەوەشی تا دەکرێت زۆرترینی بڕی کەرەستەو سەرچاوە ئابورییەکان لەکوردستانەوە رەنیوبهێنێتو خاوەنە ئەسڵییەکەی دەست نەهێنێتە رێگایو لەئاییندەشدا مەترسی بۆ سەر

تالانییەکەی دروست نەکات، بۆ ئەو مەبەستە عێراق چەند هەنگاوێکی هەڵهێناوە، کە گرنگترینیان:-

١-سەرەداوی هەر پێشکەوتن و پەرەپێدانێکی ئابورییانەی کوردستانی باشور، لەدەستی دەوڵەتی عێراق خۆیدا بوو. عێراق لەدیدێکی کۆلۆنیالیستانەوە هیچ پلانێکی هەرێمیی بۆ کوردستانی باشور وەکو هەرێمێکی جیاواز لەهەرێمەکانی تری عێراق لەڕووی ژمارەی دانیشتوان، چڕیو دابەشبوونیان، شێوەی خاکەکەی بڕو جۆری سەرچاوە ئابوورییەکان... هتد. دانەدەنا. کوردستانی باشور کە زۆرترین سەرچاوەی ئابوری لێبەتالان دەبرا، لەسەر ئاستی پلان دانانی ئابوری نەك هەروەکو پارچەکانی تری عێراق حسابی بۆ نەدەکرا، بەڵکو بەئەنقەست پلانی پاشکۆکردن و پاشکەوتە بوونی بۆ دادەنرا. عێراق هەموو بوارە گرنگەکانی ئابوری کوردستان؛ پیشەسازیی کشتوکاڵ، بازرگانی، بۆخۆی و لەلایەن خۆیەوە کۆنترۆڵ کردبوو.

٢-هەر لەهەمان سۆنگەوەو لەپێناوی لەبۆتەدانی ئابورییانەی کوردستانی باشورو مل کەچ پێکردنی لەمیانەی سیاسەتی ئابوری سەرجەم عێراقدا، عێراق لەرێی داسەپاندنی جۆرێك لەپێوەندی بەرهەمهێنان کەسیستمەکە خۆی خوازیاری بوو، کۆنترۆڵی هێزی بەرهەمهێنانی کوردیی کرد. ئەویش بە لادان و بەلارێدا بردنی گەشەسەندنی ئابوری کوردستان لەو شارێ ئاساییەی کە دەکرا لێیەوە پێبگرێت و گەشەی سروشتی خۆی بکات. بەتایبەتیش لەرێی دوو کارکردەوە:

أ-نەخشەی ئابوری- جیۆلۆجی عێراق و کوردستانی باشور، بەئاشکرا ئەوەمان پیشان دەدات، کەبەشی هەرە گەورەی سەرچاوەو کانزاو کانەکانی ژێر زەوی (نەوت، ئاسن، مس، گۆگرد، قوڕقوشم، ئەلەمنیۆم... هتد) دەکەونە خاکی کوردستانی باشورەوە "بڕوانە خشتەی ژمارە ١٩"، بەلام عێراق زۆرینەی پرۆژە ستراتیجییەکانی کەپشت بەکەرەستە خاوەکانی کوردستان دەبەستن، لەناوەڕاست و باشوری عێراق دامەزراندوە، بەشێوەیەك

نەخشەی ژمارە (١٩)

دابەشبوونی کەرەسەی خاو لەکوردستانی باشورو عێراق/١٩٧١[٤٢]



نەخشەی ژمارە (٢٠)

پرۆژەی پیشەسازییەکانی پلانی پەرەپێدانی ساڵەکانی ١٩٧٠-١٩٧٤و ١٩٧٤-١٩٧٩ لەعێراق و ناوچەی ئۆتۆنۆمیدا[٤٣]

کە کارگەو پرۆژەکان صەدان کیلۆمەتر لەشوێنی ئەسڵی دەرهێنانی کەرەستە خاوەکانیانەوە دوورن بەرامبەر بەمەو بۆ چاوو راکردن لەگەشەسەندنی ئابوری کوردستان، عێراق تەنها ئەوپرۆژە کەم بایەخانەی لەناوچەی ئۆتۆنۆمیدا دامەزراندووە (شەکر، چیمەنتۆ، رستن‌وچنین، جگەرە، بەرد...)، کەئەگەر لەڕووی دەستکەوتەوە زیانیان نەبێت ئەوا هیچ قازانجێکی ئەوتۆیان نییە. "بڕوانە نەخشەی ژمارە ٢٠" بەمەش لەسەرێکەوە کوردستان‌و دانیشتوانە کوردەکەی لەخێروبێری سەرچاوەی خاکەکەی خۆی دوورخستۆتەوە، لەوسەرەکەی تریشەوە لەدەرەوەی کوردستان‌و بەمەبەستی دوورخستنەوەی هێزی بەرهەمهێنانی کوردی، لەناوچەکانی ناوەڕاست‌و باشوری عێراقدا هەموو ئەو پرۆژانەی بەهێزی بەرهەمهێنانی عەرەبی، یان بەدەوڵەت سپاردووە.

ب–هەموو ئەو سەرمایە گوزارییانەی کەعێراق لەکوردستاندا خستبوونیەگەڕ، لەچوارچێوەی زۆرترکردنی کەرەسەی خاوو دواجار زۆرترکردنی بەرهەم لە ناوچەکانی تری عێراقدا، واوەتر سەری نەکردووە. سەرمایەگوزارییەکانی عێراق بەپێی پلانی حکومەتی ناوەندی‌و دوور لەدابینکردنی پێداویستییە سەرەکییەکانی دانیشتوانی کوردستان‌و، تەنیا بەمەبەستی دابینکردنی هەلومەرجی باشتر رەنیوهێنانی کوردستان بووە بۆ عێراق.

٣–کوردستانی باشور هەر بەتەنیا عەمارێکی گەورەو بێ‌شوماری کەرەستەی خاو نەبووە، بەڵکو سەرچاوەیەکی مەزنی ئاوی سازگاریش بووە.

روباری دیجلە کە گەورەترین روباری عێراقە، هەموو لقەکانی لەکوردستانەوە هەڵدەقوڵێن‌و، لەکوردستانی باشورەوە تێی دەڕژێن. تێکڕای بڕی ئاوی لقەکانی (خاپور، زێی گەورە، زێی بچوك، خاسە، سیروان) (٦٥,٧٧٪)ی هەموو ئاوی دیجلە پێکدەهێنن. عێراق بەمەبەستی کۆنترۆڵکردنی ئاوی دیجلەو دابینکردنی زۆرترین بڕی ئاوی خواردنەوەو ئاودێری ناوچەکانی ناوەڕاستی عێراق‌و پاشانیش نەهێشتنی مەترسی لافاو، لەسەر هەریەکێك لەلقەکانی دیجلە لەکوردستانی باشوردا، چەندین عەماراوو بەنداوی دامەزراندووە، بەمەش بەشێکی گەورەو بەپیتی خاکی کوردستان ژێر ئاو خراوون بێ ئەوەی کوردستانی باشور پێویستی بەو هەموو بەنداوو عەماراوانە بێت، ئەمە لە سەرێکەوە، لە سەرێکی تریشەوە کوردستانی باشور ناچارکراوە بۆ بەدەستخستنی وزەی کارەبا، تەنیا پشت بەو وزەیە ببەستێت کە لە

قەڵبەزەکانی ئەو بەنداوانەوە بەرهەم دەهێنرێن. ئەمە لە کاتێکدا ناوچەکانی ناوەڕاستو خواروی عێراق لە ڕێی وێستگەی کارۆگەرمییەکانەوە کارەبایان بۆ دابین دەکرێت. ئەمەجگە لەوەی عێراق لە رووی عەسکەریشەوەو بۆ دروستکردنی ناوچەی دابڕ سودی لەهێندێکیان وەرگرتووە.

* * *

ئێستا دەکرێت لە کۆتایی ئەم فەسڵەدا، کورتەی پایەکانی ئاسایشی دەوڵەتی عێراق لەمیانەی تەوەر ستراتیجییەکانی عێراقدا کەلەسەر بنەمای مەترسیەکانی ناوەوە/ کورد داڕێژراوون، بەم شێوەیە ئەنجامگیر بکەین:

عێراق تەوەرە ستراتیجییەکانی ناوەوەی دژبە مەترسی کورد، بەشێوەیەك دارشتووەکە:

*هەموو ناوچە ستراتیجییەکان، ناوچە ئابورییەکان، ناوچە گەورەکانی کۆبوونەوەی دانیشتوان، گرێکانی هاتوچۆ، ناوچەکانی نزیك ناوچە عەرەبنشینەکان، لە ناوچەی ئۆتۆنۆمی دابڕێت.

*ئەگەری جیابونەوەی کوردستان لە عێراق کزولاواز بکاتو هەرکاتێیش هەلومەرجێکی واهاتە پێشەوە کوردستان بەدەوڵەتی سەربەخۆ شاد بێت، ئەو دەوڵەتە مەترسی گەورە نەخاتە سەر عێراقو ناوچە ستراتیجییەکان هەر لەدەست عێراقدا بمێنێتەوە.

*ئەو تەوەرانە بەشێوەیەك داڕێژراون، کە قوڵایی ستراتیجیو جوگرافی بۆ کەرکوكو موسڵو خانەقینو دەوربەری دروست بکەن. ئەمەش بەگۆڕینی ئیداری ناوچەکانی کوردستانو دەرکردنیان لەسنوری ناوچەی ئۆتۆنۆمیو راگواستنو تەعریب کردنیان.

*دامەزراوە پەترۆلییەکانو شوێنە گرنگە ستراتیجییەکان لە زەبری هێزی پێشمەرگە بپارێزێت، بەجۆرێك کەچەکی پێشمەرگە نەگاتە ئەو دامەزراوەو شوێنە گرنگانە.

هەربۆیە دارشتنی تەوەرەکانی ناوەوە روو لەپاراستنی سێ شوێنی ستراتیجییە:

١-کەرکوك.

٢-موسڵ.

٣-خانەقین.

### ١-تەوەرە ستراتیجییەكانی پاراستنی شاری كەركوك

بەمەبەستی پاراستنی دامەزراوە پەترۆڵییەكانی شاری كەركوك و سڕینەوەی سیمای كوردستانی لەو شارەو كەمكردنەوەی چڕی زۆرتری كورد تێیدا، عێراق قەزا كوردنشینەكانی (توزخورماتو، كفری، كەلار، چەمچەماڵ)ی بەهەموو ناحیەكانیانەوە، لەسنوری ئیداریی پارێزگاكە دابڕیو بەسەر پارێزگاكانی (سەلاحەدین)و (دیالە)و (سلێمانی)دا پەرش و بڵاویكردنەوە. پاشان ئەم تەوەرانەی بەدەوری شارەكەدا دارشت:

أ-تەوەرەی یەكەم بریتی بوو لەزنجیرە چیاكانی سنوری خۆرهەڵاتی عێراق كەدەكەوێتە پارێزگاكانی (دیالە، سلێمانی، هەولێر)و بەشێوەیەكی بنچینەی تا چیای بەمۆ.

ب-تەوەرەی دووەم كە تەوەرەیەكی بنچینەیی نییە، بریتی بوو لەزنجیرە چیای سەگرمە تا دەربەندیخان و رووباری سیروان.

پ-تەوەرەی سێیەم بریتی بوو لەچیای كانی دۆمەلان و گردۆلكەكانی نێوان كەركوك و چەمچەماڵ (ناوچەی شوان) تا چیای ئاشداخ.

### ٢-تەوەرە ستراتیجییەكانی پاراستنی شاری موسڵ

بەپێچەوانەی كەركوكەوەو بەهۆی كەمبوونەوەی ژمارەی كورد لەشاری موسڵ و دەوروبەریدا، بەمەبەستی پاراستنی شارەكەو دوورخستنەوەی لە ناوچەی ئۆتۆنۆمی، عێراق قەزا كوردنشینەكانی (تلكێف، ئاكرێ، شێخان، حەمدانیە، شنگار، تەلەعفەر)ی بەهەموو ناحیەكانیانەوە، لەناوچەی ئۆتۆنۆمی دابڕیو لەرووی ئیدارییەوەو لەشێوەی نیوە ئەڵقەیەكدا بە پارێزگای (نەینەوا)ی گرێدان. عێراق تەوەرەكانی پاراستنی شاری موسڵ لەم ناوچانە دارشت:

أ-ناوچەی تلكێف.
ب-ناوچەی ئاكرێ.
پ-ناوچەی شێخان.
ج-ناوچەی حەمدانیە.
ت-خۆرهەڵاتی دیجلە.

### -تەوەرە ستراتیجییەکانی پاراستنی شاری خانەقین

عێراق بەمەبەستی پاراستنی شاری خانەقین، سنوری قەزاکەو هەموو قەزاو ناحیەکانی دەوروبەری (مەندەلی، بەدرە، کفری)ی بەهەموو ناحیەکانیانەوە لەناوچەی ئۆتۆنۆمی دەرهاویشتو لەڕووی ئیدارییەوە دابەشی سەر هەردوو پارێزگای (دیالە)و (واست)ی کردن. عێراق بۆ پاراستنی شاری خانەقین زۆنێکیئاسایشی بەدەوری شارەکەو دەوروبەریدا دامەزراند، سەرەتا خەڵکە کوردەکەی کۆچ پێکرد، ئینجا ناوچەکەی تەعریب کرد[٤٤]

[١]-بۆ زۆرتر زانیاری بڕوانە: محمد أزهر سعيد السماك (الدكتور) واخرون، العراق- دراسه اقليميه، ج١، جامعه الموصل، مديرية مطبعة جامعة الموصل، ١٩٨٥

[٢]-چیا، ئەمنی ستراتیجی عێراق و سێ کوچکەی بەعسییان: تەرحیل، تەعریب، تەبعیس، لەبڵاوکراوەکانی دەزگای ناوەندی رۆشنبیری کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان، ١٩٨٧. ل١٦٠،١٦١

[٣]-تەوەرەکانی جموجۆڵی عەسکەریی عێراق بەدراوسێکانیەوە، لەم سەرچاوانەوە تاووتوێ کراوە:

-الجمهورية العراية، وزارة الدفاع، الجغرافية العسكرية، بغداد، مطبعة الكلية العسكرية، ١٩٧٥.

-الجمهورية العراقية، وزارة الدفاع، الجغرافية العسكرية، دائرة الشؤون الآدارية، بغداد، مطبعة العسكرية، ١٩٨٤.

-سلمان الدركزلي (العقيد الركن)، جغرافية العراق العسكرية، بغداد، مطبعة البرهان، ١٩٥٦

-محمدحسن شلاش (المقدم الركن)، الجغرافية العسكرية، بغداد مطبعة الآرشاد، ١٩٦٩.

[٤]-بۆ زۆرتر زانیاری بڕوانە: محمد امين زكي، کوردو کوردستان، جلدا، بەغدا چاپخانەی دارالسلام، ١٩٣١.

[٥]-فەتاحی قازی، کورد لەئینسکلۆپیدیای ئیسلامدا، وەرگێڕانی حەمەکەریم عارف، (دەستخەت).

[٦]-الأتحاد الوطني الكردستاني، أغد ديمقراطي أم حرمان شعب حتى من حق الحلم؟ من منشورات الأتحاد الوطني الكردستاني، ل٣١.

[٧]-كمال مظهر أحمد (الدكتور)، بعض قضايا الشرق الأوسط، بغداد.

[٨]-بۆ زۆرتر زانیاری بڕوانە: فاضل حسين (الدكتور)، مشكلة الموصل، بغداد مطبعة الرابطة، ١٩٥٥.

[٩]-الأتحاد الوطني الكردستاني، هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[١٠]-هەمان سەرچاوە. ل٣٣.

[١١]-بۆ دەقی هەرسێ بەندی پەیماننامەکە کەپێوەندییان بە کوردەوە هەیە، بۆ نمونە بڕوانە:
-وليم ايغلتن الأبن، جمهورية مهاباد ١٩٤٦ الكردية، ترجمة جرجيس فتح الله، بيروت، دار الطليعة، ١٩٧٢، ل٣٠. هەروەها- منذر الموصلي، عرب وأكراد، دمشق، دارالعلم، ١٩٩١، ل٦٨

[١٢]-كمال مظهر أحمد (الدكتور)، دور الشعب الكردي في ثورة العشرين العراقية، بغداد، مطبعة الحوادث، ١٩٧٨.

[١٣]-بۆ زۆرتر زانیاری بڕوانە: کەمال مەزهەر ئەحمەد (الدكتور)، چەند لاپەڕەیەك لەمێژووی گەلی کورد، بەشی یەکەم، چاپخانەی ئەدیبی بەغدادی بغداد، ١٩٨٥، ل١١٦.

[١٤]-الأتحاد الوطني الكردستاني، هەمان سەرچاوەی پێشوو. ل٣٥٦.

[١٥]-هەمان سەرچاوە.

[١٦]-هەمان سەرچاوە.

[١٧]-هەمان سەرچاوە.

[١٨]-چیا، سەرچاوەیەکی پێشتووتر.

[١٩]-الجمهورية العراقية، وزارة التخطيط، المجموعة الأحصائية السنوية لسنة ١٩٩٠، بغداد.

[٢٠]-الأتحاد الوطني الكردستاني، هەمان سەرچاوەی پێشوو. ل٣٦١.

[٢١]-بۆ زۆرتر زانیاری بڕوانە: فاضل حسين (الدكتور)، هەمان سەرچاوەی پێوو.

[٢٢]-هوبير ديشان، نهاية الأستعمار، ترجمة زهير السعداوي، بيروت مطبعة قلفاط، ١٩٥٣.

[٢٣]-هەمان سەرچاوە.

[24]-روجر اوين و بوب سوتكليف، دراسات نظرية في الأمبريالية، ترجمة الدكتور و ميض جمال عمر والدكتور كاظم هاشم نعمة، جامعة الموصل، مطبعة مؤسسة دار الكتب للطباعة والنشر، ١٩٨٠.

[25]-هەمان سەرچاوە.

[26]-خەلیل ئیسماعیل (الدكتور) گۆڤاری سیاسەتی دەولی، "ژمارە١١.

[27]-هەمان سەرچاوە.

[28]-چیا، سەرچاوەیەکی پێشووتر. ل٩٤.

[29]-خەلیل ئیسماعیل (الدكتور)، هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[30]-هەمان سەرچاوە.

[31]-چیا، هەمان سەرچاوەی پێشوو. ل٢٧٠

[32]-هەمان سەرچاوە. ل١٣٤

[33]-هەمان سەرچاوە. ل١٣٠.

[34]-هەمان سەرچاوە.

[35]-جاسم تۆفیق (الدكتور) گۆڤاری سیاسەتی دەولی، ژمارە٣.

[36]-هەمان  سەرچاوە.

[37]-هەمان سەرچاوە.

[38]-الوقائع العراقيه، العدد ٣١٥٨، بغداد، ١٩٨٧/٧/١٣.

[39]-عەبدوڵڵا کەریم مەحمود، چارەنووسێکی نادیار- چەند دیمەنێك لە ئەنفالەکانەوە، بڵاوکراوەی کۆمیتەی بەرگری لەمافی قوربانیانی ئەنفالەکان، ١٩٣٣.

[40]-جاسم تۆفیق (الدكتور)، سەرچاوەیەکی پێشوتر.

[41]-الجمهورية العراقية، وزارة التخطيط، سەرچاوەیەکی پێشووتر.

[42]-سميره الشماع (الدكتوره).

[43]-هەمان سەرچاوە.

[44]-چیا، هەمان سەرچاوەی پێشوو. ل١٧٣.

## فەسلی یەکەم

# فاکتەرەکانی جموجۆڵ و ڕیگاوبانەکانی کوردستانی باشور

### (٤-١-١): هۆکارە کارتیکەرەکانی ریگاویان

**پیشەکی:**

بەپیی رای (گۆتمان) مەبەست لەفاکتەرەکانی جموجۆڵ؛ ریگاوبانەکانی گواستنەوەو هاتوچۆی وشکایی‌و دەریایی‌و ئاسمانی‌و جموجۆلی دانیشتوان‌و گواستنەوەی شمەك‌و سەرمایەو بیروبۆچوون‌و چاپکراوو تەلەفۆنە.تیکرای ئەم توخمانەش پیکەوە هیزی بنەرەتی ریکخستنی سیاسی‌و ئابوری هەر دەولەتیك پیکدەهینن[١]

فاکتەرەکانی جموجۆڵ توخمی بنەرەتی یەکگرتنی هەریمایەتی دەولەتە، هەروەکو یەکیکیشە لەهۆکارەکانی (کیشکردن بەرەو ناوەند) کەدواجار یەکیتی‌و پیوەندی هەریمە جیاجیاکانی سەر بەیەکەیەکی سیاسی دەستەبەر دەکات. هۆکاری سەرەکی بەیەککگرتوویی مانەوەی هەریمە پەرشوبلاوەکانی هەردوو دەولەتی پانۆپۆری روسیاو ئەمریکا، هیلە ئاستە دوورو دریژەکانی ئەو دوو دەولەتەو مەرجی سەرەکی بە یەککگرتوویی مانەوەیان بوو.

لەرووی ئابورییەوە فاکتەرەکانی جموجۆڵ گرنگترین توخمی بینای ئابوری ولات‌و یەکەمین کەرەستەی هەر هۆکاری پەرەسەندنیکی لەوجۆرەن. هەروەکو لەرووی کۆمەلایەتیشەوە ئەو فاکتەرانە هۆکاری سەرەکی گواستنەوەی

داب‌ونەریتە شارستانییەکانن لەریی گواستنەوەی خێرای بیروباوەرە جیاجیاکان. لە رووی عەسکەریشەوە فاکتەرەکانی جموجۆڵ گرنگترین توخمەکانی هەر ستراتیجیکی عەسکەری پێکدەهێنن[2]

پرۆسەی راکێشانی رێگاوبان لەعیراقدا تا پەنجاکانی ئەم سەدەیە برەوی نەبوو... سالی ١٩٥١ کە ئەنجومەنی ئاوەدانکردنەوە پێکهات، توانرا تۆڕیکی رێگاوبان کە سەرجەم درێژییەکەی دەگەیشتە ٢٣٠٠کم، رابکێشریت. پاشانیش لەریی پشت بەستن بەپسپۆرو ئەندازیاری بیگانە، تۆڕەکانی رێگاوبان فراوانترکران.

ئەو رێگاوبانانەی دەکەوتنە کوردستانەوە، تا کاتی خۆئامادەکردن بۆ هەردوو پرۆژەی بەنداوی دوکان‌و دەربەندیخان، بەکەندو کۆسپ‌و چەوت‌و چەویڵ بوون. لەدەستپێکی هەردوو پرۆژەی ناوبراو بەدواوە رێگاکانی (بەغدا- جەلەولا- دەربەندیخان)و (کەرکوک- دوکان) راکیشران‌و، رێگاکانی (کەرکوک- بەغدا)و (کەرکوک- سلیمانی) دەستیان پیداهینراو قیرتاوکران.

تاسەرەتای حەفتاکان، رێژەی درێژی رێگاوبانەکانی کوردستانی باشور ٢٥٪ی هەموو رێگاوبانەکانی عیراقیان پێکدەهینا، کەسەرجەم درێژییان خۆی لە ٥١٦٤ کم دەدا[3]

| جۆری رێگاوبان | ١٩٦٩ | ١٩٧٠ | ١٩٧١ |
|---|---|---|---|
| قیرتاوکراوی نوێ | ٢٤٥٠ | ٢٧٥٦ | ٣٠٥٦ |
| قیرتاوکراوی کۆن | ١٩٩٤ | ٢٠٣٦ | ٢١٠٨ |

خشتەی ژمارە (١٠)

درێژی رێگاوبانە سەرەکی‌و فەرعییەکانی عیراق (کم[4])

بەپێی پلانێك كە لەسالی ١٩٦٦داو بەهۆی چڕبوونەوەی تۆڕی ڕیگاوبانەکان مشتومری لەسەرکرا، پلان دانرا کە بەشێوەیەکی تیشکاویژ کە بەغدای پایتەخت بکریتە مەلبەندی تیشکەکە، ڕیگاوبانەکانی عیراق سەرجەم پیکەوە ببەسترینەوە. هەربەوپێیە ڕیگاوبانەکان کران بەسێ پۆلی جیاجیاوە، بەم شیوەیە:

١-ڕیگاوبانە سەرەکییەکان: ئەو ڕیگاوبانانەی دەگرتەوە کە لەهەموو لایەکەوە شاروشارۆچکە جیاجیاکانی بە مەلبەندی پاریزگاکانەوە دەبەستەوەو هەمووشیانی بە پایتەختەوە گرێ دەدا. هەر ئەم ڕیگاوبانانە بەشیکی گرنگی ڕیگا نیودەولەتییەکانیشی پیکدەهینا.

٢-ڕیگاوبانە پەرشوبلاوەکان: ئەو ڕیگاوبانانە دەگریتەوە کە ناوچە جیاجیاکانی ناویەك پاریزگا پیکەوە دەبەستیتەوەو پاشانیش هەموویان بەڕیگاوبانە سەرەکییەکانەوە گرێ دەدرینەوە.

٣-ڕیگاوبانە ناوخۆییەکان: ئەمیش ڕیگاوبانە فەرعییەکانی ناویەك پاریزگاو بەتایبەتیش شوینەکانی بەرهەمهینان دەگریتەوە[٥]

ئەم ڕیگاوبانانە پێبەپێی هەریمە جیاجیاکانی عیراق‌و کوردستانی باشور جیاوازییان هەیە.. لەکاتیکدا ڕیگاوبانەکانی عیراق بەشیوەیەکی تیژرەوو بەدریژایی هەر دوو ڕووباری دیجلەو فورات‌و لەشیوەی دوو هیلی سەرەکیدا بەرەشەخاکەکانی عیراقدا دریژ بوونەتەوە، لەکوردستانداو بەتایبەتیش لەهەریمی شاخاویدا، فاکتەرە هایدرۆگرافییەکان وایانکردووە کەڕیگاوبانەکان بەهەموو لایەکدا لەشیوەی پریشکدا گوزەربکەن‌و هەرچۆنیك تۆبۆگرافیای هەریمەکە ڕێ پیدەدات شان بەشانی قەدپالی چیاو گردو گردۆلکەکان بەناو شیوو دەربەندە جیاجیاکاندا دریژببنەوە.

سەرەڕای بوونی ڕیگاوبانە ناوخۆییەکان، چەند تۆڕیکی تر لەڕیگاوبان کە بەڕیگاوبانە نیودەولەتییەکان ناسراوە، هەریەکە لەعیراق‌و کوردستانی باشور بەولاتانی دراوسێ دەگەیەنیت، گرنگی ئەم ڕیگاوبانانە بە نسبەت عیراقەوە بریتین لەوەی کە:-

أ-مەلبەندی پاریزگاکان پیکەوە گریّ دەدات.
ب-عیراق بەدەولەتە دراوسیکانەوە دەبەستیتەوە.
پ-شادەماری بازرگانیکردنی عیراق پیکدەهینیت[٦]

| ژمارەی ریگا[٧] | دریژی بە (کم) | ئەو مەلبەندانەی ریگاکەیان پیدا دەروات |
|---|---|---|
| ١ | ٥٢١ | لەبەغداوە هاوریك لەگەڵ رووباری دیجلەدا -موسڵ (الیتربیە) لەسەر سنوری عیراق و سوریا- سوریا. |
| ٢ | ٥٥٤ | لەبەغداوە- کەرکوك- هەولیر- موسڵ. |
| ٣ | ١٩١ | لەهەولیرەوە- ریگای هاوینە هەوارەکان- رایات- ئیران. |
| ٤ | ٣٠٢ | لەقزلرباتی سەر بەپاریزگای بەعقوبەوە- هاوریك لەگەڵ روباری سیرواندا بۆ سلیمانی- کەرکوك. |
| ٥ | ١٧٨ | لەبەغداوە هاوریك لەگەڵ رووباری سیرواندا- بەعقوبە- خانەقین- مونزریەی سەر سنوری ئیران- ئیران. |

خشتەی ژمارە (١١)

ژمارەو دریژی ریگاوبانە سەرەکیە نیودەولەتییەکانی عیراق بەولاتانی دەوروبەرەوە (ئەوانەی بەکوردستانی باشوردا تیدەپەرن[٨]).

ناکریت لە دەرەوی هۆکارە سروشتی و مرۆییەکان، لەجۆری ریگاوبان و چۆنیتی راکیشانی و پیکهاتەو چرییەکەی بکۆلریتەوە. بۆیە لەم بەشەدا هەول دەدەین کارایی هەریەك لەو دوو هۆکارە لەسەر ریگاو بانەکانی کوردستانی باشور (مەبەست لەریگاوبانە وشکاییەکانە) بخەینەروو.

## یەکەم/ هۆکارە سروشتییەکان

بەشیوەیەکی ریژەیی هۆکارە سروشتییەکان چەند هۆکاریکی جیگیرو نەگۆرن. بۆیە لیکۆلینەوە لەپیکهاتەکانی رووی خاك، کەشوهەوای هەریمە جیاجیاکان مەوقیعی جوگرافی، ئینجا کارایی هەر یەکیك لەو کارتیکەرانە لەسەر گواستنەوەو توانای هەر خاکیك، جۆری نەخشەکیشانی ریگاوبان و ئاقارو ئاراستەکانیان، گریی هاتوچۆو جۆری چالاکییە ئابورییەکانی ناوچە جیاجیاکانمان بۆ دەستنیشان دەکات.

قسەکردن لەسەر پیوەندی نیوان ریگاوبان و هۆکارە سروشتییەکان، وا دەخوازیت لەهەریەك لەم توخمانە بکۆلریتەوە[٩]:

### ١-مەوقیعی جوگرافیی

ئەگەرچی سروشتی سەختی خاك و کەمی ریگاوبانە وشکایی و ئاسمانییەکان و نەبوونی ریگاوبانی دەریایی لەکوردستانی باشوردا، کۆسپی گەورەی گواستنەوەی خولقاندووە، بەلام هەلکەوتەی کوردستان بەشیوەیەکی گشتی لەبەشیکی گرنگی خۆرهەلاتی ناوەراستدا، لەنیوان بانی ئیران و بانی ئەنەدۆل و دورگەی عەرەبدا، گرنگییەکی گەورەی بەخشیوەتە مەوقیعەکە. هەلکەوتەی کوردستانی باشوریش لەنیوان ئیران و عیراق و شامداو تیپەربوونی بەشیکی گەورەو گرنگی ریگاوبانە وشکاییەکانی ئەو ولاتانە بەخاکی کوردستانی باشوردا، مەوقیعەکەی کردۆتە ویستگەیەکی هاتوچۆی نیوان ولاتانی دەوروبەر.

لەو سۆنگەیەی کەبەشی هەرەگەورەی ریگاوبانەکانی کوردستانی باشور بە دەشتە شاخاوی و دەشتە گردۆلکەییەکاندا گوزەردەکەن، ئەو دوو ناوچەیە لە رووی ستراتیجی عەسکەرییەوە گرنگی گەورەیان هەیە.

لەپشتینەی دەشتە شاخاوییەکاندا، دەشتی شارەزور لەریی هەردوو گەروی پینجوین و هەلەبجەوە، لەباکوری خۆرهەلات و باشوری خۆرهەلاتییەوە لە میانەی ریگاکانی (پینجوین- مەریوان- سنە)و (هەلەبجە- نەوسود- کرماشان)ەوە دەروازە بەرووی ئیراندا دەکاتەوە. دەشتەکانی رانیەو حەریر بەشی هەرە گرنگی ریگاوبانەکانی هاتوچۆی نیوان سلیمانی و کۆیەو هەولیر، لەرانیەو شەقلاوەوە پیکدەهینن. هەروەکو دەشتەکانی رەواندزو سندی باشترین گریی هاوتۆچی نیوان دیاربەکرو ورمێ، لەجزیرەی بن عومەرو رەواندزەوە دەستەبەر دەکەن.

پشتینەی دەشتە گردۆلکەییەکانیش شارێ گرنگەکانی نیوان بانی ئیران و موسڵ خۆرهەلاتی دەریای ناوەراستی پیدا دەروات و رەشەخاکەکانی عیراق و بەغدا بەموسڵ و سوریاو تورکیاوە گرێ دەدات.

لەوپەری باشوری خۆرهەلاتیشەوەو لەدامینی چیاکانی پشتکۆوە، هەریەکە لەشارۆچکەکانی بەدرەو خانەقین، دەروازە بەرووی عیراقدا دەکەنەوە.

**٢-جیۆمۆرفۆلۆجیا**

بەشیوەیەکی گشتی خاکی کوردستانی باشور لەدوو هەریمی جیاواز پیکدیت، ئەوانیش هەریمی شاخاویو هەریمی نیمچە شاخاوییە.

هەریمی شاخاوی کە ٤٩,٢٧٪ی روپیوی کوردستانی باشور پیکدەهینیت، دەکەویتە نیوان بەشیك لەسنورەکانی ئیستای عیراق- ئیران و سنوری عیراق- تورکیاوە لەباکورەوەو، سنوری هەریمی نیمچە شاخاوی لە باشورییەوە. ئەم هەریمە کەشیوەی داسولکەیەکی وەرگرتووە، ئاقاری چیاکانی بەئاراستەی باکوری خۆرئاواو باشوری خۆرهەلات و بەرزی چیاکانی لەنیوان ١٠٠٠-٣٦٠٠ مەتردان.

لەهەریمی شاخاویدا ریگاوبانەکان بەهەمان ئاراستەی چیاکان و بەدەشتەکانی نیوانیاندا رەت دەبن، ئەم ئاراستەیە تەنیا لەو ناوچانەن بەشیوەیەکی ئەستون چیاکان دەبرن کە دەربەندو گەلییەکان بەشیکی ریگاوبانەکان پیکدەهینن. هەروەکو لەریگاوبانەکانی کەرکوك- سلیمانی بەهۆی دەربەندی بازیانەوەو، ریگەی هەولیر- رایات بەهۆی دەربەندو گەلییەکانی میراوەو سپیلك و گەلی عەلی بەگ و جوندیان و بەرسرین و رازانۆك و حاجی ئۆمەراندا دەبینرین.

بەشـــیوەیەکی گشـــتی ئـــەم هەریمـــە بەکـــەمی ریگاوبـــان و ســـەختی ریگاوبانەکانی ناسراوەو، جگە لەریگاوبانی وشکایی نەبیت ئیتر هیچ جۆرە هۆکاریکی تری بۆ جموجۆڵ تیناکەویت.

هـەریمی دووەمـی کوردســتانی باشـور، هــەریمی نیمچـە شـاخاوییە کـە ٧٢,٥٢٪ی روپیوی کوردستانی باشور تەواو دەکات و دەکەویتە نیوان هیلـی سـنوری هـەریمی شـاخاوی لـەباکورەوەو هیلـی سـنوری عـیراق- کوردســتان لەباشورەوە.

سـنوری سروشـتی ئـەم هەریمـە لەشـارۆچکەی بـەدرە لەوپـەری باشـوری خۆرهـەلاتی کوردسـتانی باشـورەوە دەسـت پیدەکـات و، لـەچیاکانی شـنگار- لەوپەری باکوری خۆرئاوا کۆتایی دیت.

بەرزی خاکی ئەم هەریمە لەنیوان ١٠٠-١٤٦٣ مەتردایە، رووتـەنی خـاکی ئـەم هەریمـەو نـەبوونی کۆسـپی گـەورە لەخاکەکـەیدا، وایکـردووە ریگاوبـانی دریژتـرو لـەبارتر لـەهی هـەریمی پیشـوو بگریتـەخۆی کەجگـە لـە ریگاوبـانی وشـکایی، دوو هیلـی ئاسنیشـی تیدەکـەویت؛ یەکـەمیان هـەولیر بـە بـەغدای پایتەختەوە گریَ دەدات و، دووەمیشیان موسڵ بە بەغداوە دەبەستیتەوە. هیلی یەکەمیان لەبەغداوە بەئاراستەی رووبـاری سیروان بـەرەو بـاکور هەلدەکشـیت و لەبەعقوبەو قزلرباتـەوە دەبیتـە دوو بـەش: یـەکیکیان بـەرەو خانـەقین و ئـەوی دیکەیان بەرەو باکوری خۆرئاوا بەکەرکوکدا رەت دەبیـت و تاهـەولیر دەکشـیت. ئەوەکەی موسلیش جگە لەو بەشەی نـەبیت کە دیتـە نـاو موسـلەوە، ئیتر بـاقی بەشـەکانی تـری بەکـەنارەکانی خۆرئـاوای روبـاری دیجلـە لـەدەرەوەی سـنوری کوردستانی باشور تابەغدا دریژ دەبیتەوە.

**٣- پیکهاتەی خاك**

خـاکی کوردســتانی باشـور پیکهاتەیـەکی نـاجۆرو جیـاوازە. بەشـیوەیەکی گشتی خاکی هەریمی شاخاوی بریکی زۆر بەردی کلس و گەچ و کۆنکلۆمۆریت خاکەکـەی پیکدەهینــن و هــەموو ئــەو ماددانــەش جـاریکی تــر لــەبیناکردنی ریگاوبـاندا رۆلیکـی بنـەرەتی دەگـیرن. بۆیـە ئەگـەرچی راکیشـانی ریگاوبـان لەناوچـــە شـــاخاوییەکاندا بەشـــیوەیەکی دژوار بـــەریوەدەچیت، بـــەلام ریگاوبانـــەکانی چیـــا مـــاوەی دوورودریـــژ دەمیننـــەوەو کـــەمتر پیویســـتیان بەبیناکردنـەوە هەیـە. بەتایبـەتیش گـەر زانیمـان کـە پیکهاتـەکانی خـاکی ئـەم

هەریمە توانایەکی باشی هەلمژینی باراناوی هەیەو، لەئەنجامی کارلیکی ئاوو ماددەپیکهینەرەکانی ئاویتەی ریگاوبانەکان، بەشیکی ریگاوبانەکان بەتیپەربوونی کاتو بۆ جۆریك لەجۆرەکانی کۆنکریت دەگۆرین.

پیکهاتەی خاکی هەریمی نیمچە شاخاویش، بەتایبەتی لەناوچە دەشتاییەکاندا خاکیکی کلسییەو لم شیلی نیشتوو سەرەوەی خاکەکەی روپۆش دەکەنو خاکی ئەم هەریمە باشترین جۆری خاکە بۆ راکیشانی ریگاوبان.

٤-کەشوهەوا

بەوپییە کوردستانی باشور لەژیر کاریگەری دوو هەریمی سەرەکی کەشوهەوا دایە، بۆیە کەشوهەوای هەر هەریمیك جیا لەویتر، کارایی خۆی بەسەر جۆری ریگاوبانی ولاتەکەوە جیهیشتووە.

هەریمی شاخاوی کە کەشوهەوای دەریای سپی ناوەراست بەسەریدا زالەو سالانە بری ٦٠-١٠٠ملم بارانی لیدەباریت، وایکردووە ریگاوبانەکانی بەتایبەتیش لەوەرزی بەفرانبارو باراندا بەگریو گۆلو هاتوچۆ تیایاندا دژواربیت.

بەلام لەهەریمی ئیستیبسدا کەوەکو هەریمیکی گواستراوە لەژیر کاریگەری هەردوو کەشوهەوای دەریای ناوەراستو بیاباناویدا بەو سالانە بری ٤٠-٦٠سم بارانی لیدەباریت، کارایی هەردوو هەریمەکەی بەسەرەوەیە.

## دووەم/ هۆکارە مرۆییەکان

پیوەندی نیوان تۆرەکانی ریگاوبانو دانیشتوان، پیوەندییەکی ئۆرگانییە.. لەهەر جیگایەك چری دانیشتوان زۆر بیت، ریگاوبانیش چروپر دەبن. چروپری ریگاوبانیش کاریگەری لەسەر راکیشانو جیگیربوونی دانیشتوان هەیە. بەوپییە تۆرەکانی ریگاوبانو رۆلیکی تایبەت لەهەلبژاردنی شاروشارۆچکەو مەلبەندەکانی نیشتەجیبووندا وازی دەکات. چونکە هەرکاتیك ریگاوبانەکان چروپربوون، چالاکی ئابوریو هاتوچۆکردنی دانیشتوانیش بەرفراوان دەبیت هەر لەهەمان سۆنگەوە دەکریت بوتریت کەپیوەندی نیوان ریگاوبانو چری دانیشتوان، پیوەندییەکی راستەوخۆیە.

بۆ دیاریکردنی پەیوەنـدی نیـوان ڕێگاوبـانو هۆکـارە مرۆییـەکانو کـارایی هەریەکێکیان لەسەر ئەوی تر، دەبێت لەم توخمانە بکۆڵرێتەوە:

١-دانیشتوان

مەبەست لەراکێشانی ڕێگاوبان پێش هەرشتێك، خزمەتکردنی دانیشـتوانە. بۆیـە راکێشـانی ڕێگاوبـان پەیوەندییـەکی گـەورەی بـە مەلبـەندەکانی چـڕی دانیشتوانەوە هەیە.

بوونـی چیابـەرزەکان، بیابانـە وشـکەکان، روبــەرە ئاوییـە گـەورەکان، کـە هەموویان کەم تازۆر بەناوچەی پەرتەوازەکردنی دانیشتوان نەك کۆکردنـەوەیان دادەنرێـن، کارایی لەسـەر چڕی دانیشتوانو پاشانیش جـۆری ڕێگاوبانەکـەوە هەیە.

ئەگەرچی کوردستانی باشـور روپێویکـی لەبـەرچاوی خاکەکـەی چیایـە، بـەڵام بەهۆی بوونـی سـەرچاوە زۆرەکانی ئاوی شیرینو لەباری خاکەکەی بـۆ هەمە جۆر کشتوکاڵ، چڕی دانیشتوان تێیدا بە بەراورد لەگـەڵ ناوچـەکانی عیراقدا، چڕییـەکی گەورەیە. کـەچی ئەم چڕییـە واینـەکردووە تـۆری فـراوانو لـەباری ڕێگاوبـان بـەدوای خۆیـدا بـهێنێت، کـەدیارە سیاسـەتی گوێنەدانـە پەرەسـەندنی کوردسـتان لەلایـەن حکومەتـە جیاجیاکـانی عیراقـەوە بـەبیانوی تێچوونـی زۆرو سـەختی خـاکی کوردسـتان لەراکێشـانی ڕێگاوبـاندا چـڕی ڕێگاوبانـەکانی کوردسـتانی باشـورو جـۆری دابەشـبوونیان پێبـەپێی چـڕی دانیشتوانو دابەشبوونیان، نەبووە.

## ٢-بەرهەمی کشتوکاڵی

دابەشبوونی جوگرافیانەی کێڵگەو باخ و مەزراکان و گواستنەوەی بەروبوومە کشتوکاڵییەکان، یەکێکی ترە لەو هۆکارانەی پەیوەندییان بەتۆڕی ڕێگاوبانەوە هەیە... ئەگەرچی گواستنەوەی شتومەك جگە لەڕێگاوبان پەیوەندی بەهۆیەکانی گواستنەوەشەوە هەیە، بەڵام لەبەستنەوەی ناوچە کشتوکاڵییە جیاجیاکان بەیەکترەوەو پاشانیش ساغکردنەوەی ئەو بەروبومانە، ڕێگاوبان توخمی یەکەم و سەرەکی ئەو پرۆسیسە پێکدەهێنێت.

کوردستانی باشور وڵاتێکی کشتوکاڵییەو ساڵانە بەشێکی گەورەی خاکەکەی بە بەروبومی هەمە جۆر دادەچێنرێن و، جگە لە دابینکردنی پێداویستییەکانی خۆی بەشی زۆربەی ناوچەکانی عێراقیش دەدات کەچی تۆڕەکانی ڕێگاوبان لەهێندێك ناوچەدا وێران و لەبەشێکی گەورەی تردا هەربوونیان نییە.

ئەگەر ناوچەی سلێمانی وەکو گەورەترین ناوچەی بەروبومە کشتوکاڵییەکانی کوردستانی باشور تەماشا بکەین، دەبینین سەرجەم درێژی تۆڕی ڕێگاوبانی هەموو پارێزگاکە تەنیا (١٤٩٦کم)ە، لەو ژمارەیەش تەنیا (١٨١کم)ی ڕێگاوبانی سەرەکییەو (١١٨٣کم)ی ڕێگاوبانی فەرعییەو (١٣٢کم)یش نیاز وابووە دروست بکرێت.

هەموو پارێزگاکە کەروپێوەکەی (١٥٧٥٦ کچگ)ە، تەنیا یەك ڕێگای سەرەکی هەیە کە لە کەرکوکەوە بەرەو چەمچەماڵ و پاشان بەرەو مەڵبەندی سلێمانی و لەوێشەوە بەرەو کەلارو ناوچەکانی خوارووتر دەکشێت. بەشی یەکەمی ڕێگاکە نەبێت لەنێوان کەرکوك- سلێمانیدا دوو سایدە ئیتر سەرجەم ڕێگاکە یەك سایدە[١٠].

| ناوچەی ریگاوبان | ریگاوبانی سەرەکی (کم) | ریگاوبانی فەرعی (کم) |
|---|---|---|
| مەلبـــــەندی پاریزگـــــای سلیمانی | | |
| مەلبەندی قەزای هەلەبجە | ٢٠ | ٦٠ |
| مەلبەندی قەزای پینجوین | ٢٠ | ٧٤ |
| مەلبەندی قەزای شارباژیر | – | ٣٨ |
| مەلبەندی قەزای پشدەر | ٢٠ | ١٤٦ |
| مەلبەندی قەزای رانیە | ٢٠ | ١٢١ |
| مەلبەندی قەزای دوکان | ٢٠ | ٤٥ |
| مەلبـــــەندی قـــــەزای دەربەندیخان | ٧٢ | – |
| مەلبەندی قەزای چەمچەماڵ | ٧١ | – |
| مەلبەندی قەزای کەلار | ١٤٣ | – |

خشتەی ژمارە (١٢)

دریژی ریگاوبانە سەرەکیو فەرعییەکانی پاریزگای سلیمانی[١١]

### ٣-بەرهەمی کانزایی

بوونـی بەرهەمـە کـانزایی‌و کانـەکانی ژێـر زەوی لەناوچـە جیاجیاکـانداو، ڕەنیوهێنانی‌و هێنان‌و گواستنەوەی ئەو بەرهەمانە، تۆڕی ڕیگاوبانی جیاجیای دەویت.



نەخشەی ژمارە (٢١)
چڕی ڕیگاوبانە سەرەکی‌و لاوەکییەکانی ناوچەی ئۆتۆنۆمی

سەرەرای بریکی گەورەی سەرچاوەو ماددە خاوەکانی وەکو (نەوت، ئاسن، مس....... هتد). لەکوردستانی باشوردا بەلام بەهۆی نەخستنەگەری ئەو کەرەستە خاوانە لەکوردستانداو بردنی بۆ ناوچەکانی عیراق، بوونی ئەو کەرەستانە کاریکی ئەوتۆی نەکردۆتە سەرجۆری ریگاوبان لەکوردستاندا. بە پیچەوانەوە، هەبوونی ئەو سەرچاوانە لەکوردستانداو بەتایبەتیش نەوت، وایکردووە دەبوا هەبوونی سەرچاوەیەکی وەکو نەوت مایەی چربوونەوەی دانیشتوان و کۆبوونەوەیان بووایە، کەچی دانیشتوانە کوردەکەی ئەو ناوچانە پەرشوبلاوەیان پیکراوەو ناوچەکانی سەرچاوەکان بوونەتە زۆنی پاراستنی ئاسایشی عیراق.

وەکو سپاردە، بۆ چاککردن و چارەسەرکردنی تۆری ریگاوبانەکانی کوردستانی باشور، دەکریت بۆ داهاتوو چەند هەنگاویك بگیرینە بەر، گرنگترینیان:-

١-ئەگەرچی ناوچەکانی گەرمیان ژمارەیەکی زۆر شارو شارۆچکەو مەلبەندی چری دانیشتوان و کشتوکالی بەشیکی زۆر ولاتەکەی تیدەکەویت، کەچی دەولەتی عیراق لەروانگەی تەوەرە ستراتیجییەکانی بەرگریکردنی خۆی لەمەترسییەکانی دەرەوە (ئیران)و، مەترسییەکانی ناوەوە (کورد)، لەکۆنەوە ناوچەکەی پشت گوێ خستووە.

بەمەبەستی گریدانی قەزاکانی خانەقین، مەیدان، کەلار، کفری، چەمچەماڵ، کۆیەو سەرجەم ناحیەکانیان، دەکریت تۆریکی ریگاوبان بۆ ئەو ناوچانە رابکیشریت.

٢-ناوچەی هەریمی شاخاوی، بەتایبەتیش هەریمی چیا بەرزەکان، ناوچەیەکە بە بەراورد لەگەڵ ناوچەکانی تری کوردستانی باشوردا کەمترین ریگاوبانی تیدەکەویت. جگە لەمەسەلەی خەرجی و بری تیچوون، دیسانەوە دەولەتی عیراق لەروانگەی تەوەرە ستراتیجییەکانی بەرگریکردنی خۆی لەمەترسییەکانی دەرەوە (ئیران و تورکیا)و، مەترسییەکانی ناوەوە (کورد)، ناوچەکەی کردۆتە ناوچەیەکی دابرو نیازی نەبووە ئاوەدانتربیت. دەکریت تۆریکی ریگاوبان بەدریژایی تخوبەکانی ئیستای تورکیا- کوردستانی باشور، ئیران- کوردستانی باشور، لەزاخۆوە تا هەلەبجە دریژبیتەوەو هەموو قەزاکانی

زاخۆ، ئامیدی، زیبار، چۆمان، ڕەواندز، ڕانیە، قەڵادزێ، چوارتا، پێنجوین، هەلەبجەو سەرجەم ناحیەکانیان پێکەوە گرێبدات.

٣-دامەزراندنی تۆڕێکی ڕیگاوبانی ئاسن کە مەلبەندی هەموو پارێزگاکانی کوردستانی باشور، کەرکوك، موسڵ، سلیمانی، هەولێر، دهۆك پێکەوە گرێ بداتو، کەرکوك ویستگەو گرێی هاتوچۆی تۆڕەکە بێت.

## (٤-١-٢): ڕێگاوبانەکانی کوردستانی باشور

ڕێگاوبانەکانی کوردستانی باشور، دەکرێن بەدوو پۆلەوە:

یەکەمیان: ڕێگاوبانەکانی ناوخۆی کوردستانی باشور.

دووەمیان: ڕێگاوبانەکانی کوردستانی باشور بەعیراقو وڵاتانی دەوروبەرەوە.

یەکەم: ڕێگاوبانەکانی ناوخۆی کوردستانی باشور

ڕێگاوبانەکانی ناوخۆی کوردستانی باشور هەموو ئەو ڕێگاوبانانە دەگرێتەوە کە گوندەکانی بەناحیەکانەوەو ناحیەکان بەقەزاکانەوەو، قەزاکان بەمەلبەندی پارێزگاکانەوەو، پارێزگاکانیش پێکەوە دەبەستێتەوە. ڕێگاوبانەکانی کوردستانی باشور جۆراوجۆرن، قیرتاوو چەوریژو خاکۆخۆڵن. تیایاندا سەرەکیو ناسەرەکی هەیە، لەسەرەکییەکانیشدا ڕێگاوبانی یەك سایدیان دووساید هەیە. لەسەر ڕێگاوبانەکان پردی جیاجیا هەیە.

لەسۆنگەی جوگرافیای عەسکەرییەوە ڕێگاوبانەکان ماکی هەر ستراتیجیکی عەسکەرین. وەسفی گشتی ڕێگاوبانەکانیش ئەرکێکی گرنگی کۆلینکارییەکانی جوگرافیای عەسکەرییە.

بۆ لێکۆلینەوە لەڕێگاوبانەکانی ناوخۆی کوردستانی باشور، پێویستمان بە وەسفی هەریەکێك لەڕێگاوبانەکانی پارێزگاکانی سلیمانی، هەولێر، کەرکوك، دهۆك،و ناوچە کوردنشینەکانی سەر بەپارێزگاکانی موسڵو دیالەو سەلاحەدینو واست دەبێت.

١-تۆری ریگاوبانەکانی پاریزگای سلیمانی[١٢]

| بەشەکانی ریگاوبانەکانی پاریزگای سلیمانی | | قیرتاو (کم) | چەورریژ (کم) | خاکوخۆڵ (کم) | پردەکانی سەر ریگاکە |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | سلیمانی- چەمچەماڵ | ٦٥ | | | قلیاسان/ کەندەکەوە/ تەینال/ شیوەسور |
| ٢ | سلیمانی- دوکان- رانیە- قەڵادزێ | ١٦٤ | | | تابین/ کانی سارد/ دوکان/ گۆمەجولەکە/ باداوان/ بیستانە/ هیزۆپ/ کانی ماران/ قەرەنی ئاغا/ گردە جان/ چوارقورنە/ تووەسوران/ سەنگەسەر/ ژاراوە/ باوەبان/ بەستەستین. |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ٣ | سلیمانی- عەرەبەت- سەیدسادق- هەڵەبجە | ٨٣ | | | چەناخچیان/ سەیدسادق/ زەلم. |
| ٤ | سەیدسادق- پینجوین | ٤٥ | | | کەولۆس/ نالپاریز/ کانی مانگا. |
| ٥ | سلیمانی- عەربەت- دەربەندیخان- کەلار | ١٤٠ | | | قەرەگۆل/دیوانە/ دارەدۆین/ قەترە/ باوەنوور/ بۆنکلە/ تازەدێ/ تۆپ خانە/ کۆمۆك/ ئاوەخویری/ دەربەندیخان/ عیسایی/ برلوت/ کەلار(١)/ کەلار(٢). |
| ٦ | سلیمانی- قەڵاچۆلان- ماوەت | ٦٠ | | | قەڵاچۆلان- خیوەتە. |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ٧ | قـــــەڵاچوڵان- چوارتا | ٥ | | | - |
| ٨ | دوریانی زەلم- خورمـــــاڵ- بیارە- تەویلە | ٤٠ | | | بیارە. |
| ٩ | دوریـــــــانی چـــەناخچیان- بەرزنجە | ٢٥ | | | - |
| ١٠ | ســــــلیمانی- قەرەداغ | ٤٢ | | | تانجەرۆ. |
| ١١ | قــــــەرەداغ- سەنگاو | ٣٠ | | | - |
| ١٢ | چەمچـــــەماڵ- سەنگاو | ٥١ | | | - |
| ١٣ | بیستانە- کۆیە | ١٠ | | | - |
| ١٤ | ســــــلیمانی- سەرچنار | ٤ | | | - |
| ١٥ | دوریـــــــانی تەکیـــــــە- ئاغجەلەر | ٥٣ | | | - |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ١٦ | بیستانە- کۆلکەرەش | ٢٣ | | | کۆلکەرەش(١)/ کۆلکەرەش(٢). |
| ١٧ | چوارقورنە- بالیسان | ٤٠ | | | - |
| ١٨ | نالپاریز- چوارتا | ٤٠ | | | - |
| ١٩ | سلیمانی- قەیوان- مۆکەبە | ٩ | ١٣ | | - |
| ٢٠ | چوارتا- پینجوین | ٤٠ | | | - |
| ٢١ | قەڵاچوڵان- بەرزنجە | ٣٢ | | | تەگەران/ قەڵاچوڵان. |
| ٢٢ | کەلار- تیلەکۆ | | | ٤٠ | - |
| ٢٣ | دوکان- بنگرد | ٢٩ | | | - |
| ٢٤ | سەرسیان- بنگرد | ١٨ | | | - |
| ٢٥ | قەڵادزێ- دارەشمان | ١٤ | | | - |
| ٢٦ | قەڵادزێ- | ٢١ | | | - |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| | شیوەرەز | | | | |
| ٢٧ | قەلادزێ- هیرۆ | ٢٢ | | | بادین(٢)/ ئالاوە. |
| ٢٨ | قـــــەلادزێ- گەناو | ١٥ | ١٠ | | قـــــەلادزێ/ دیرشـــــین/ بادین(١). |
| ٢٩ | قـــــەلادزێ- هەلشۆ | ١٣ | | | هەلشۆ/ بادین |
| ٣٠ | رانیە- پلنگان | ٢١ | | | - |
| ٣١ | سەنگەســـەر- شەهیدان | ٤ | | | شەهیدان. |
| ٣٢ | قـــــەلادزێ- دەروین | ٢٥ | | | - |
| ٣٣ | هەلەبجـــــە- میرەدێ | ٣٤ | | | - |
| ٣٤ | پینجویـــــن- نزارە گۆخلان | ٥ | | ٣٠ | - |
| ٣٥ | پینجویـــــن- گەرمك | ٨ | | ١٢ | - |
| ٣٦ | عەربـــــەت- | ٣٠ | | | - |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| | دوکانیان | | | | |
| ٣٧ | هەلەبجە-عەبابەیلی-بنان | | ٢٢ | | - |
| ٣٨ | کانی سپیکە-کەولۆس-نالپاریز | ٣٢ | | | - |
| ٣٩ | بەرزنجە-گولانی سەروو | ٢٤ | | | - |
| ٤٠ | هەلەبجە-عەربەت-گولانی سەروو | | ١٢ | | - |
| ٤١ | سلیمانی-بەکرەجۆ-هەزارمیرد | | ٩ | | - |
| ٤٢ | تاسلوجە-دیلیژێ | ١٨ | | | - |
| ٤٣ | بازیان-گەورەدێ | ١٨,٥ | | | - |
| ٤٤ | چوارتا- | ٣٩ | | | باسنێ |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| | باسنێ-شیوەکەڵ | | | | |
| ٤٥ | ماوەت-قامیش-گەڵاڵە | | ٢٧ | - | |
| ٤٦ | گەڵاڵە-سەفرە-زەرون | | | ١٦ | - |
| ٤٧ | سلیمانی-گلەزەردە-قەرەداغ | ٤٦ | | | - |

٢-تۆری ریگاوبانەکانی پاریزگای هەولیر (ئەربیل)

| بەشەکانی ریگاوبانەکانی پاریزگای هەولیر | | قیرتاو (کم) | چەوریژ (کم) | خاکوخۆڵ (کم) | پردەکانی سەر ریگاکە |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | هەولیر-پردێ | ٥٠ | | | قەتەوی (١)و(٢). |
| ٢ | هەولیر-کەلەك | ٣٤ | | | کەلەکی کۆن/ کەلەکی نوێ(١)و(٢). |
| ٣ | هەولیر-حاجی ئۆمەران | ١٧٥ | | | بەستۆرە/ کۆرێ/ دەربەندی شەقلاوە/ میراوە/ سورسورە/گەلی عەلی بەگ (٦دانە)/ |

